# پێشەکی چاپی دووەم

سوپاسی خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەوەی کە بۆ جاری دووەم کتێبی (**جوولەکە، عەقیدەو شەریعەت و مێژووییان**) لەچاپ دەدرێتەوە.

ئەمە جگە لەوەی کە فەزڵی خوای گەورەیە، بەڵگەیەکیشە لەسەر تینوێتی خوێنەری کوردی موسوڵمان دەربارەی بابەتێکی ئاوەها گرنگ و هەستیارو پێویست و دەگمەن لەنێو کتێبخانەی کوردیدا، هەروەك لە سەرەتای چاپی یەکەمدا باسم لەوە کردبوو کە بەداخەوە کتێبخانەی کوردی زۆر هەژارە لەم ڕووەوە و تەنها یەك کتێب و سەرچاوەمان نییە چ لە کۆن و چ لەئێستادا، باس لە ژیانی ئەم گەلە بکات لەڕووی مێژوویی و فەرهەنگی و کەلتوری و سیاسی و دینی و...هتد).

هەست کردتم بەم کەلێنە گەورەیە هانی دام کە دەست بدەمە نووسینی بابەتێکی ئاوا گرنگ و هەستیار، تا تۆی بەڕێز لە ژیانی ئەم گەلە بەدکارە شەیتان ڕەفتارە ئاگادارو ئاشنا بیت، بەڕاستی من وام هەست نەکرد لە ماوەیەکی زەمەنی کەمدا کە (٤) مانگی نەخاياند نزیکەی (١٠٠٠) نوسخە لەم کتێبە بفرۆشرێت!! بەڵام سوپاس بۆ خوای بالادەست لە چاپدانەوەی ئەم کتێبە ئاوا بەخێرایی بەڵگەیە سەرەتا بۆ قبوڵ بوونی لەلای خوای گەورە (إن شاء الله) لە من و بەسوودی بابەتەکە لە لای خوێنەری خۆشەویست، لە چاپی دووەمدا هەوڵمدا کەمترین هەڵەی چاپ دووبارە بکرێتەوەو بە دیزاینێکی جوانترو سەرنج ڕاکێشتر لە چاپ بدرێت، هەروەها چەند بابەتێکی ترم بۆ زیاد کرد تا کتێبەکە دەوڵەمەندتر ببێت و سوودی زیاتری لێوەربگیرێت، لە کۆتاییدا زۆر سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی تەواوی کارمەندانی ناوەندی ڕاگەیاندنی (ئارا) دەکەم ، لەوەی کە تەصمیم و دیزاینێکی نوێیان بۆ ئەم کتێبە خستە ئەستۆی خۆیان و دڵسۆزانە ئەم کارەیان بۆ ئەنجام دام، داوادەکەم لە خوا بەشداری خێر بن (إن شاء الله).

**دانا عثمان حسن**

**سلێمانی**

**٢٠١١/٣/٥**

# بەناوی پەروەردگاری جوانکار و میهرەبان

## پێشەکی:

نووسین دەربارەی (جولەکە) هەروا کارێکی ئاسان نیە و پێویستی بە دراسەکردن و توێژینەوەی زانستی مێژووی و فکری و عەقیدەی واقعی زۆر هەیە، چونکە ڕەگ و ڕیشاڵی ئەم گەلە بەناو مێژوودا زۆر بەفراوانی بلاو بۆتەوە و خاوەنی مێژوویەکی دوور و درێژن.....

ئەوەی زۆر هانی دام لە نوسینی بابەتێکی ئاوا هەستیار و دەگمەندا بریتی بوو لە سەرنج دانم لە قورئانی پیرۆز، کە زۆربەی ئایەتەکانی گوزارشت لەم گەلە بەدکارە دەکات و هەرجارەی بە جۆرێك نمایشی واقعی ژیانیانی کردووە، زۆر دووبارە بوونەوەی شتێك یان بابەتێك لە قورئاندا بەلگەیە لەسەر گرنگی ئەو باسەو فەرامۆش نەکردنی، درێژترین چیرۆك لە قورئاندا بریتیە لە چیرۆکی (موسا) (علیه السلام) کە بەشێکی زۆری ئەم چیرۆکە ژیانی موسایە لەگەڵ گەلی بەنی ئیسرائیل دا و نمایش کردنی بیرو باوەڕ و هەڵسوکەوت و سەرجەم بوارە جیاوازەکانی ژیانیانە.

لە قورئاندا دەستەواژەی (الیهود) واتە جولەکە نزیکەی (٨) جار بەکارهاتووە پاشان دەستەواژەی (یابنی إسرائیل) (٦) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (میثاق بني إسرائیل) (٣) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (سل بني إسرائیل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (فاسأل بني إسرائیل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (من بني إسرائیل) (٤) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (إلی بني إسرائیل) (٢) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (لبني إسرائیل) (٥) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (علی بني إسرائیل) (٣) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (کففت بني إسرائیل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (معك بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (حرم إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (ببني إسرائيل) (٢) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (بنو إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (بۆانا بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (و إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (معنا بني إسرائيل) (٢) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (بين بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (عبدت بنی إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (أورثناها بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (علماء بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (أورثناها بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (نجينا بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

دەستەواژەی (آتينا بني إسرائيل) (١) جار بەکارهاتووە.

پاشان دەستەواژەی(أهل الكتاب) کە گوزارشتە لە هەردوو کۆمەڵی (جولەکەو گاور) بە جیاوازی شێوازی بەکارهێنانیەوە نزیکەی (٣٠) جار بەکارهاتووەو کۆی گشتی هەموویان بە وشەی (اليهوية و بنی إسرائيل و أهل الكتاب) دەکاتە نزیکەی (٨٠) جار کە بێ گومان ئەم ژمارەیە ڕێژەیەکی زۆرەو ئاماژەیەکی بەهێزە لە گرنگی دان بەم باسەو ئاگادار کردنەوەیەکی خواییە بۆ باوەڕداران کە غافڵ و بێ ئاگانەبن لە جولەکە.

پاشان هاندەرێکی ترم لە نوسینی ئەم بابەتە بریتی بوو لەو دەریا ستەم و خوێن ڕێژی و نادادوەری و گەندەڵیانەی جولەکە، کە بەدرێژایی مێژوویان و بە ئێستەشەوە ئەنجامیان داوەو بەردەوامیش ئەنجامی دەدەن و زۆربەی خەڵکی و دەوڵەتە زل هێزەکانی دنیایان بۆ مل کەچ و سەرشۆڕبووە !!

لەهەمووی گرنگ تر بێ ئاگابوونی خەلکی بەگشتی و باوەڕداران بە تایبەتی لە فێڵ و تەڵەکە و گزی کاری و پیلان و بەدرەوشتی ئەم گەلە خراپە کارە، هاندەرێکی ترم بوو لە نوسینی کتێبێك دەربارەی تەواوی ژیانیان!!

بەڕاستی کتێب خانەی کوردی دەربارەی (جولەکە) زۆر هەژار و لاوازەو تەنها یەك کتێبم بەرچاونەکەوت لەسەر جولەکەو عەقیدەو شەریعەت و بیروباوەڕ و لایەنە هەمەجۆرەکانی ژیانیان، کە ئەمەش گەر بەلگەبێت لەسەر هشتێك ئەوە بێ گومان بەلگەیە لەسەر بێ خەمی و خەم ساردی خوێنەرو نوسەری کورد دەربارەی سەرسەخت ترین دووژمن کە جولەکەیە..

هەربۆیە بەوپەڕی هەستی بەرپرسیارێتیەوە شانم دایە بەر کۆلی قورس و گرانی نووسینی ئەم بابەتە، تا کتێب خانەی کوردی چیتر بەدەست بەتالی نەمێنێتەوە لەم بوارەداو پاشان خوێنەری کوردی موسلمانیش سەرچاوەیەکی ئاواسادەیان لەبەر دەستدا بێت دەربارەی جولەکە..........

لەم کتێبەدا هەولم داوە بەشێوەیەکی زانستی و مێژووی و واقعی لاپەڕە لەسەر ژیانی جولەکە هەلبدەمەوە بە(إنصافه) وە و بەوپەڕی ڕاست گۆییەوە توێژینەوە لەسەر بوارە هەمە جۆرەکانی ژیانیان بکەم

بابەتەکانی ئەم کتێبە هەمە جۆرن و تەنها لەیەك لایەن و بوار نەدواون، هەریەك لە بوارەکانی (مێژوو- عەقیدە- شەریعەت- داب و نەریت و هەلسوکەوتەکان- سیاسەت- سیفەت- خەسلەت- پیلان- واقعی ئێستایان- هەولی داگیرکاریان- دوارۆژی خۆیان و دەولەتە پڕ لەستەمەکەیان و دەیان باس و بابەتی ئەکادیمی تر)

توێژینەوەی زۆر وردی تیادا کراوەو باسیان لێ وەکراوە بۆ ئەم مەبەستە سەرچاوەی زۆر بەکارهاتووە تا باسەکەمان وەك توێژینەوەیەکی زانستی بێت نەك نوسینێکی بێ بنەما !!

زۆربەی سەرچاوەکان کە پێکهاتەیەکی بەرچاوی کتێبەکەن، بریتین لە کتێبە باوەڕ پێکراوو گەورەکانی خۆیان هەر لە (تەورات و تەلمور و بروتوکولات) کە

ئەمانە بەبێ جیاوازی لەلای جولەکە، لەبەرزترین ئاستی باوەڕپێکردنـدان و هەرسـێ کیان لەوپەڕی پلەی پیرۆزی دان.

داواکـارم لـەتۆی خوێنــەری خۆشەویسـت بـەو پـەڕی گرنگـی دانـت بـەم مەسەلەیەوە ئەم کتێبە بخوێنیتەوەو بەدڵ سـەرنجی تـەواوی بابەتـەکانی بدەیت و بێ تاقەت نەبیت لە خوێندنەوەی، تا لەبەشێکی تری گرنگی دینەکـەت شـارەزابیت، کە زانیاریە دەربارەی جولەکە.

داواکارم لەخوای گەورە هیدایەت و سەرکەوتومان بکات لە خزمەتی (إسلام) و دەوڵەمەندکردنی کتێب خانەی کوردی دا (آمین)

دانـــا عثمان حســـــن

سلێمانی

١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

# بەندی یەکەم

## مێژووی دروست بوونو هۆکاری بڵاوبونەوەی جولەکە لەسەر زەویدا

گومان لەوەدا نیە کە بۆ هەر گەلو نەتەوەیەك مێژوویەك هەیە بۆ دروست بوونو سەرهەڵدان، گەلی (جولەکەش) لەناو گەلانی دونیادا هەم وەك (نەتەوەو) و هەم وەك (دین) مێژوویەکی قوڵو درێژیان هەیە و دەگرێت پێش باسکردنی هەر لایەنێك لە دینو ژیانیان باس لەسەرەتای پەیدابونو هۆکاری زۆربوونو بڵاوبونەوەیان بکەین لەسەر زەویدا.

باس کردن لە مێژوی ئەم گەلە (جولەکە) پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە ژیانی باوکی پێغەمبەران (إبراهیم) ەوە هەیە "علیه السلام" ئەویش بەو جۆرەی کە (إبراهیم) "علیه السلام" لەناو گەلێکدا دەرکەوت کە خەریکی بت پەرستی بوونو خوای گەورەو تاكو تەنهایان نەدەپەرست...

(إبراهیم) لەناو ئەو گەلەدا بانگەوازی خودای دەست پێ کردوو تەواوی بەڵگەو نیشانەکانی دەستەڵاتی ڕەهاو بێ سنوری خوای تاکو تەنهای بۆ ئاشکراو بەیان کردن، بەڵام سەرەنجام لە بری بە قسەکردنو شوێن کەوتنی ئاگری گەورەیان بۆ کردەوە بە حسابی خۆیان سوتاندیان و لەناویان برد، بەڵام ویستی پەروەردگار لەسەرو ویستی ئەوانەوە بوونەویش بەو جۆرەی فەرمانی بە ئاگر کرد بە ساردبونەوە بەسەلامەتی لەسەر (إبراهیم) "علیه السلام"...

دوابەدوای ئەم دژایەتیە (إبراهیم) ڕێگەی کۆچی گرتەبەر لەگەڵ خێزانو ئەوانەی کە باوەڕیان پێ کرد کە ئەوانیش (سارەی خێزانیو لوطی برازاییو هەندێکی تر لە باوەڕداران).

بەڵێ بەرەو زەوی کەنعان ڕۆیشتن لە ساڵی (١٨٠٥) پێش زاین... دواتر لەگەڵ شوێنکەوتوانیدا بەڕێ کەوتن بۆ وڵاتی شام، پاشان ڕێگەیان گرتەبەر بەرەو ڕۆژئاواو گەیشتنە جێگەیەك بەناوی (بئر السبع) لەوێ مزگەوتێکیان دروست کرد.

(لوط) ی برازای بەرەو دەریای مردووی ئێستا کە دەکاتە (وڵاتی ئەردەن) بەڕێ کەوتو بانگەوازی خوای تاكو تەنهای بڵاو کردەوە، بەڵام گەلەکەی خەریکی بەدڕەوشتیو خراپەکاری بوون سەرەنجام خوای گەورە لەناوی بردن.

(إبراهیم) زۆر لەناوچەی (بئر السبع) نەمایەوەو بەرەو وڵاتی (مصر) کەوتە ڕێ لەوێ ئافرەتێکی جاریەی هێنا بەناوی (خاتو هاجەر) کە پێش کەشی کراو دواتر گەڕایەوە (کەنعان).

بە خاتوو هاجەر (إسماعیل) بەخشراو دواتر لەگەڵ (إبراهیم) ی باوکیدا یەکەمماڵیان دروست کرد بۆ خوا پەرستی لەسەر زەویدا کە ئەویش (کەعبە) ی پیرۆز بوو لە شاری مەککە.

إسماعیل (علیه السلام) باپیرە گەورەی (عەرەبە) و پێغەمبەری خۆمان ﷺ نەسەبی دەگەڕێتەوە سەر إسماعیل (علیه السلام).

دوای نزیکەی (١٤) ساڵ خاتوو سارەی خێزانی (إبراهیم) منداڵێکی بوو بەناوی (إسحاق)، دوای تێپەڕبونی چەند ساڵێك و گەورەبوونی (إسحاق) کاری هاوسەرگیری ئەنجامداو منداڵێکیان بوو بە ناوی (یعقوب) کە دواتر ئەویش بوو بە پێغەمبەر و نازناوی (إسرائیل) ی پێدرا. یوسفو یانزە براکەی لەنەوەی (یەعقوب)ن و (یوسفو بنیامین) برای دایكو باوکین، دەبراکەی تری (یوسف) یش لە دایکێکی ترن، (یعقوب) پێغەمبەر "علیه السلام" دوو خێزانی هەبوو بەناوی (راحیلو لیئە)، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد هەردوو خێزانەکەی (یعقوب) (١٢) کوڕیان هەبوو بەناوی: (روبین – شمعون – لاوی – یهودا – یساکر – زوبولون – یوسف – بنیامین – دان – نفتالی – جاد – استیر)[١]

---

١– ادیان وفرق، ص (١٦، ١٧) و إبن حزم الأندلوسی – کتاب الفصل في الملل والأهواء – والنحل.

بەڵێ ئەمەی پێشتر باسمان کرد گوزارشت کردنێکی زۆر خێرابوو دەربارەی ڕەچەڵەکی (یعقوب) پێغەمبەر "علیه السلام" کە نازناوی (إسرائیل) ی لێ نرابوو، دواتر دێینە سەر باسی ئەو هۆکارانەی کە گەلی جولەکە بۆ گەیشتنە میصر و چۆن زۆر بوون لەسەر زەویدا...کە ئەمەشیان پەیوەندیەکی راستەوخۆو پتەوی هەیە بە باسکردنی ژیانی یوسف پێغەمبەر لەگەڵ براکانیدا...

وەك لای هەموان ئاشکرایە کە (یەعقوب) (١٢) کوڕی هەبوو، بە جیاواز بۆ یوسفی دەروانیو خۆشەویستیەکی لە سنور بەدەرو تایبەتی بۆ هەبوو، کاتێ براکانی یوسف هەستی ئەوەیان تێدا دروست بوو کە باوکیان بایەخی زۆرتر دەداتە یوسفو خۆشەویستی تایبەتی هەیە بۆی توشی (حسد) بوون بە یوسفو هەر ڕۆژەی لە بیری نەخشەو پلانێکدا بوون بۆ دورخستنەوەو لەناوبردنی یوسف لە سۆزی باوکیان، بەڵێ هەموو پێکهاتن کە بەناوی سەیرانو یاری کردنەوە یوسفی برایان دەبەنە دەرەوەو کاتێکی خۆشی لەگەڵدا دەبەنە سەر...بەهەر نرخێك بوو (یعقوب) یان ڕازی کردو یوسفی تازە پێگەیشتوو جوانیان بردە دەرو لەشار دوریان خستەوە، سەرەنجام هەموویان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە نەی کوژن بەڵکو هەڵی بدەنە ناو بیرە ئاوێکەوە و لەوێدا بمرێت، ئەوان بە ویستو حەزی شەیتانانەی خۆیان یوسفیان کوشتو (بیر) یان بۆ کرد بە گۆڕ بەڵام ویستی پەروەردگار بە جۆرێکی تر بوو، یوسف نەمردوو ڕێبوارێکی ئەو ڕێگەیە هاتن و یوسفیان لەبیر دەرهێناو بردیانە بازاڕی بەندە فرۆشەکانی مصرو بە پارەیەکی زۆرکەمو بێ بایەخ فرۆشتیان بە عەزیزی مصر، لەو دەمەوە یوسف لە بیری تاریکەوەچووە کۆشکی (عەزیزی مصر) ەوە، ئەوکات یوسف گەنجێکی جوانو تازە پێگەیشتوو بوو، لەبەر ئاقڵیو ڕەوشت جوانی خۆی بوو بووە جێی سەرنجی تەواوی ئەندامانی کۆشك بەگشتیو عەزیزی مصرو خێزانەکەی بەتایبەتی، هەر بۆیە بایەخی زۆریان پێداو گرنگیەکی زۆری هەبوو لە لایان، یوسف لە کۆشکدا گەورە بوو، خێزانی عەزیزی مصر عاشقی جوانیو بێ وێنەی یوسف بوو بوو، سەرەنجام دوای پلان دانانێکی

زۆر یوسفی بانگ کرد بۆ دەست تێکەڵکردن لەگەڵیداو ئەنجامدانی کاری بێ ڕەوشتی....

حەوت دەرگای گەورەی لەسەر یوسف داخست لە ناو کۆشکدا بۆ ئەو مەبەستەی کە بواری ڕاکردنی نەبێت، بەڵام یوسفی ڕاستگۆو پێغەمبەری خودا ئەم داواکاریەی شەیتانیەی خێزانی عەزیزی مصری بەرپەرچ دایەوە لە دەستی ڕایکرد، بە فەرمانی خوای باڵادەست تەواوی دەرگا داخراوەکانی بۆ کرایەوەو دوا دەرگا کە کرایەوە ڕێگەی چوونە دەرەوە بوو لە کۆشک...عەزیزی مصر لەو جێگەیەدا ڕاوەستابوو! ! بەڕاستی ساتێکی خەجاڵەت ئامێزەو گەر خوای گەورە فریای بەندەی خۆی نەکەوێت ڕێگەی تر نیە بۆ سەلماندنی پاکی یوسفی پاك داوێن...

بە هەرحاڵ بەویستی خوای گەورە منداڵێکی شیرە خۆرە هاتە زمان[1]، لەسەر پاکی یوسفو خراپی خێزانی عەزیزی مصر، بەڵام لەبەر دەسەڵاتداری ئەوانو ئابڕو نەتکاندنیانو پەردە پۆشکردنی ئەم هەڵەو عەیبەیە (یوسف)ی ڕاستگۆ خرایە بەندیخانەو بۆساڵانێکی زۆر یوسفی بێ گوناه لە بەندیخانەدا مایەوە، دوای ئەوە پادشای میصر خەونێکی سەرسوڕهێنەری بینی و هیچ کەسێك لە میصردا نەیدەتوانی ڕاڤەی ئەو خەونە بۆ پادشا بکات، تا ئەوەیان بیرهاتەوە کە یوسف لە ڕاڤەی خەون دەزانێت و ناردیان بە شوێنیدا بە ویستی پەروەردگار خەونەکەی بۆ ڕاڤە کردن پادشای میصر لە پاداشتی ئەم خەو ڕاڤە کردنەدا یوسفی کردە بەرپرسی ئابوری لە مصرداو تەواوی دەسەڵاتی پێ بەخشی (٧) ساڵ بەسەر مصردا گوزاری کردو دانەوێڵەو خۆراکی باشیان کۆکردەوە بۆ (٧) ساڵی دوای ئەوە کە قاتو قڕیو بێ بارانی بوو، گرانی تەنها ڕووی لە مصر نەکرد، بەڵکو ڕووی لە تەواوی ئەو جێگایانە کرد کە لە دەوروبەری مصردا بوون...

خەڵکی ئەو دەورو بەرە پۆل پۆل ئەهاتن بۆ وەرگرتنی گەنم، یەکێك لەو دەستەو کۆمەڵانەی کە هاتن بۆ وەرگرتنی گەنم براکانی یوسف بوون، یوسف

---

[1]- بگەڕێرەوە بۆ تەفسیری (الجامع لاحکام القران) قرطبي سورة یوسف.

ئەوانی ناسیەوە کە براکانی خۆیەتی، بەلآم ئەوان نەیان زانی کە ئەمە (یوسف) ە، دوای چەند جار هاتن بۆ ولآتی مصر (یوسف) خۆی پێ ناساندن و داوای لێخۆشبونی بۆ کردن لە پەروەردگارو فەرمانی پێ کردن کە یەعقوبی باوکیان و تەواوی کەس و کار بهێنن بۆ مصرو لەوێ نیشتەجێ بن.

یوسف و یەعقوب و تەواوی کەس و کاریان لە ولآتی مصردا زۆر بوون تا بەهۆکاری ژن و ژن خوازیەوە رێژەیان زۆر بوو لە مصردا، دواتر سەردەمی فیرعەون هاتوو گەلی جولەکە کە پێیان دەوتن (بەنی ئیسرائیل) بونە گەلی کەمینەو ژێر دەستە لە مصردا لە ژێر دەسەلآتی فیرعەوندا، فیرعەون بە هەموو جۆرێك جینۆسایدی دەکردن و نێرینەکانیان ی دەکوشت و ئافرەتەکانیشی دەهێشتەوە هەروەك قورئان دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ القصص: ٤

**بێگومان ئەم لەناو بردنی بەنی ئیسرائیلیانە لە مصردا کۆمەلێك هۆکاری هەبوو کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:**

١. جولەکەکان لەناو مصردا بەتەنها دەژیان و تێکەلی میصریەکانیان نەدەکردو بەتەواوی مانا گۆشەگیر بوون، ئەم حالەتە شازە لەلای میصریەکان هەستی ترس و گومانی خراپی دروست کرد.

٢. ئاشکرابونی هەندێ پلانی جولەکە دژ بە گەلی میصری.

٣. جولەکەکان دانیان نەدەنا بەوەی کە گەلی میصریەکان گەلی یەکەمن و خاوەنی ولآتەکەن و زۆرینەن، پاشان خیانەتکردن لەو بەلێنانەی کە دەیاندا بە میصریەکان.

٤. زۆر ئەنجام دان و مومارەسە کردنی بەدکاری لەلایەن جولەکەکانەوە لە میصردا بەدرێژای مێژوویان.

٥. ئەمانەو دەیان هۆکاری تر هۆی لە ناو بردنی منداڵی نێرینە بوو لەلایان میصرییەکانەوە و هێشتنەوەی مێینەکانیان[1].

بەڵێ بەم جۆرە (جولەکە) لە میصرو دەوروبەریدا ژیانیان کێشا تا ئەو دەمەی خوای گەورە لە نەفسی خۆیان و لە یەك ساتدا دوو پێغەمبەری بۆ ناردن بەناوی(موسی و هارون) (علیهم السلام).

دوای بوون بە پێغەمبەری موسا و هارون مشتومڕی زۆریان لەگەڵ فیرعەون و دەسەڵاتدارانی میصردا، خوای گەورە فەرمانی کرد بە موسا کە تەواوی گەلی بەنی إسرائیل لە میصر دەربکات و ڕێگەی دەریا بگرنەبەر لە بەرەبەیانێدا!! فیرعەون و داروودەستەکەی پێیان زانین و شوێنیان کەوتن بەڵام بە ویستی پەروەردگار دەریایان بۆ لەت کرا بە(١٢) لەت هەر هۆزەی بە ڕێگەی خۆیدا پەڕینەوە ئەوبەر دەریاوە، فیرعەون و سەربازەکانی شوێنیان کەوتن و ویستی پەروەردگار وەهابوو کە لەناوەڕاستی دەریادا نوقمی غەزەبو ڕقی خوا ببن و لە ناو بچن. بێ گومان ئەمەی کە ڕوویدا لە ساڵی(١٢١٣) ی پێش زاین دا بوو.

**ڕزگار بوونی (جولەکە)کان بە ڕابەرایەتی (موسا)و هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەکی ڕەشی ژیانیان لە زەوی کەنعاندا:**

دوای ڕزگار بوونی ئەم گەلە ژێردەستەو دەروون ڕوخاوە لە چنگی فیرعەون بەڕابەرایەتی موسا پێغەمبەر"علیه السلام" ڕاستێتی دین و ناخ و کردەوەو بیروباوەڕو سلوكو تەواوی وردەکارییەکانی تریان دەرکەوت کە هەڵگری ج ئاکارو سیفەتێکی نزم و قێزەونن، ئەمەش ڕوونکردنەوەی لە چەند ڕووداوێکدا...

**ڕووداوی یەکەم:**

دوای پەڕینەوەی جولەکەکان (بەنی إسرائیل) لە دەریاو ئازادبوونو ڕزگاربوونیان لە چنگی فیرعون، بینیان کەوا گەلێك لەوبەر ئاوەکەوە گوێرەکە

---

١- أحمد شلبي- مقارنة الأديان- اليهودية ص(٥٨-٦٢).

دەپەرستن‌و کڕنوشی بۆ دەبەن لە غەیری خوای تاك و تەنها، خێراو دەست بەجێ ئەوەیان داوا کرد لە موسا کە بۆئەوانیش گوێرەکەیەك بسازێنێ تا بیکەن بە خواوەندو کڕنوشی بۆ بەرن! !سوکێتی و کەم ژیری لە ناخی ئەم گەلە بەزیوەدا، دوا پلەکانی بڕی بوو، لەبەر چاوانیاندا دەیان و سەدان موعجیزە و بەڵگەی ئاشکرایان بینی لە موساوە، بەڵام ئێستاو لەم کاتەدا، داوای گوێرەکە دەکەن؟ موسای جەستە ماندوو ڕووی تێ کردن‌و بەخەم‌و پەژاریەکی زۆرەوە پێی وتن: بەڕاستی ئێوە گەلێکی نەزان‌و نەفام‌و کەم ژیرین! ! ﴿ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾.

## ڕووداوی دووەم:

دوای مانەوەیان لە زەوی کەنعاندا خوای گەورە لە ئاسمانەوە گەزۆو گۆشتی باڵندەی بۆناردن، بەڵام ئەوان داوای سیرو پیازیان کرد لە موسا "علیه‌السلام" قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَاحِدٍ فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ﴾ البقرة:٦١.

واتە: بە موساتان وت: ئێمە لەسەر یەك جۆر خۆراك ئارام ناگرین، لەبەر ئەوە داوا لە پەروەردگارت بکە کە بەروبومی سەوزایمان بۆ بەرهەم بهێنێت لە ڕووەکی پاقلە وخەیارو پیاز وسیرو نیسك...

## ڕووداوی سێ هەم:

خوای گەورە موسای بانگ کرد بۆ کێوی (طور) بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ کە موسا لەوێ قسە لەگەڵ پەروەردگاریدا بکات وپەرستشی بۆ ئەنجام بدات و لە بەرامبەریشدا خودای گەورە (تەوراة) بداتە موسا.لە دوای ڕۆیشتنی موسا بۆ کێوی (طور) هارونی برای لە جێگەی خۆی دانا تا ئاگاداری گەلی بەنی إسرائیل بێت‌و لە ماوەی ئەو (٤٠) ڕۆژەدا، کەسێکی ساختە بازو بێ باوەڕلەناو بەنی إسرائیلیەکاندا بە ناوی (سامری) هەڵسا بە دروستکردنی گوێرەکەیەك بە ئاڵتون بۆیان کە جۆرە دەنگێکی لێوە دەهات وەهای تێگەیاندن کە ئەمە خوایە نەك ئەوەی کە موسا

چووه بۆ لای كه پەرستشی بۆ بكات له كێوی (طور)! ! زۆربەی زۆریان هەڵسان بە پەرستنی گوێرەكەكەو كڕنوش بۆ بردنی... خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿... وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ.... فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴾ طه:٨٥–٨٨.

واته: سامری گومڕای كردن... لەو زێڕو زیوە گوێرەكەیەكی بۆ دەرهێنان و دروست كردن كه دەنگی لێوە دەهات و ئەوجا پێ ی وتن: ئەمە پەرستراوی ئێوەو موساشە ئەو بیری چووەو بە شوێنی دا دەگەڕێ؟!

رووداوی چوارەم:

ئەوانەی كه ئەم كاری گوێرەكە پەرستییەیان لەگەڵ سامری دا ئەنجامدا بوو، فەرمانیان پێكرا بەوەی كە خودی خۆیان بكوژن، ئەوجا خوای گەورە لێیان دەبورێت.

بەڵێ، ژمارەیەكی زۆریان بەم هۆكارە مردن تا ئەوەی كە خەریك بوولەناو بچن، دواتر داوایان له خوای گەورە كرد كە ئەم سزایە ڕابگرێت، بەڵێ خوای گەورە سزاكەی ڕاگرتو داوای ئەوەی لێ كردن كە لەسەر چیایەكی بەرز تەوبە بكەن و پەشیمانی خۆیان دەرببڕن، كاتێك چونە سەر چیاكە وتیان بە موسا: ئەی موسا ئێمە هەرگیز بڕوات پێناكەین هەتا پەروەردگارت ڕوخساری خۆیمان پشان نەدات! !دەست بەجێ خوای گەورە لە ئاسمانەوە هەورە بروسكەیەكی لێدان و سوتاندنی.

قورئان دەفەرمێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾ البقرة: ٥٥.

واته: وتیان: ئەی موسا باوەڕت پێ ناكەین تاوەكو بە ئاشكرا و بە چاوی خۆمان خوا نەبینین، ئیتر هەورە بروسكەیەك لێی دان، لە كاتێكدا كە تەماشاتان دەكردوو بەدەوروبەری خۆتاندا دەتان ڕوانی.

## ڕووداوی پێنجەم:

لە زەوی کەنعاندا فەرمانیان پێ کرا کە بچنە ناو خاکی پیرۆزەوە(فەلەسطین) کە ئەویش لە لایەن خواوە بە لێن درا بوو بە هەریەك لە (إبراهیم و إسحاق و یعقوب) کە ئەم خاکە جێگەی نەوەکانیانە بەلام ئەم گەلە ترسنۆك و ناخ بەزیوە لەبەر ترسنۆکیو خۆشەویستی ژیانو ڕاکردن لە ڕووبەڕووبونەوەی دوژمنەکانیان بوێری ئەوەیان تێدا نەبوو کە بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی کە خاکی (فەلەسطین) یان لەوان داگیر کردووەو بەڵکو بە پێچەوانەوە وتیان بە موسا: ئەی موسا لەناو خاکی پیرۆزدا گەلێکی زۆر دەسەلات دارو ئازای تێدایە و ئێمە ناتوانین بەرەوڕویان ببینەوە و بجەنگین لەگەڵیاندا، تۆ وخواکەت بڕۆن لەگەڵیاندا بجەنگن ئێمەش چاوەڕوانتان دەکەین تا سەر دەکەون بەسەریانداو ئەوسا ئێمە دێینە ناویەوە ! !کاتێ موسا(علیه السلام) گوێ بیستی ئەم قسە ناخۆش و هەڵوێستە نامرۆڤانەیان بوو، تەواوی ناڕەحەتیەکانی تریشی وەبیری هاتەوە و بەتەواوی مانا بێ زاری خۆی لە بەرامبەریاندا دەربڕی و داوای ئەوەی لە پەروەردگاری کرد کە لێرەدا کاری ئەم کۆتای بهێنێت لەگەڵ ئەم گەلە ترسنۆك و ناخ بەزیوەدا و بەتەواوی جیایان بکاتەوە لە یەکتری.

خوای گەورە وەلامی داواکەی موسای دایەوەو سزای ئەوەی دان کە تا (٤٠) ساڵ دەبێت لە دەشتی کەنعان و سنوری خاکی پیرۆزی(فەلەسطین) دا بمێننەوەو نەچنە ناو ئەو خاکەوەو! ! قورئان دەفەرموێت: ﴿ يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ

﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِيۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْۛ أَرْبَعِينَ سَنَةًۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلْأَرْضِۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ المائدة: ٢١-٢٦.

بەڵێ موسا و هارون(عليهم السلام) لێرەداو لەم کاتەدا بانگەوازیان لەگەڵ ئەم گەلە بەتکارەدا کۆتای هات و (هارون) لە پێش موسادا وەفاتی کردو لە چیای (هور) بەخاك سپێردرا لە چیاکانی (سینا).

پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد بە موسا کە بەسەر چیای (نبو) دا سەربکەوێت و سەیری خاکی پیرۆزی (فەلەسطین) بکات بەبێ ئەوەی بچێتە ناوی، موسا ئەمەی ئەنجام داو لە وێدا وەفاتی کردو هەر لە وێشدا نێژرا[1].

بێ گومان ئەمەی کە باسمان کرد دڵۆپێکەلە دەریای ژیانی ئەم گەلە بەدکارە لەگەڵ یوسف و پاشان موسادا "عليهم السلام"

## هۆکاری ناونانی جولەکە بە (یهود)

ڕاوبۆچونی زانایانی ئەم بوارە جۆراوجۆرە لە هۆکاری ناونانی ئەم گەلە بە (یهود).

سەرەتا دینی (یهودی) بریتی بوو لەو نامە ئاسمانییەی کە درا بە موسا لەسەدەی (١٥) ی پێش زاین[2] لە بناغەدا و پێش دەستکاری کردنی دینێکی پاك و بێگەرد بوو. مرۆڤەکانی بانگ دەکرد بۆ یەکتاپەرستی خواو دەست بەردار بونیان لە خراپەو بەدکاری، پەرتوکی ئەم دینە ناوی (تەورات) بوو، بەخشرا بو بە موسا لە پەندو ئامۆژگاری پێك هاتبوو...بەڵام دواتر لەلایەن جولەکەوە دەستکاری کراو شێوێنرا، لە باسەکانی داهاتودا بەدرێژی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

---

١- قصص الأنبياء (عبدالوهاب نجار) ص ٢٢٨.

٢- اليهودية عقيدة و شريعة. د. أسعد السحمراني ص(١٣)

ووشەی (يهود) لە ناوی (يهوذا) (juda) وە،وەرگيراوە كە (يهوذا) يەكێكە لە براكانی يوسفو كوڕەكانی يعقوب، عەرەب (ذا) ی (يهوذا) كەيان هەڵگێڕاوەتەوەو كردويانە بە (دال)[1].

•هەندێكی تر وا لەمانای (يهود) تێ گەيشتون كە كە پەيوەستە بەو كاتەی كە بەنی إسرائيلييەكان دەستيان دايە گوێرەكە پەرستی لەسەر دەستی (سامری) دواتر تەوبەيان كردو گەڕانەوە و، وتيان: ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ﴾ ، واتە، ئێمە تەوبەمان كردو گەڕاينەوە بۆ لای تۆ (واتە پەروەردگار).

• **پێناسەی وشەی (إسرائيل و بەنی إسرائيل)**

(إسرائيل) وشەيەكی (أرامية) و لە دوو برگە پێك هاتووە (إسرا) بە مانای بەندە (عبد)، (إيل) بە مانای، پەرستراو (الآلە) كە لێكدانی هەردوو برگەكە لە زمانی عەرەبيدا دەبێتە (عبدالالە)[2]

(إسرائيل) نازناوێك بوو بۆ (يعقوب) پێغەمبەر بەكار دەهێنرا و، ووشەی بەنی واتە (نەوە)، واتە كاتێك دەڵێن (بەنی إسرائيل) بە مانای (نەوەكانی إسرائيل) دێت، يانی نەوەكانی (يعقوب) كە براكانی يوسف دەكات.

• **پێناسەی وشەی (العبرانية أو العبرانيون)**

وشەی (العبرانية) لە (عبور) ە وە هاتووە و بەمانای ڕۆيشتن وتێپەر بوون دێت.ئەم وشەيە دەگەڕێتەوە بۆ خودی (إبراهيم) "عليه السلام" لە (سفر التكوين) دا بە (إبراهيم العبراني) ناوبراوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی (عبر نهر الفرات وأنهار أخرى)[3] واتە: ڕۆيشتووەو تێ پەڕيوە بەلای ڕوباری فورات و روباری تردا.

---

١- الموجز في الأديان و المذاهب المعاصرة. ص(١٨).

٢- اليهودية عقيدة و شريعة. د. أسعد السمحراني ص (١٧).

٣- أديان و فرق. د. أمين القضاة ص (١٤).

• هەندێکی تر وشەی (العبرانیة) دەگەڕێننەوە بۆ وشەی (عبر) کە باپیرەی پێنجەمی إبراهیم بووە[1].

• دکتۆر (ولفنسون) دەڵێت: ((هۆکاری ناو بردنیان بە (العبرانین) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە بیاباندا ژیاون و گەڕاون بە شوێن ژیاندا، پاشان تێپەڕ بوونیان بەلای مەڕو ماڵاتدا، هەروەها گەڕان بەشوێن پاروە ناندا لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر))[2] ، توێژەرەوان مێژووی عبرانیان کردووەتە سێ بەش:

أ- العبرية القديمة .

ب- العبرية الوسيطة.

ج-عبرية المنشاة.[3]

## سیفەتەکانی جولەکە (الیهود)

تێگەیشتنن لە مێژووی پڕ لە تاوانی جولەکە بەتەواوی ئاشنامان دەکات بە سیفەتە دزێو و خراپەکانیان کە دیارترینیان ئەمانەن:

### ١. ناسینی ڕاستی و شاردنەوەی:

یەکێك لە سیفەتە زۆر خراپەکانی جولەکە بریتیە لە ناسینی ڕاستی و شاردنەوەی لە خەڵکی و پەردەپۆش کردنی، ئەویش لە پێناوی ئەوەی کە خەڵکی هەموو کات لە گومڕایدا بن و شوێن ڕاستی نەکەون و بەرچاو ڕۆشن نەبن، چونکە سودو بەرژەوەندی ئەمان لە گێلی و نەفامی ونەزانینی خەڵکیدایە، قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمێت: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓا۟ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ البقرة: ٧٦.

---

١- أديان و فرق. د. أمين القضاة ص (١٤).

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- (اليهود و اليهودية و الصهيونية) د. عبدالوهاب المسيري.

**واتە:** کاتێك جولەکەکان دەگەیشتن بە بڕواداران دەیان وت: ئێمەش بڕوامان هێناوەو مسوڵمان بووین، بەڵام کاتێك کە لەگەڵ یەکتردا کۆدەبونەوە، دەیان وت بەوانی تر: ئەوە بۆ ئێوە ئەو شتانەیان بۆ باس دەکەن کە خوا لەتەوراتدا باسی کردووە(دەربارەی پێغەمبەرایەتی محمد) تاوەکو بیکەنە بەڵگە بەسەرتانەوە لای پەروەردگار، ئایا ئێوە عەقڵتان بەو جۆرە شتانە ناشکێت و ژیریتان ناخەنە کار؟!

### ٢. ترسنۆکی(الجبن):

قورئان وەسفی جولەکە دەکات بە گەلێکی ترسنۆکو بێ غیرەتو بێ عزەت، وە هۆکاری ئەم ترسنۆکییەیان دەگەڕێتەوە بۆ زۆر خۆشویستی دونیا و پەیوەست بوون پێوەی و دوا ڕۆژیان لە بیرکردووە.

ترسنۆکی یەکێکە لە بەرهەمەکانی غەدر وخیانەت و دەستدرێژی و داگیرکاری کە جولەکە بە درێژای مێژوو هەڵگری ئەم سیفەتانە بوون[1]، قورئان لە بارەی زەلیلی جولەکەوە دەفەرمێت: ﴿ضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيۡنَ مَا ثُقِفُوٓاْ إِلَّا بِحَبۡلٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَسۡكَنَةُۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾ آل عمران: ١١٢.

**واتە:** (جولەکە زەلیلی و ڕیسواییان بۆ بڕیار دراوە لە هەرکوێ جێگیر بن مەگەر لە سایەی ئاینی خودادا بحەوێنەوە، یان خۆیان هەڵواسن بەخەڵکیدا بۆ یارمەتی دانیان، ئەوانە شایستەی خەشم و قینی خوابوون، زەلیلی و خەجاڵەتی بەشیانە، چونکە ئەوانە باوەڕیان نیە بە ئایەتەکانی خوا، پێغەمبەران بە ناهەق دەکوژن، ئەم یاخی بوون و سەرشۆڕییەیان بەهۆی سەرپێچی و گوناهباریەوەیە، ئەوانە هەمیشە لە سنور دەرچوون و دەردەچن).

---

[1]- اليهود في القرآن. عفيف عبدالفتاح طبارة (ص ٤٢).

یان دەفەرموێت: ﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾ الحشر: ١٤ .

**واتە:** ((هۆزی (جولەکە) هەرگیز بەیەکپارچەی ناوێرن بجەنگن مەگەر لەشوێنی قایم و قەڵای سەختدا نەبێت، یان لە پشتی دیوارەوە....) )

**ڕوون کردنەوەیەك :**

گەرسەرنجی ئایەتی(١١٢) ی سورەتی (آل عمران) بدەین باس لەوە دەکات کە جولەکە لە هەرکوێ بژین بڕیاری زەلیلی و سەرکزی وسەرشۆڕی دراوە بەسەریاندا، لەبەرامبەردا گەرسەرنجێکی واقعی ئێستەیان بدەین، دەگەینە ئەو ئەنجامەی لە حاڵی ئێستەیان -بەڕووکەش- پێچەوانەی ئەو بڕیارە قورئانیەیە کە خوای گەورە باسی دەکات؟!

وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە و هاوسەنگ کردنی هەردوو حاڵەتەکە کارێکی ئاسانەو ڕوون و ئاشکرایە، ئەویش بەم جۆرە.

أ- کاتێك یاسای ئەم ئایەتە بەسەر جولەکەدا دەچەسپێت کە بەرامبەرەکانیان (واتە مسوڵمانان) بەتەواوی مانا دەست بگرن بە دینی خوای گەورەو سونەتەکانی پێغەمبەر ﷺ وە دەستبەرداری خراپەو دونیا پەرستی ببن و لەبری شانازی کردن بە دونیا وناو و ڕەگەز و زمان و کەلتور و مێژووی باوباپیران و سەروەت و دەسەڵات و تەواوی شتە ماددیەکانی ترەوە، فەخرو شانازی تەنها بە (إسلام) ەوە بکەن.

ب- لە ئایەتەکەدا زۆر بەئاشکرا باس لە دوو هۆکار دەکات بۆ لابردنی ئەو یاسای زەلیل کردن وڕسوا کردنەی سەر جولەکەکان، کەئەوانیش:

**حبل من الله:**

بەمانای ویست و إیرادەی خوای گەورە لەو کاتەدا(جولەکە) سەر دەخات و یاساکەیان لەسەر لادەبات، ئەویش وەك سزایەك دەبێت بۆموسڵمانان کە لەودەمەدا دەست بەرداری دینی خوا بوون و دونیا لە هەموو شتێك گەورە تر و خۆشەویست

تره لایان، هەر بۆیە لەم کاتەدا خوای گەورە یاساکە بەشێوەیەکی کاتی لادەبات و جولەکە دەکاتە مایەی سزا بۆ ئەم جۆرە مسولمانانە، کە بێ گومان ئەمەی باسی دەکەین حالی مسولمانانی ئەمڕۆیە و بەتەواوی عەرەبە بەناو موسلمانەکان ناتوانن تەنانەت قسەیان یەك خەن لە بەرامبەر دژایەتی کردنی جولەکەدا، لە(فەلەسطین) نەك ئەمەیان پێناکرێت تەنانەت لە نێوان یەکتریشدا ناکۆکن لەسەر(فەلەسطین) و هەریەکەیان لە ئاوازێك دەخوێنێت، لەم کاتەدا بڕیارەکەی خوای گەورە زۆر ئاشکراو دیارە کە سزاکەی لەسەر جولەکە لابردووە و داویەتی بەسەر ولاتە بەناو موسلمانەکاندا !!

حبل من الناس:

بەمانای دەستگرتن ویارمەتی و کۆمەکی جولەکەوە لەلایەن خەلکەوە، دووبارە مایەی لابردنەوەی سزاکەیە لەسەر جولەکە، کە ئەمڕۆ زۆر بەئاشکرا تەواوی ولاتە زل هێزەکانی ئەوروپاو زۆربەی زۆری ولاتە عەرەبیە بەناو إسلامیەکان و لەسەرو هەمووشیانەوە (ئەمریکا) گەورەترین پالپشتن بۆ یارمەتی دانی جولەکە لەتەواوی بوارەکاندا (ئابوری–سیاسی–کۆمەلایەتی–سەربازی......هتد).

مەخابن ئەو دەمەی مسولمانان بەڕاستی موسلمان بوون و خەباتیان دەکرد بۆ بەرز ڕاگرتنی وشەی (لا إله إلا الله) تاکە گەل بوون لەسەر ڕووی زەویدا لە ڕووی پێشکەوتنی سیاسی وسەربازی و هونەری و زانستی تەواوی بوارەکانی تر، هەروەك مێژوونوسێکی خۆرئاوا بەناوی (سیدۆ) لە کتێبی (تاریخ العرب) دا دەلێت: ((كان المسلمون في القرون الوسطى متفردين ڤ العلم و الفلسفه و الفنون و وقد نشروها أين ما حلت اقداهم، وتسربت عنهم إلى أوروبا، فكانوا هم سبب لنهضتها و إرتقائها)) [1].

واتە: موسلمانان لە سەدەکانی ناوەڕاسدا تاکە گەل بوون لە زانست و فەلسەفە و هونەر، وە پێکانیان پگەیشتایە هەر جێگەیەك ئەمەیان تێدا بلاو دەکردەوە،

---

[1]– روح الدين الاسلامي عفيف عبدالفتاح طبارة ص(٢٨٧).

لەویشەوە بەرەو ئەوروپا کەوتە ڕێ، موسڵمانەکان بوونە هۆکاری بەرز کردنەوەو ڕاپەڕین لە ئەوروپادا.

پاشان(بریفۆلت) کە مێژوونوسێکی ئەوروپیە لە کتێبی (بناء الانسانیه) دا دەڵێت: (زانست بەتەنها ئەوروپای نەگێڕایەوە بۆ ژیان، بەڵکو چەندین هۆکاری تر هەبوو وەك کار لێکردنی شارستانیەتی إسلامی کە بووە هۆی زیندوو کردنەوەی ئەوروپا لەو نەزانیەی کە تێیدا دەژیا...)[1].

سەرنج بدە ئەمە حاڵی موسڵمانان بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە کاتێکدا کە پەیوەست بوون بە دینی خوای گەورەوە، شوانی گەلان و میللەتانی تریش بوون، بەڵام ئێستا پاشکۆ و بێ ناو و بێ دەسەڵاتن و، ئەوەی دوێنێ ژێر دەستەو کرێچی موسڵمانان بوو ئەمڕۆ بۆتە خاوەن ماڵ و خاوەن ماڵیش بۆتە کرێچی!!!

### ٣. پەیمان شکێنی (نقض العهود):

دیارترین سیفەت و ئاکاری جولەکە بریتیە لە پەیمان شکێنی و درۆکردن لەو بەڵێنانەی کە دەیدەن بە بەرامبەرەکانیان، گەر سەرنجێکی قورئانی پیرۆز بدەین دەبینین کە گوزارشت لەم سیفەتە بەدەی جولەکەمان بۆ دەکات.

قورئان دەفەرمێت: ﴿ أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُواْ عَهۡدٗا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ البقرة: ١٠٠.

**واتە**: هەرکاتێك (جولەکەکان پەیمان ببەستن لەگەڵ خواو پێغەمبەر و باوەڕداران خێرا و دەستبەجێ دەستەیەکیان پەیمانەکەیان شکاندووە، بەڵکو زۆربەی زۆریان بڕوایان نیەبە (گەورەی پەیمان) ).

یان دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗ ﴾ المائدة: ١٣.

---

١- تجدید الفكر الدیني : محمد أقبال. ص(١٤٩).

واتە: بەهۆکاری ئەوەی کە (جولەکە) کان بەردەوام پەیمان و بەڵێنەکانیان دەشکاند نەفرەتمان لێ کردنو دڵەکانیانمان رەق و سەخت کرد...

هەروەها لە سورەتی الانفال دا دەفەرمێت: ﴿ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ﴾ الانفال: ٥٦.

واتە: ئەوانەی کە پەیمانت لەگەڵ دا بەستون، کەچی هەموو جارێك پەیمانەکەیان دەشکاند چونکە لە خوا ناترسن و پارێزکار نین...

گەر سەرنجی مێژووی جولەکە بدەین لەو دەمەی کە نەوەکانی (یعقوب) (إسرائیل) پەیمانیان دا بە باوکیان کە (یوسف) بپارێزن و ئاگاداری بن لە چنگی گورگ و ئاژەڵە دڕندەکان و بەسەلامەتی تەسلیم بە یعقوبی باوکیانی بکەنەوە، بەڵام دواتر بۆ خۆیان بوونە ئاژەڵی دڕندە و ئەو پەیمانەیان شکاندکە پێشتر دابوویان بە باوکیان، دواتر بێ وەعدی وشکاندنی پەیمانیان لەسەردەمی موسا و پێغەمبەرانی دوای ئەوان و سەردەمی پێغەمبەر و شکاندنی پەیمانەکەنیان لەمەدینە و دواتریش لەم سەردەمەی خۆماندا کە دەیان و سەدان پەیمان دەدەن لەسەر ئاشتی لەگەڵ لایەنە فەلەستنیەکان و دواتر لێ ی پاشگەز دەبنەوە و بەئاسانی پێشێلی دەکەن.

### ٤. پێشبڕکێ کردن لەگەڵ یەکتردا لەسەر تاوان و دروست کردنی ئاژاوەو خواردنی حەرام:

هەر وەك قورئان دەفەرمێت: ﴿وَتَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَ .......﴾ المائدة: ٦٢

واتە: زۆرێك دەبینی لە(جولەکە) کان پێشبڕکێ دەکەن لەسەر تاوان و خراپەکاری و خواردنی حەرام.

**٥. شێواندنی وتەی خوای پەروەدگار کە (تەورات) ە (تحريف الكتاب):**

خوای گەورە لە کێوی (طور) دا تەوراتی بەخشیە موسا، کە بێ گومان مایەی ڕێ نیشان دان وهیدایەت دانی گەلی بەنی إسرائیلی تێدا بوو هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞ ﴾ المائدة: ٤٤، **واتە:** ئێمە تەوراتمان ناردە خوارەوە کە ڕووناکی و ڕێنومای تێدا بوو.

بەڵێ دوای وەفاتی موسا "عليه السلام" جولەکەکان هەڵسان بە دەستکاری کردنی تەورات و شێواندنی وتەکانی خوای گەورە، قورئان شایەتی ئەم ڕووداوەیە و دەفەرمێت: ﴿ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ﴾ النساء: ٤٦.

**واتە:** هەندێك لە (جولەکە) کان قسە لەجێ ی خۆیدا دەستکاری دەکەن و بە ئارەزووی خۆیان لێکی دەدەنەوە.

کە مانای تەواو دروست لە ئایەتەکەدا ئامازە کردنە بۆ دەستکاری کردن و شێواندنی (تەورات) لەلایەن جولەکەوە.

وەیان دەفەرمێت: ﴿ أَفَتَطۡمَعُونَ أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعۡدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴾ البقرة: ٧٥.

**واتە:** دەستەیەك لە شارەزاکانیان گوفتاری خودایان دەبیست لە (تەورات)دا لەمەودوا دەستکاریان دەکرد دوای ئەوەی تێ ی گەیشتبوون و دەیان زانی ڕاستییەکە چی یە.

یان دەفەرمێت: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ﴾ البقرة: ٧٩.

**واتە:** وەیل بە حاڵی ئەو کەسانەی کە کتێب دەنوسن بە دەستی خۆیان و دەڵێن: ئائەمە لەلایان خواوەیە، بەو مەبەستەی کەمێك لە ماڵی دونیا بەدەست

بهێنن جا وەیل بۆ ئەو دەست وقەڵەمانەی کە شتی وا دەنوسن وە وەیل بۆ ئەو کەسانەی کەشایەتی ئاوا ئەنجام دەدەن...

٦. دڵ ڕەقی زۆر(قلوبهم شديد القسوة):

یەکێکی تر لە سیفەتە بەدەکانی جولەکە بریتیە لەدڵ ڕەقیو نەبوونی سۆزو بەزەی لەبەرامبەر هیچ کەس وشتێکدا، جولەکە خاوەنی هیچ سیفەتێکی سۆزو ڕەحم وبەزەیی و خۆشەویستی نیە بۆ ئەوانەی کە جولەکە نین، بەڵکو بە چاوی دوژمن کارانەو ڕق و خیانەتەوە دەڕوانن بۆ گەلانی تر بە گشتی و موسڵمانان بەتایبەتی...

فڕێ دانی(یوسف) بۆ ناو بیری تاریك باشترین و زیندووترین نمونەیە لەسەر بێ ڕەحمی و نەبونی سۆزو بەزەیی لە دڵی نەوەکانی یعقوب دا، کە دواتر تەواوی جولەکەی دونیا لە ئەوانەوە سەرچاوەی گرت...ئەمە وەك مێژوو، لە سەرجەم سەدەکاندا جولەکە سنبولی دڵ ڕەقی و دووربوون بووە لە بەزەییەوە، کردەوە درێوو پڕ لەتاوانەکانی ئەم سەردەمەش باشترین وزیندووترین بەڵگەن لەسەرئەم سیفەتەیان، مامەڵە کردنیان لەگەڵ گەلی موسوڵمانی فەلەستین لە ساڵی(١٩٤٨) ەوە تا ئەم کاتە وکوشتن و داگیرکردن وتاقیکردنەوەی تازەترین چەکی پێشکەوتوو، کە لە هیچ پارچەیەکی ئەم سەر زەویدا تاقی نەکراوەتەوە، جولەکەی دڵ ڕق تاقییان کردەوە بەسەرموسڵمانانی فەلەسطین بەگشتی وموسڵمانانی (غزە) بەتایبەتی لەکۆتایی ساڵی (٢٠٠٨) کە دڵ ڕەقانەو بێ بەزەییانە، بە هێرشی ئاسمانی و زەمینی و دەریای ماوەی مانگێك زیاتر هێرشیان کردە سەر کەرتی (غزە) و هەزاران کەسی بێ دیفاع و بێ گوناهـ لە منداڵ و ژن و پیر وکەم ئەندام و....) ) شەهید کردو خاوەنی هیچ سۆزو بەزەییەك نەبوون، پەردە لادرا لەسەر حەقیقەتی ئەم گەلە دڕندەیە کە خاوەنی هیچ قیەم و مەبدەئوو یاسا و بیروباوەڕێك نین و لەپێناوی بەدەست هێنانی بەرژەوەندییەکانیاندا هەموو کارێك

ئەنجام دەدەن، جولەکەی خوێن ڕێژوبێ بەزەیی لە فەلەسطین ی شەهیدوو داگیر کراودا خاوەنی دەیان و سەدان وقەساب خانەن کە ئەمانە هەندێکیانن:

قەساب خانەی(دیریا سین)

لەم پەلامارو ڕەشە کوژیەیاندا سەربازە دڵ ڕەقەکانی جولەکە دایان بەسەر ئەم جێگەیەدا و لە کۆی (٣٠٠) کەسی ئەم جێگەیە (٢٥٠) کەسیان لێ شەهید کردن، کە(٢٥) ئافرەت و (٥٢) منداڵی خوار تەمەن (١٠) ساڵانەی تێدا بوو، بێ گومان ئەم ڕووداوە لە بەرە بەیانی ڕۆژی شەمەی ساڵی (١٩٤٨) ڕویدا.

قەساب خانەی(شرفات)

لە (٧) شباطی ساڵی (١٩٥١) کۆمەڵێکی زۆریان لە ئافرەت و پیر ومنداڵ شەهید کرد.

قەساب خانەی گوندی(بیت جالا)

لە (٦) ی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٥٢) هێزە سەربازیەکانی جولەکە دایان بەسەر ئەم گوندەدا و تەواوی خانوەکانیان لەگەڵ زەویدا تەخت کرد...

قەساب خانەی (قیبیة)

ئەمە گوندێکی عەرەبیەو دوو کیلۆمەتر لە قودسی داگیرکراوەوە دوورە، لە شەوی (١٤) ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٣) فەوجێکی تەواوی سەربازە بێ بەزەییەکانی جولەکە هێرشیان کردە سەری وتەواوی خانووەکانیان ڕووخان بەسەر دانیشتوانەکەیدا و ڕەشەکوژی تەواویان لەم جێگەیەدا ئەنجام دا.

قەساب خانەی غەزە

لە(٨) ی شوباطی ساڵی (١٩٥٥) سەبازەکانی جولەکە دایان بەسەر کەرتی غەزەدا و بە لولەی تفەنگەکانیان دەست درێژیان کردە سەر خەڵکی بێ تاوان ولە ئەنجام دا (٢٩) کەسیان لێ شەهید کردوو (٢٢) کەسیشان بریندار کرد.

قەساب خانەی (شاطئ طبريا)

لە (١١) ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٥) سەربازەکانی جولەکە هێرشیانکردە سەر (ئەم جێگەیە) لە ئەنجامدا (٥٦) کەسی بێ دیفاعیان شەهید کرد.

قەساب خانەی غەزەی دووەم

لە (٥) ی نیسانی ساڵی (١٩٥٦) مەدفەعەکانی سەربازانی جولەکە، دەستیان کرد بەتەقەکردن لە خەڵکی بێ دیفاع و لە ئەنجام دا (٦٠) کەسیان لێ شەهید کردوو لە ناویاندا (٢٧) ئافرەت و(٤) منداڵ و (٩٣) بریندارى تێدا بوو.

قەساب خانەی (غرندل)

لە (١٣) ئەیلولی ساڵی (١٩٥٦) دا ڕووی داو (١٣) کەسی تێدا شەهید کرا[١].

قەساب خانەی (حوسان)

لە شەوی (٢٥) ئەیلولی ساڵی (١٩٥٦) سەربازە بێ بەزەییەکانی جولەکە هێرشیانکردە سەر گوندی (حوسان) کە دەکەوێتە سنورەکانی ئەردەن و (٣١) کەسیان تێدا شەهید کرد.

قەساب خانەی (قلقيليه)

لە (١٠) ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٦) سەربازانی جولەکە هێرشیان کردە سەر (قلقيليه) و (٢٥) کەسیان لێ شەهید کرد.

قەسابخانەی (کفرقاسم)

لەم کارە نامرۆڤانەیاندا و لە ساڵی (١٩٥٦) هێزە سەربازییەکانی إسرائیل (٥٧) کەسیان شەهید کردوو (٢٥) کەسی تریشیان بریندار کرد.

قەسابخانەی (رفح)

لە ساڵی (١٩٥٦) دا ڕوویدا سەربازە دڕندەکانی إسرائیل ژمارەیەکی زۆریان لە خەڵکی (ڕەفەح) شەهید کرد لەنێوان تەمەنی (١٥ بۆ ٧٠).

---

١- اليهود تأريخ إفساد و انحلال و دمار د. توفيق الواعي من ص (١٨٦ ألى ١٩٤).

ئەسابخانەی (تل الزعتر)

ئەسابخانەی(بیروت)

ئەسابخانەی (صبرو شاتیلا)

لەسەر دەستی خوێن ڕێژی جولەکە (شارون) لە ساڵی (١٩٨٢) کەبە هەزاران خەڵکی تێدا شەهید کرا.

ئەسابخانەی غەزەی سێ هەم

لە کۆتای ساڵی (٢٠٠٨) ولە سەرەتای (٢٠٠٩) کە چەکی فسفۆڕی تێدا بەکار هات و سەدان کەسی بێ گوناهی (غەزە) ی تێدا بوون بە قوربانی و ماوەی یەك مانگ زیاتری خایاندوو نە عەرەبە دووڕووەکانو نە وڵاتە بەناودیموکراتییەکانی ڕۆژئاوا و نە ئەمریکای بەناو دژە تیرۆر هەڵوێستێکی مرۆڤانەیان دەرنەبڕی، بەڵکو بەپێچەوانەوە بە نهێنی کۆمەکی جولەکەیان دەکرد لەسەر ئەم کۆمەڵ کوژیە.

قورئان دەربارەی دڵ ڕەقی وبێ ڕەحمی ئەم گەلە گەندەڵە دەفەرموێت:

﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ البقرة:٧٤.

**واتە:** دواتر دڵەکانتان ڕەق بوو (ئەی جولەکە) هەروەك بەردو بگرە لەبەردیش ڕەقتر...

یان دەفەرمێت: ﴿ ...وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ﴾ المائدة: ١٣.

**واتە:** دڵەکانیانمان ڕەق وسەخت کرد.

یان دەفەرمێت: ﴿ وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ البقرة:٨٨.

واتە: (جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر) وتیان دڵمان داخراوە (لە گوفتاری تۆ، تێ ناگەین) بەڵکو ئەوانە خوا نەفرەتی لێ کردوون بەهۆی کوفروو خوا نەناسییەوە، زۆر کەم باوەڕ دەهێنن و باوەڕ دەکەن.

٧. ڕق بوونی زۆریان لە باوەڕ داران (شدة كراهتيهم للمسلمين)؛

هیچ گەل و میللەت و ڕەگەزێك نیە لەسەرزەویدا بەدرێژای مێژوو هێندەی جولەکە ڕقیان ئەستور و بێ سنور بێت لەبەرامبەر موسڵماناندا، گەر سەیری مێژووی ڕەش و پاشان واقعی ژیانی دەسەڵاتی سیاسی و سەربازیان بکەین لەمڕۆدا، بەتەواوی مانا ئەم ڕاستیەمان بۆدەردەکەوێت.

خوای گەورە دەربارەی ئەم سیفەتە نادروستەیان دەفەرمێت: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ المائدة:٨٢.

واتە: دەبینی لە هەموو کەس زیاتر، لە هەموو دوژمنان زیاتر هۆزی جولەکە، سەر سەختانە دژایەتی باوەڕداران دەکەن.

پاشان قورئان جەخت لەسەر ئە ڕاستیە دەکاتەوە کە جولەکەکان بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدان وخەون بە ئەوەوە دەبینن کە باوەڕداران و موسڵمانان لە (إسلام) پاشگەز ببنەوە بیان گێڕنەوە سەر بێ دینی و بێ باوەڕی و کاری خراپە.

هەروەك خوای گەرە دەفەرمێت: ﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُواْ ﴾ البقرة: ٢١٧.

٨. هەرگیز لێت ڕازی نابن تا شوێن ئاکارە نەدروستەکانیان نەکەویت؛

قورئان زۆر بەئاشکرا باس لە حەقیقەتێکی ڕەهامان بۆ دەکات دەربارەی سیفەتێکی دەرونی جولەکە، کە ئەویش هەرگیز لێت ڕازی نابن و بروات پێ ناکەن گەر سەد ساڵ نۆکەریان بۆ بکەیت، تا ئەو دەمەی شوێن دین و بیروباوەڕە چەوتەکانیان نەکەویت، هەروەك دەفەرمێت: ﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ﴾ البقرة: ١٢٠.

واتە: واتە هەرگیز جولەکە و گاورەکان لێت ڕازی نابن، تا بەتەواوی شوێن دین وبەرنامەیان نەکەویت.

سەرنج بدە ! ! خوای بەدیهێنەری مرۆڤەکان و بینەر وبیسەر بە پلانە نهێنییەکان و تەواوی دروستکراوەکانی خۆی، تۆی باوەڕدار ئاگادار دەکاتەوە لەو ڕاستیە شاردراوەیەی کە هەرگیسا وهەرگیس و تا تەواو بوونی دونیا (جولەکە) لێت رازی نابن و دانی خێرت پیادا ناهێنن گەر دەستبەرداری إسلام نەبیت و دینی خۆت نەگۆڕیت بە جولەکە یان گاور ! !

بەداخەوە زۆرێك لە نەوەی موسڵمانان بەگشتی ودەسەلآت دارانمان بەتایبەتی دین و باوەڕی خۆیان هەر زوو فرۆشت بە هەرزان و دەستبەرداری إسلام بوون و چوونە سەر دینی گاور و جولەکە و خزمەتکاری بەرژەوەندییەکانیانن.

سەرنجی بیروباوەڕ وئاکار و ڕەفتار و گوفتارو هەست و هەڵوێستی گەنجانمان بدەن ! ! سەرنجی بیرکردنەوەو جۆری جل لەبەر کردن و جوێن دانیان بە إسلام بدە ! ! سەرنجی بەناو ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و قەڵەم بەدەستان و ڕۆژنامەنووسان بدە ! !

سەرنجی بڵاو کراوەکان لە کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و تەواوی نوسراوەکانی ئەمڕۆ بدە ! !

سەرنجی میدیاکان بدە، لە بینراو بیستراو و کەناڵە ئاسمانییەکان و ناوخۆییەکان و چۆنیەتی وچەندێتی بابەت و بەرنامەکانیان ! !

ئەمانە بە گشتی (کەمێکیان نەبێت) خزمەت بە پرۆژە و بڕیار ومەبەست و ئامانجەکانی جولەکە دەکەن هەریەك لە وڵات و جێگەی خۆیاندا.کە بەداخەوە وڵاتی ئێمەش بێ بەش نیە لەم جۆرە خزمەتە بە جولەکە ! !

## ٩. خواردنی ماڵی خەڵکی بە ناحەق(آکل آموال الناس بالباطل):

حەرام خۆری وخواردنی ماڵی خەڵکی و گەلان و میللەتانی دونیا بە گشتی یەکێکی ترە لە سیفەتە زۆر دیارەکانی جولەکە لەجیهاندا و ئەمان پێشڕەوی دەکەن ئەویش لە ڕێگەی بانکی سووخۆری و داگیرکردنی وڵاتە نەوتییەکان و فراوان

کردنی سنوری جوگرافی خۆیان لەسەر حسابی وڵاتانی تر، کە بێ گومان ئەمریکا پێشەنگی ئەم کارەیان بۆ ئەنجامدەدات.

زۆربەی زۆری ئەو بانکە سووخۆریانەی لە جیهانی ڕۆژئاواو ئەمریکادان موڵکی جولەکەن و خوێنی گەلانی تری پێ دەمژن، بەڵام خوای گەورە لەم دوو ساڵەی پێشوودا بەڵای بۆ ناردن و زۆربەی زۆریان إفلاسیان کردوو، بەمەش گەورەترین زیان بەسەرمایەی ئەوروپا وئەمریکا و(إسرائیل) گەیشت.

خوای گەورە دەربارەی ئەم سیفەتەیان دەفەرمێت: ﴿ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَارِعُونَ فِي ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ المائدة: ٦٢.

**واتە:** زۆرێك لە جولەكەكانە دەبینی كە بەپەلە و هەڵپەن بۆ ئەنجامدانی خراپەو دەست درێژی كردنی ناهەق‌و خواردنی حەرام، دیارە كە چەند كارو كردەوەیان خراپ و نادروستە.

یان دەفەرمێت: ﴿ ۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ التوبة: ٣٤.

**واتە:** ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە چاك بزانن كە زۆربەی(حاخامەكانی جولوكە) و قەشەی گاورەكان ماڵ و سامانی خەڵكی بە ناهەق دە خۆن، بەرهەڵستی ئاین و بەرنامەی خوا دەكەن، جا ئەوانەی كە ئاڵتون وزیو كۆدەكەنەوە قایمی دەكەن وله ڕێبازی خودادا بەخشی ناكەن، مژدەی سزای پڕ ئازاریان بدەرێ.

یان دەفەرمێت: ﴿ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ النساء: ١٦١.

**واتە:** هەروەها بەهۆی (سود) خۆرییانەوە (هەندێ شتی تری حەڵاڵمان لێ حەرام) كردن، هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە كەماڵی خەڵكی بە ناهەق دەخۆن بێ گومان بۆ ئەوانەیان كە كافرن سزایەكی بە ئێشمان ئامادە كردووە.

١٠. خۆشویستنی بێ سنور بۆ ژیانی دونیا(حب الشدید للحیاة):

هیچ گەلێك نیە لە دونیادا هێندەی (جولەکە) حەزیان لە دونیا و ژیان و سەروەت و سامان بێت، هەر لەبەر ئەوەیە کە گەورەترین سەرمایەدارانی جیهان (جولەکەن).

قورئان دەفەرمێت: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾ البقرة: ٩٦.

واتە: بەردەوام (جولەکە) دەبینیت کە لە هەمو خەڵك زیاتر بە تەنگ دنیاو ژیانی دنیاوە دێن، بگرە لە موشریکەکان زیاتریش، ئاوات دەخوازن کە هەر یەکەیان هەزار ساڵ زیاتر تەمەنیان هەبوایە، وە نەبێ ئەو تەمەنە درێژە لە سزا ڕزگاریان بکات، خواش زۆر بینایە بەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن...

لەلای جولەکە ئەوە گرنگ نیە کە چۆن دەژین !! بەڵکو ئەوە گرنگە کە چەند دەژین.هەر ئەم سیفەتە دزێوە یان بوو کە زاتی ئەوەیان نەکرد لەسەردەمی موسادا بچنە ناو خاکی (فەلەسطین) ەوە و بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی کە خاکی پیرۆزیان لە ئەمان داگیر کرد بوو، هەر بۆیە رویان کردە موسا و وتیان:

﴿ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴾ المائدە(٢٤).

هەر لەبەر ئەم سیفەتەیانە کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سنوری ئۆردوگاکانیان بەرفراوان دەکەن و شورای پۆلاین دروست دەکەن بە چواردەوری ئەو زەویانەی کە داگیریان کردووە وقورئانیش شاهیدە لەسەر ئەم کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن

﴿ لَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴾ الحشر(١٤).

١١. بڵاوكردنەوەی بەدكاری و فەساد لەسەر زەوی دا (الافساد في الارض):

یەكێكی تر لە سیفەتە دزێوەكانیان بە درێژای مێژوو بریتی بووە لە بڵاوكردنەوەی فەساد و بەد ڕەوشتی و تێك شكاندنی ڕەوشت و ئاكاری جوان لە هەرجێگەیەكی ئەم سەر زەویەدا، جولەكە بە تەواوی مانا سەرجەم هەوڵەكانیان دەخەنە گەڕ لە پێناو بەد ڕەوشت كردنی كۆمەڵگاو لە پێ دەركردنی گەنجەكان بە تایبەتی.

لە یەكێك لە بڕگەكانی (بروتوكولات) دا هاتووە دەڵێت: ((یجب ان نعمل لتنهار الاخلاق في كل مكان فتسهل سیطرتنا، إن (فروید) منا، و سیظل العلاقات الجنیة في ضوء الشمس كي لا تبقي في نضر الشباب شئ مقدس، ویصبح همه الاكبر هو إرواء غرائزه الجنسیة و عندئذ تنهار أخلاقه)) [١].

واتە: پێویستە كار بكەین لەپێناو لەناو بردنی ڕەوشت لەهەموو جێگەیەك و شوێنێكدا بۆ ئەوەی بە ئاسانی زاڵ ببین، (فروید) لە ئێمەیە، بەردەوام پەیوەندیە جنسیەكان نمایش دەكەین وەك تیشكی خۆر بۆ ئەوەی شتێك نەمێنێتەوە لە بیری گەنجەكاندا بە ناوی پیرۆزیەوە، وە بۆئەو مەبەستەی كە گەنجەكان گەورەترین خەونیان بریتی بێت لە برەو دان و تێر كردنی غەریزە جنسیەكان، لەم كاتەدا كە ئەمەی ئەنجام دا ڕەوشتیشی دەڕوخێت.

بەڵێ جولەكە توانیان لە ڕێگەی بۆچوونەكانی فرۆیدەوە فەسادێكی ڕەوشتی گەورە بەرپا بكەن و دونیای ڕۆژ ئاوا لەسەرەتادا و پاشان وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی إسلامی غەرقی بێ ڕەوشتی و نەخۆشیە جنسییەكان بكەن و ئایدز و نەخۆشیە جنسە بێ چارەسەرەكانی تر بكەنە دیاری مرۆڤایەتی لە سەدەی (٢٠و٢١) دا.

---

١– أخلاقنا او الدمار. أبراهیم نعمة ص (١٥).

١٢. بێ ڕێزی و بێ ئەدەبی:

گەر گوزەرێكی خێرا بە ژیان و مێژووی ئەم گەلە دڵ بەبەرد بووە دا بكەین تێ دەگەین لەوە كە (جولەكە) خاوەنی هیچ بنەمایەكی ڕێزو ئەدەبی ئاخاوتن نین لەگەڵ بەرامبەرەكانیاندا بەگشتی و پێغەمبەرانی خودادا بەتایبەتی.

سەرەتا گەر سەرنجی ژیانیان بدەین لەگەڵ پێغەمبەری ڕزگار كەریان لە چنگی فیرعەون، (موسا) "علیه السلام" كە هەركات داخوازیەكیان ببوایە لە خوای گەورە، ڕوویان دەكردە موساوپێ یان دەوت (ادع لنا ربك)، واتە: داوا لە پەوەردگارت بكە، هەر وەك خوای گەورە بە تەنها خوای موسا بێت وپەروەردگاری ئەمان نەبێت !!؟.

پاشان لەسەردەمی پیغەمبەرداﷺ كاتێك سەلامیان لە خۆشەویست دەكرد نەیان ئەوت (السلام علیك) بەڵكو دەیان وت (السام علیك) یا ابا قاسم[1].

واتە: ئەی محمد مردنت لەسەر بێت، پێغەمبەریش لە وەڵام دا پێ ی دەفەرموون (وعلیكم) بەمانای ئەوەی لەسەر خۆتان بێت.

سەنج بدە! !ئەوان لە بەرامبەر پێغەمبەراندا هێندە بێ ئەدەب و بێ ڕێزبوون ئاخۆ دەبێت لەبەرامبەر خەڵكی سادەو گەلانی تردا چ بێ ڕیزی و بە كەم تەماشاكردنێك ئەنجام بدەن؟!

١٣. ئیرەی(الحسد):

سیفەتێكی تری جولەكەیە و حەسودی بە هەموو نیعمەتێكی خواوە دەبەن كە دەی بینن بەسەر خەڵكییەوە، تەنانەت حەسودی بە هیدایەت و وەحی خوداوە دەبەن كە دابەزاندۆتە سەر زەوی بۆ هیدایەت دانی بەندە سەرگەردانەكان[2]، قورئان دەفەرمێت: ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ﴾ البقرة: ١٠٩.

---

١- رواه البخاري و مسلم : كتاب السلام- باب النهي عن ابتداء اهل الكتاب باالسلام و رقم الحدث (٢١٦٥) ج (٤) ص(١٧٠٧).

٢- الموجز في الاديان و المذاهب المعاصرة. ص(٣٢).

واتە: زۆربەك لە خاوەن کتێبەکان ئاوات ئەخوازن لەبەر حەسودی و ناپاکی خۆیان گەر بۆیان بکرێت بتان گێڕنەوە بۆ ڕیزی بێ باوەڕان، ئەمەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستی یان بەتەواوی بۆ ڕوون بۆتەوە.

یان دەفەرمێت: ﴿ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۖ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴾ النساء: ٥٤.

واتە: یان هەر ئەوەی کە حەسادەت و بەغیلی دەبەن بە خەڵکی لەسەر ئەوەی کە خوا لە فەزڵ و بەخشیشی خۆی بەشی داون.

## ١٤. دروستکردنی فیتنەو بەرپاکردنی جەنگی خوێناوی و شەڕی گانفی لەسەر زەویدا:

یەکێکی ترە لە سیفەتە گەندەڵەکانیان، هەر یەك لە جەنگە خوێناویەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی و شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی(١٩١٧) لە ڕوسیا و لەناوبردنی دەسەڵاتی قەیسەر و سەرجەمی ئەو جەنگە ناوخۆییانەی کە لە وڵاتان دەکرێت ئەنجام دەدرێت دەستی پیسی جولەکەی لە پشتەوە بووەو لە پشتەوەیە، چونکە یەك ڕیزی و نەبوونی شەڕ لەسەر زەوی ولە نێو وڵات و بیروباوەڕە جیاوازەکاندا هەرگیس لە بەرژەوەندی جولەکە نیە، پاشان هەر کات هەستیان بە تەبای و برایەتی کردبێ لە نێوان دوو کەس یان دوو حیزب یان دوو دەوڵەتدا خێرا ودەست بەجێ بە پیلانی دۆزەخیانەی خۆیان شەر وفیتنەیان لە نێوان دا دروست کردوون و جەنگی درێژ خایەن و خوێناویان بەرپا کردووە.

قورئان زۆر بە ئاشکرا باس لەم سیفەتەیان دەکات و دەفەرمێت:

﴿ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ المائدة: ٦٤.

واتە: ... هەر کاتێك بیانەوێت جەنگ بەرپا بکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن خوا دەی کوژێنێتەوە و نایەڵێت تەشەنە بکات، ئەوانە زۆر بەپەلە و بە گەرمی

هەوڵی بڵاوبونەوەی فەساد وتاوان دەدەن لە زەویدا، بێ گومان خوا تاوان وتاوان بارانی خۆشناوێت.

## ١٥. حەزکردن لەوەی کە گوێ لە درۆ وقسەی پڕوپوچ و بێ ناوەڕۆك بگرن:

قورئان دەفەرمێت: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ﴾ المائدة: ٤١.

واتە: ئەوانەی کە جولەکەن گوێ بۆ درۆ وقسەی بێ بنەما دەگرن و، پاشان گوێ بیستی قسەی کەسانی تریش دەبن (کە خوانەناس و بێباوەڕن).

## ١٦. بەکەم سەیرکردنی خەڵکی و بە گوێ درێژ زانینیان:

ئەم سیفەتەیان لەوەوە سەچاوەی گرتووە کە جولەکە خۆیان بە گەلی تایبەت و هەڵبژاردەی خوا دەزانن وە غەیری خۆیان بە گوێدرێژ تەماشا دەکەن.

لەتەوراتی دەست کاریی کراوی خۆیانداو لە (سفر التثنية) دا هاتوە دەڵێت: ((لإنك شعب مقدس للرب إلهك، وقد أخترتك الرب لكي تكون شعبا خالصا فوق الجميع الشعوب الذين على وجه الارض)) [١].

واتە: ئەی جولەکە لەبەر ئەوەی ئێوە گەلی پیرۆزی پەروەردگارن هەر بۆیە هەڵی بژاردوون تاوەکو گەلی تایبەتی ئەوبن و لەسەر و هەموو گەلانی ترەوەبن لەسەر ڕووی زەویدا.

لە کتێبی دانراوی دەستی حاخاماکاندا (تەلمود) دا هەتووە ودەڵێت: ((الأمميون هم الحمير الذين خلقهم الله ليركبهم شعب الله المختار)) [٢].

واتە: سەرجەم گەلان –جگە لە جولەکە– گوێدرێژن و خوا دروستی کردوون تا وەکو گەلی هەڵبژاردەی خوا(کە جولەکە) یە سواریان بن!!

---

١– اليهود و اليهودية و الصهيونية : د. عبدالوهاب المسيري.

٢– رؤية اسلامية لأحوال عالم المعاصر : محمد قطب (٣٢).

بەڵێ ئەمە تێڕوانینی جولەکەیە بۆ غەیری جولەکە و تەواوی مرۆڤەکانی سەر زەوی (إن شاء الله) دواتر بە ڕوونتر قسەی لەسەر دەکەین.

**١٧. کوشتن و لەناو بردن و تیرۆرکردنی پێغەمبەران و پیاو چاکان:**

جولەکە دەستێکی باڵایان هەبوە لە کوشتنی پێغەمبەران و پیاو چاکاندا، چ لە کۆن و چ لە نوێ دا، سەرەتای هەوڵیان بریتی بوو لە دارشتنی پیلان لە دژی پێغەمبەر (عیسا) بەڵام خوای گەورە بەدەسەڵاتی بێ سنوری خۆی (عیسا) ی لە دەستی چەپەڵ ودزێویان ڕزگار کردوو بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و کەسێکی تریان لەبری عیسا لە خاچ دا، کە ڕووخساری زۆر لە عیسا دەچوو(علیه السلام) قورئان دەفەرمێت: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ...﴾ النساء: ١٥٧

پاشان شەهید کردن و تیرۆرکردنی (یەحیا) پێغەمبەر، دواتر لەسەردەمی پێغەمبەر و لە شاری مەدینەدا، دەیان جار هەوڵی تیرۆر کردنی پێغەمبەریان دا "علیه السلام" تا دوا جار ئافرەتێکی جولەکە دەعوەتی پێغەمبەر و هاوەڵانی کردوو گۆشتێکی خستە بەردەم کە زەهراوی کرد بوو، خوای گەورە پێغەمبەری لەم پیلانە ئاگادار کردەوەو پێغەمبەر گۆشتەکەی نەخوارد، بەڵام یەکێك لە هاوەڵان کە پارووەکەی قوت دابوو شەهید بوو، بەڵێ دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ جولەکە هەوڵەکانیان زیاتر چڕ کردەوە لەسەر دژایەتی کردن و لەناو بردنی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر، هەر بۆیە بەردەوام لە هەوڵی دروستکردنی دژایەتی و لەتوپەت کردنی یەك ڕیزی موسڵمانان دا نەخشەیان دادەڕشت سەرەتا پیلانیان دارشت بۆ شەهید کردنی ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خەطاب) ئەویش لەلایەن چوار کەسەوە بوو کە بریتی بوون لە:

أ- هورموزان: فارسێکی مەجوسی بوو، پادشای کۆنی ئەهواز بوو، یەکێك بوو لەسەر کردەکە ئازاکانی فارس لە زۆرێك لە جەنگە گەورەکاندا بەشداری کرد بوو، لە جەنگی ئەهوازدا شکان و دەستگیر کرا بەخاوخێزانەوە هێنرایە مەدینەو بە ڕووکەش موسڵمان بوو لە مەدینە جێگیر بوو...

ب- کەعبی ئەحبار: یەکێك بوو لە زاناکانی جولەکە و خەڵکی یەمەن بوو، زانا بوو لە تەورات، لەسەردەمی (عمر) دا بە ڕووکەش موسڵمان بوو.

ج- ئەبو لوئلوئەی فەیروزی: بەندەی (موغیرەی کوڕی شوعبە) بوو لە جەنگی نەهاوەندا دەستی کەوت فارسێکی مەجوسی بوو، ئاسنگەرێکی دەست ڕەنگین بوو.

د- جوفینە: بەندەیەکی گاوری ڕوم بوو، کەوتە دەست یەکێك لە موسڵمانان.

بەڵێ ئەم چوار کەسە بەنهێنی کۆبونەوە لەسەر ئەوەی کە ئیمامی عومەر تیرۆر بکەن (عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی) دەڵێت: ((نوێژی بەیانی بوو، لە ترسی هەیبەتی (عومەر) نەم دەوێرا لە ڕیزی یەکەمی پشتی (عومەر) ەوە نوێژ بکەم دەچوومە ڕیزی دووەم ڕێك لە پشتی (عومەر) ەوە ڕادەوەستام و تەنها (إبن عباس) لە پێشمەوە بوو، بەڵێ نوێژی بەیانی دەستی پێکرد.(ئەبولوئلوئە) لە ناوەڕاستی ڕیزەکانەوە هاتوو(سێ) خەنجەری بە توندی دا لە (عومەر) یەکێکیان لە شانی و دووانیش لە ناوك و سکی، ئەوانەی سکی جێ ی خراپیان گرت بوو(عومەر) وتی: ئەوسە کە کوشتمی!!

دوای ئەم لێ دانە کەوتە سەر زەوی و ئەو کات لە سورەتی ناو نوێژەکەدا گەیشتبووە ﴿ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴾ الأحزاب: ٣٨.

دوای ئەوەی کە (ئەبولوئلوئە) ئەم کارەی ئەنجامداو ویستی ڕابکات، بەڕاست و چەپ دا بە خەنجەرەکەی دەستی (سیانزە) کەسی تریشی بریندار کردوو پاشان(٧) یان شەهید بوون(عبدالرحمن کوڕی عەوف) زیرەکانە خستی بە زەویداو ناچار خۆی خۆی کوشت. بەڵێ بەم جۆرە پیلانیان بۆ (عمر) داناو لە بەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەمەی ساڵی(٢٣) ی کۆچی دا ئەم ڕووداوە ڕووی دا، سێ ڕۆژ دوای ئەم ڕووداوە ژیا و لە شەوی یەکشەمە کۆچی دوای کرد لە تەمەنی(٦٣) ساڵی دا، هەروەك تەمەنی پێغەمبەر و ئەبوبکری صدیق[١].

---

١- کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا: حسن محمود حمه کریم، لاپەرە ٢٨١ تا ٢٨٣.

پاشان پلانیان بۆ شەهید کردنی (عثمانی کوڕی عەفان و عەلی کوڕی ئەبوطالب) یش دارشت و شەهیدیان کردن.

بەڵێ ئەمە ئاکاری جولەکەیە لە هەموو سەردەمێك دا و هەرکات هەست کەن بە بوونی کەسانی باش و کاری گەر لەسەر خەڵکی دەست بەجێ پیلانی بۆ دادەڕێژن و تیرۆری دەکەن، (شێخ أحمد یاسین) بانگ خواز و تێکۆشەری جیهادی ئیسلامی فەلەسطین کە تەنها سەری ئیشی دەکردو تەواوی جەستەی توشی شەلەل هات بوو، لە دوای گەڕانەوەی لە نوێژی بەیانی بەدەستی جولەکە دڕندەکان لە تاریکیدا شەهیدیان کرد، چونکە هەڕەشە بوو بۆ سەر قەوارەی زایۆنی لە فەلەسطینی داگیرکراودا، قورئان دەفەرمێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ آل عمران: ٢١.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان نیە بە ئایەتەکانی خوا، وە پێغەمبەران بە ناهەق دەکوژن، وە ئەوانەش دەکوژن لە خەڵکی کە فەرمان بە دادپەروەری دەدەن، مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان پێ بدەن...

### ١٨. برەودان بە بانگەشەی درۆ و هەواڵی بێ ناوەڕوك و بێ سەرو بەرە:

جولەکەو گاورەکان لە خەیاڵدا دەژین ئەویش بەومانایەی کە بانگەشەی قسەو هەواڵی وا دەکەن هیچ بنەما و ناوەڕۆکێکی ڕاست ودروستی نیە. قورئان دەفەرمێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ البقرە(٨٠).

واتە: جولەکەکان دەیان وت: هەرچەند گوناهـ بار بین، تەنها چەند ڕۆژێکی کەم لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنینەوە! تۆش ئەی (محمد) پێیان بڵێ: باشە ئێوە پەیمانتان لە خوا وەرگرتوە تا خوای گەورە پەیمانەکەیتان بۆ بەرێتە سەر یان هەر دەتانەوێت شتێك بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بنەمایەکی نیە و نازانن چی دەڵێن.

# بەندی دووەم

## کتێبە پیرۆزەکانی جولەکە

پێم باش بوو لە بەندی دووەمی ئەم کتێبەدا کەمێك بوەستین لەسەر ئەو کتێبو بەرنامانەی کە لای (جولەکە) بەدرێژای مێژوو پیرۆز بوون و سەرچاوەی بیرو باوەڕ و تەشریع و یاساو هەڵوێست و هەنگاوەکانیان بووە چ لە کۆن و چ لە ئێستاو چ لە داهاتوشدا، کە ئەوانیش بریتین لەمانە:

**١) التوراة**

پێشەکی: تەورات بریتی بوو لەوپەرتووکە ئاسمانیەی کە لەسەرەتادا خوای گەورە بەخشی بە (موسا) "علیه السلام" لەکێوی (طور).

(تەورات) وشەیەکی (عبریە) و بە مانای (التعلیم یان الشریعة) دێت[1].

تەورات بە (العهد القدیم)یش (old testament) ناوی هاتوەو، ئەم زاراوەیە مەسیحیەکان بەکاریان دەهێناو بەم ناو بردنە (إنجیل) یان پێ جیا کردەوە لە تەورات، کە بە إنجیلیان دەوت (العهد الجدید)[2].

بێ گومان (تەورات) (العهد القدیم) دەکرێت بە سێ بەشی سەرەکییەوە.

**بەشی یەکەم : السفار الخمسه الاولی، یان تەورات کە ئەویش لە (٥) سەفەر پێك هاتووە:**

| | |
|---|---|
| أ- سفر التکوین | Genesis |
| ب- سفر الخروج | Exodus |
| ج- سفر اللاویین | Leviticus |
| و- سفر العدد | Numbers |
| هـ- سفر التثنیة | duteronoms |

---

١- ادیان و فرق : د. أمین القضاة ص ٣٨

٢- العرب و الیهود في التأریخ. د. أحمد سوسة ص(٣٣٠).

بەشی دووەم: الانبیاء، واتە پێغەمبەران و لە (٨) سەفەر پێکهاتووە کە ئەمانەن(یشوع- القضاة-صموئیل والملوك(کە پێغەمبەرە سەرەتاکانە) و إشعیاو و إرمیا(کە بریتین لە پێغەمبەرانی دواتر) و یوئیل و عاموس و عویدیا و یونان میخا و ناحوم و حبقوم و صفنیا و حجای و زکریا و ملاضي...)[1].

بەشی سێ هەم: (الکتب) کە پێك هاتووە لە چیرۆکی دینی و حیکمەت.

کۆی گشتی (سەفەر) ەکان لە (تەورات) (العهد القدیم) بریتیە لە (٣٩) سەفەر و تەوراتی جولەکەکان بە یەکەم کتێب و مەرجەعیەتی خۆیانی دەزانن.

**ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر تەورات و بەشەکانی.**

- **(الاسفار الخمسە) لە (عهدالقدیم) کە لەلای جولەکەکان بە تەورات ناو دەبرێت (٥) سەفەرن وبریتین لەمانە:**

١. (سفرالتکوین)، ئەمە یەکەم بەشی تەوراتە وپێکهاتووە لە (٥٠) إصحاح کە گوزارشت لە دروست بوونی گەردوون و چیرۆکی (ئادەم و حەواو نوح و طوفان و نەوەکانی نوح لە سام و حام و یافث و دوای لافاوەکە دەکات)[2].

هەروەها باس لە پێغەمبەرانی دوای نوح لە إبراهیم و نەوەکانی لە إسحاق و یعقوب و (١٢) کوڕەکەی یعقوب و چیرۆکی (یوسف) و دەنگوباسیان لە (مصر) و دەیان باسی تر دەکاتو کۆتای دێت بە وەفاتی یعقوب.

٢.سفر الخروج: دووەم بەشی تەوراتە لە(٤٠) إصحاح پێکهاتووە.ئەم بەشە بەدوورو درێژی باس لە حاڵ و گوزەرانی نەوەکانی إسرائیل دەکات دوای وەفاتی یوسف لە مصر، پاشان باس لە زیاد بوون و باری کۆمەڵایەتی و زەبروزەنگی فیرعەون بەسەریانەوە دەکات، لەگەڵ پەیدا بوونی (موسا) و گەورە بوونی لە ماڵی فیرعەن و سەدەمی پێغەمبەرایەتیو دەرچوونی لە میصر و ڕزگارکردنی بەنی إسرائیلەکان و ڕۆیشتنیان بۆ بیابانی سینا و بەخشینی تەورات بە موسا و

---

١- ادیان و فرق : د. أمین القضاة ص ٣٩.

٢ - دراسات في الیهودیة : عبدالله حسن علي برکات ، ص ١٥

قسەکردنی لەگەڵ خوای گەورەدا لە کێوی طور و پاشان مانەوەیان لەو بیابانەدا بۆ ماوەی (چل) ساڵ.

٣.(سفر اللاوين): ئەم بەشەیان لە(٢٧) إصحاح پێکهاتووە و بەناوی (لاوی) کوری (یعقوب) ناونراوە کە یەکێکە لە براکانی (یوسف) و باپیرە گەورەی (هارون و موسا) یە "عليهم السلام" ئەم بەشە باس لە هەلگران و پەیرەوانی تەورات دەکات لەگەڵ ئەوانەی کە خزمەتی تەورات دەکەن، دواتر باس لە بەشەکانی سەربرین و قوربانی دەکات، پاشان باس لە جۆرەکانی پیسی(النجاسە) و بوارەکانی پەیوەست بە ئافرەت لە (حەیض و نفاس و چۆنیەتی پاك بوونەوەی لەو حاڵەتەی کە تێیدا بووە دەکات).

٤.سفر العدد: بەشی زۆری ئەم (سفر) ە باس لە سەرژمێری هۆزەکانی بەنی إسرائیل دەکات لەگەڵ باس کردنی پارەو سەروەت وسامان و بواری سەربازی و هەندی بابەتی ترو لە (٣٦) (إصحاح) پێکهاتووە.

٥.سفر التثنية: ئەم بەشە پێکهاتووە لەو زانست و زانیاریانەی کە خوای گەورە بەخشی بە موسا پاشان فەرمانی پێکرد کە بە گەلی بەنی إسرائیلی رابگەیەنێت.

کە ئەمانەش پێك دێن لە عبادات و معامەلات و بوارەکانی ئابووری و سیاسی و سزا و بابەتەکانی تر.

(سفر التثنية) کۆتای دێت بە وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن (یوشع ی کوڕی نون) لەدوای (موسا و هارون)، ئەم بەشە لە (٣٤) (إصحاح) پێکهاتووە.

- **ڕوون کردنەوەی بەشی دووەم لە (تەورات) (عهد القديم) کە ئەویش پێ ی دەوترێت (کتب الانبياء) کە بە (عبری) ناوی بە (نبييم) هاتووە و مانای پێغەمبەران دەگەیەنێت.**

لەم بەشەیاندا پێغەمبەرانی کردووە بە دوو بەشەوە

أ- بەشی یەکەمیان باس لە پێغەمبەرانی سەرەتا دەکات (الانبياء الاولى)،

بەشی یەکەم لە (٨) سەفەر پێکهاتووە:

١. سفر يشوع: (٢٤) إصحاحە و باس لە دابەش کردنی زەوی وزار دەکات بە دوورو درێژی.

٢. سفر القضاة: لە(٢١) إصحاح پێکهاتووە و باس لەسەردەمی فرمانڕەوای بەنی إسرائيل دەکات لە (کەنعان) دا.

٣. سفر(راعوث) : لە (٤) إصحاح پێکهاتووە.

٤– ٥. سفر صموئيل الاول و الثاني.

٦–٧. سفر الملوك: ئەم بەشەیان لە (٤٧) إصحاح پێکهاتووە.

٨. سفر أخبار الايام الاول و الثاني: ئەم بەشەیان لە (٦٥) إصحاح پێکهاتووە.

ب– بەشی دووەمیان باس لە پێغەمبەرە دواینیەکان دەکات (الانبياء المتأخرين) لە (١٤) سەفەر پێکهاتووە کە بریتین لەمانە (أشعيا– ارميا– حزقيال– يوئيل– عاموس– عوبديا– يونان– ميخا– ناحوم–حبقوق–حفنيا–حجی–زكريا–ملاخي)[1].

- **ڕوون کردنەوەی بەشی سێ هەمی تەورات بەناوی (الكتب) یان (الكتابات و الشعاير) و لە (١٢) سەفەر پێکهاتووە کە بریتین لە:**

١. **مزاميرداود:** لە (١٥٠) إصحاح پێکاتووەو باس لە داود پێغەمبەر دەکات

٢. **سفری أيوب:** لە (٤٢) إصحاح پێکهاتووە باس لە پێغەمبەر(ايوب) دەکات.

٣. **امثال سليمان:** لە (٣١) إصحاح پێکهاتووە، باس لە دەسەلات وفەرمان ڕەوایی (سليمان) پێغەمبەر دەکات.

٤. **نشيد الانشاد:** لە (٨) إصحاح پێکهاتووە لە کۆمەڵە شعرێکی (غەزەل) ئامێز و ئاشکرا کە باس لە چیرۆکی دوو شوان دەکات، یەکیان (نێر ویەکیان مێ) کە چۆن دڵ ودڵ خوازی لەگەڵ یەکدا دەکەن بەشێوەیەکی ئاشکراو بە زمانی سەرجێگە[2].

---

١– العرب و اليهودية في التأريخ : د. أحمد سوسة ، ص (٣٣٢).

٢– دراسات في اليهودية : عبدالله حسن علي بركات ، ص(٣٣)

٥.سفر إستير ٨.تحميا ١١.اخبار الايام

٦.عزرا ٩.دانيال ١٢.سفر الجامعة

٧.روث ١٠.المراثي

بەشێوەیەکی ڕوون و زۆر ئاسانتر بە نەخشە تەورات بەم جۆرەیە:




کۆکردنەوەی تەورات (العهد القديم) سەردەمانێکی زۆری خایاند، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (١١) ی پێش زاین[١].

---

١- اليهود عقيدة و شريعة : د. أسعد السمحراني : ص(٢١).

تەورات (العهد القديم) بۆ یەکەم جار لە سالی (١٤٤٨) لە إیطالیا چاپکرا کۆمەڵێك لە جولەکەکان باوەڕیان بە غەیری ئەو (٥) سەفەرەی تەورات نیە، ئەمانە بە (السامریة) ناسراون نەسەبیان دەگەڕێتەوە بۆ (السامرة) کە لە (نابلس) جێگیر بوون، ئەم کۆمەڵە نسخەیەکی کۆنی تەوراتیان لە لایە کە لەو (٥) سەفەرە پێکهاتووە، ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن جولەکەوە دژایەتی تەواو دەکرێن [١].

## دەستکاری کردنی تەورات (تحریف التوراة)

هەروەك پێشتر لە سیفەتەکانی جولەکەدا باسمان کرد کە یەکێك لە سیفەتە بەد و خراپەکانیان برێتی بووە لە دەستکاری کردنی تەورات و شێواندنی(دکتور احمد سوسه) دەڵێت: ((إین فیما مر دلیل قاطع علی أن التوراة المتداولة في الوقت الحاضر قد دونت بعد النبي موسي بمدة طویلة فحرفت و اضیف إلیها اتفق مع رغبات و نزعات و میول الکتبة مارة بعد ادوار من الروایة الشفویة و الانتخاب و الحذف والاضافة إلي دور التدوین) [٢].

واتە: بەڵگەی تەواو لەسەر ئەوەیە کە ئەو تەوراتەی کە لە ئێستادا هەیە و دەستاو دەست دەکات، لەدوای پێغەمبەر موساوە کۆکراوەتەوە، بە ماوەیەکی دوورو درێژ، دەستکاری کراو شێوێنرا وبۆی زیاد کرا لەوەی کە کۆکەرەوانی حەزو ئارەزوویان لێ بوو، پاشان ئەوەی لەگەڵ مەیل و ئارەزوویان لێ ی نەبوو لێ ی لابرا لەکاتی کۆکردنەوەیدا.

بەڵێ قورئانی پیرۆز لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکات و دەفەرمێت:﴿ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا

---

١- العرب و الیهود في التأریخ : د. احمد سوسة ، ص (٢٣٥).

٢- هەمان سەرچاوە: ص (٢٥٥)

وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ النساء(٤٦).

يان دەفەرمێت: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴾ البقرة: ٧٩ .

زانایەکی جولەکە بەناوی (سیلفر) دان دەنێت بەوەی کە (تەورات) دەستکاری کراوەو ئەو تەوراتەی کە ئێستا هەیە هەرگیز نمونەی ئەو تەوراتە ئەصلیە نیە کە درایە موسا لە هیچ ڕوویەکەوە [١]

(محمد محی الدین حمادة) دەڵێت: ((إنني لا ازكي نفسي إذا قلت: لدي وبكل تواضع آلاف آلادلة بل عشرات الالاف منها علي ان التوراة اليوم بعيدة كل البعد عن توراة موسى) ) [٢].

واتە: من خۆم هەڵناکێشم ئەگەر بڵێم: بەوپەڕی خۆ بەکەم زانینەوە هەزار بەڵگە بەڵکو دەیان هەزار بەڵگەم لەبەر دەستدایە لەسەر ئەوەی کە ئەو تەوراتەی ئەمڕۆ هەیە زۆر دورە لەو تەوراتەی (موسا).

## خوێندنەوەی تەورات Reading of the Law

ئەوەی کە مابێت لەسەر تەورات باسی بکەین بریتیە لە خوێندنەوەی تەورات (قراءة التوراة) لەلایەن جولەکەکانەوە، ئەویش بەم شێوەیە.

خوێندنەوەی تەورات تەرجەمەی (قرینت هتور) ی عبریە و بریتیە لە خوێندنەوەی (٥) ئەسفارەکەی موسا لەپەرستگادا بەسەر نوێژ خوێنانی جولەکەدا.

---

١- الاسلام و زيف الاقلام : محمد محى الدين حمادة : ص (٢٠٥).

٢- الاسلام و زيف الاقلام : محمد محى الدين حمادة : ص (٢٠٦).

تەورات لە پێش نوێژی ڕۆژی شەممان، لەگەڵ جەژنەکاندا، وەلە جەژنی مانگی تازەی جولەکەدا، وە لە ڕۆژانی ڕۆژو گرتن داو ڕۆژانی دووشەممان و پێنج شەممان دەخوێنرێت،

دوای خوێندنی تەورات دوعا دەکرێت، پاشان دوو جۆر خوێندنی تەورات هەیە، یەکەمیان (بابلیە) کە ئەمەیان لە یەك ساڵدا تەواو دەکرێت و خەتم دەکرێت دووەمیان (فەلەسطینیە) و سێ ساڵ دەخایەنێت[1].

## ٢) التلمود Talmud

وشەی تەلمود وەرگیراوە لە وشەی عبری (لامد) بەواتای توێژینەوە و فێربوون (الدراسة والتعليم)[2]. تەلمود بە دووەم سەرچاوەی یاساو تەشریعی جولەکە هەژمار دەکرێت لەدوای تەورات، کە بێگومان (تەلمود) بریتیە لە کۆمەڵێك یاسای جولەکە، کە لە ئەحبارەکانیانەوە گوێزراوەتەوە و ڕاڤە و پێناسەی تەوراتیان پێ کردووە و، هەرچەندە توێژەرەوانی ئەم بوارە ڕاو بۆچونی زۆریان هەیە دەربارەی ڕاڤەو پێناسە کردنی (تەلمود) کە بریتین لەمانە.

- هەندێك دەڵێت ((كتاب تعليم ديانة و آداب اليهود))[3].

  واتە: پەرتوکی فێرکردنی دینی و ئەدەبی جولەکەیە.

- هەندێکی تر دەڵێن: ((إنه تعبير عن النضرة اليهودية الشاملة الي العالم في امتدادها عبر الف سنة من الزمن)).

واتە: (تەلمود) تەعبیرکردنە لەو بۆچونە فراوانەی جولەکە بۆ جیهان بە درێژای هەزاران ساڵ.

---

١- اليهودية و الصهيونية : د. عبدالوهاب المسيري.

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- الاسلام و اليهودية : د. عماد علي عبدالسميع حسين : ص(٥٩٥).

● یان دەڵێن: ((هو التوراة الشفوية، وهو مجموعة قواعد وصايا و شرائع دينية و أدبية و مدنية، و شروح و تعاليم و روايات كانت تتناقل و تدرس شفهيا من حين إلي آخر)) [1].

واتە: تەلمود بریتیە لە تەورات بە وتن (شفوي)، پێکهاتووە لە کۆمەڵێك یاسا وەسیەت و ڕێسا و ئادابی شارستانی دینی، وە پێناسە و ڕێ نمای و سەرگوزشتە کە گوزاراوەتەوە و دراسە کراوە بە شێوەی وتن لە یەکێکەوە بۆ ئەوی تر.

● هەندێکی تر پێناسەیان کردووە دەڵێن: ((بریتیە لەو هەوڵ ومانندوو بوونەی کە جولەکە سەرفیان کردووە بۆ مەبەستی ڕاڤەکردنی (عهد القديم) بەو مەبەستەی کە بگونجێت لەگەڵ حاڵ و گوزەرانی جولەکە، ئەویش بەو مەبەستەی جولەکە ئەو دەستەو کۆمەڵەن کە بەسەر زەویدا بڵاو بوونەتەوە نەك گەلێکی جێگیرن ! !)).

کەواتە بە شێوەیەکی گشتی (تەلمود) بریتیە لە چەند تەعلیم و یاسا و دەستورێکی نهێنی، کە لەلایان گەورەو حاخامەکانی جولەکەوە دانراوە و داڕێژراوە و پێویستە لەسەر هەموو جولەکەیەك کە پەیوەست بێت پێوەی و یاساکانی بەوپەری دڵسوزییەوە جێ بە جێ بکات، تەلمود لەلای جولەکە لە تەورات زۆر گەورەتر وڕێزدار ترە و سەچاوەی فکرو هەڵوێست و هەنگاوەکانیانە لە تەواوی بوارەکانی ژیاندا.

تەلمود دەکرێت بە دوو بەشی سەرەکیەوە.

آ-(المشناه) (المتن) ئەمەیان بە ئەسڵ وبنەما ناو دەبرێت.

ب-(الجمارا) بەمانای ڕاڤەو شەرحی (المشناه) دێت.

---

١- الاسفار المقدسة قبل الاسلام : د. صابر طعيمة : ص(٤١).

## أ- ڕوونكردنەوەی بەشی یەكەمی تەلمود (المشناه)

(المشناه) یەكەم لانحەی یاسایيە كە جولەكەكان دایان ناوە دوای تەورات، (یهوذا هاناسي) لە نێوان ساڵەكانی (١٩٠-٢٠٠) ی زاینی كۆی كردەوە ئەویش دوای كاول كردنی (هیكل) لەسەر دەستی (تیطس) ی ڕۆمانی[١]. جولەكەكان باوەڕیان وایە كە (المشناه) دابەزیوەتە سەر موسا، ئەمەش لە (سفر الخروج) دا و بەو دەستەواژەیە هاتووە كە خوای گەورە وتی بە موسا: ((ئەی موسا سەر بكەوە بەسەر ئەو چیایەدا و من لێرەم، تابلۆیەكی بەردت دەدەمی كە پێكهاتووە لە یاساكانی شەریعەت و ئامۆژگاری كە نوسیومە بۆ ڕێ پیشاندانتان)) [٢].

((المشناه)) بریتییە لە كۆمەڵێك داب و نەریتی جولەكە لە تەواوی بوارە جۆراو جۆرەكانی ژیاندا، لەگەڵ هەندێ دەستە واژەی تەورات[٣]. ((المشناه)) وشەیەكی (عبریە) و بە مانای (المعرفة) واتە زانین دێت، یان یاسای دووەم[٤]، كە لە شەش باس پێك هاتووە كە ئەمانەن.

١. البذور-زیرائیم-پەیوەست بە بوارەكانی كشتوكاڵ و لە (١١) نامە پێكهاتووە.

٢. الایام المقررة-مۆیید-پەیوەستە بە یاساكانی جەژن وڕۆژ و گرتنەوە و لە (١٢) نامە پێكهاتووە.

٣. المرأة-نشیم-پەیوەستە بەیاساكانی ژن هێنان و شوكردن و طەلاق و نەزرو یاساكانیەوە و لە (٧) نامە پێكهاتووە.

٤. الاضرار-نزیكین-پەیوەستە بە یاساكانی شارستانیو تاوانەوە و لە (١٠) نامە پێكهاتووە.

---

١- التلمود تأريخة و تعاليمة ص (١٢- ١٣) (ظفر الأسلام خان).

٢- سفر الخروج الأصحاح: ٢٤

٣- العرب و اليهود في التأريخ : د. أحمد سوسة ،ص(٣٦٢)

٤- الاسلام و اليهودية : د. عماد علي عبدالسميع حسين : ص(٥٩٧)

٥. الاشياء المقدسة–كودا شيم–پەیوەستەبە یاساکانی نوێژکردن و لە (١١) نامە پێکهاتووە.

٦. الطهارة(توهاروت) پەیوەستە بەیاساکانی پاك و خاوێنی و لە (١٢) نامە پێکهاتووە[١].

ب– ڕوونکردنەوەی بەشی دووەمی (تەلمود) (جمارا)

"جمارا" وشەیەکی عبریە و بەمانای ڕاڤە وشەرح دێت[٢].ئەمیش بریتیە لە شەرح و پێناسەی بەشی یەکەمی تەلمود (المشناه) [٣].کەواتە دەتوانین بڵێین کە (المشناه) ئەصلە بنەمایە و (جمارا) شەرحی ئەصل و بنەماکانی (المشناه) یە.

(الجمارا) ش دەکرێت بە دوو بەشەوە کە ئەوانیش بریتین لە:

١.جمارا اورشليم يان (فەلەسطيني).

((بريتيە لەو زنجيرە وتووێژەی کە حاخامەکانی فەلەسطين بەگشتی وزاناکانی قوتابخانەی (طبرية) کرديان دەربارەی بنەماکانی (المشناه) کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵەکانی (٢٢٠–٣٤٠) ی زايينی (جمارای فەلەسطينی) بە زمانی (ئارامی) کە زمانی دانيشتوانی (فەلەسطين) نوسرايەوە لە (٧٥٠٠٠٠) وشە پێکهاتبوو، ١٥٪ ی چيرۆك و بەسەرهاتی گەلی جولەکە بوو وە لە بنەڕەتدا هيچ بنەمايەکی ڕاستيان نەبوو چونکە جولەکە خۆيان دروستيان کرد بوو )) [٤].

٢. جماراي بابلي

مێژووی (جمارای بابل) دەگەڕێتەوە بۆ زەوی (بابل) لە (عێراق) لە ساڵی(٥٠٠) ی زايينی تەواوبوون لە کۆکردنەوە ی[٥]. کە ئەميش (٢.٥٠٠.٠٠٠) هەزارووشە پێکهاتبوو ٣٠٪ باس لە چيرۆك و بەسەرهاتەکان دەکات، ٧٠٪ باس لە ياسا دەکات.

---

١– دراسات في اليهودية : عبداللة حسن علي بركات ، ص(٣٦).

٢– الاسلام و اليهودية : د. عماد علي عبدالسميع حسين : ص(٥٩٧)

٣– اليهود عقيدة و شريعة : د. أسعد السمحراني : ص(٢٩).

٤– اديان و فرق : د. أمين القضاة ص(٤٧).

٥– هەمان سەرچاوە ص (٤٧).

قەبارەی (جمارەی بابلی) گەورەترە لە (جمارای فەلەسطینی) بە ئەندازەی (٤) ئەوەندە و ژمارەی لاپەڕەکانی پێکهاتووە لە (٥٨٩٤) لاپەڕەو لە (١٢) بەش دروست بووە[1].

## نەخشەی تەلمودو بەشەکانی




---

١- العرب واليهود في التاريخ. احمد سوسة. ص (٢٦٣)

## گرنگی و گەورەیی (تەلمود) لای جولەکە

جولەکەکان لە سەرەتادا تەلمودیان لە دوای تەوراتەوە سەیر دەکرد لەقەدرو ڕیزدا، بەلام دواتر ئەم هاوکێشەیە لەلای جولەکە پێچەوانە بویەوە گەورەی و ڕێزی و گرنگی تەلمود درا بەسەر تەورات دا.

یەکێك لە حاخامەکانی جولەکە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات و دەڵێت: ((یابني كن حريصا على مرعاة اقوال الكتبة – اي الحاخامات واضعي التلمود– اكثر من حرصك علي اقوال التوراة، لان احكام التوراة تحتوي الاوامر النواهي، اما شرائع الكتبة فاءن من ينتهيك واحدة منها يجلب على نفسه عقوبة الاله...)) [1].

واتە: ئەی کوڕی خۆم زۆر دامەزراوەبە لەسەر جێ بەجێ کردنی وتەی حاخامەکانی دانەری تەلمود، زیاتر لە پابەند بوون و دامەزراویت بە وتەکانی تەوراتەوە چونکە یاساکانی تەورات پێکهاتووە لە ئەنجام دانو ئەنجام نەدانی فەرمانەکان بەلام ئەگەر یاساکانی تەلمودت پێشل کرد بەرەو سزاو تۆڵەی خودات دەبات.

یان لە جێگەیەکی تردا دەڵێت: ((لاخلاص لمن ترك التلمود و اشتغل باالتوراة لان اقوال العلماء التلمود افضل مما جاء في شريعة موسى وهي افضل من اقوال الانبياء)) [2].

واتە: ڕزگاری نابێت ئەو کەسەی کەدەست بەرداری تەلمود، دەبێت و خۆی سەقاڵ دەکات بە تەوراتەوە، چونکە وتەی زاناکانی تەلمود لە پێشتر و گرنگ ترن لەوەی کە لە شەریعەتی موسادا هاتوون، تەلمود لە پێشترە لە وتەی پێغەمبەران.

زۆر بەی زۆری جولەکەکان باوەڕیان وەها یە کە تەلمودیش وەك (تەورات) دابەزیوەتە سەر موسا، تەورات بە شێوەی نوسراو، (تەلمود) یش بەشێوەی وتن(شفوی).

---

١– الاسلام و اليهودية : د. عماد علي عبدالسميع حسين : ص(٥٩٩).

٢– اليد الخفية : د. عبدالوهاب المسيري ص(٢٧–٢٨).

هەندێکی تریان باوەڕیان وەهایە کە دەڵێن: تەورات بە تەنها وەک نان وەهایە مرۆڤیش تەنها بە نان ناژی و (تەلمود) وەک پێداویستییەکانی تر وەهایە لەگەڵ ناندا. هەروەها دەڵێن: (من يقرأ التوراة بغير المشناة و الجمارا فليس له إله)[1].

واتە: هەرکەس تەورات بەبێ (المشناه و جمارا) واتە (تەلمود) بخوێنێ ئەوە بێ باوەڕەو پەرستراوی نیە، بەڵێ جولەکەکان لەو ئاستە بەرزەدا دەڕوانن بۆ پلە و گەورەی تەلمود وبەتەنها لە بوارە گەورەو گشتیانەی ژیاندا بەکاری ناهێنن بەڵکو لەسەرجەم بوارە جۆراو جۆرەکانی ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاری دێنن، تەنانەت لە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو چۆنیەتی ئامادە کردنی خواردن و بوارەکانی پزیشکی و سحر و ئەستێرەگەرای و...هتد[2].

جولەکە باوەڕیان وەهایە کەسەر پێچی کردن لە شەرعیەتی (تەورات) تاوانە و لە بەرامبەردا تەوبەی دەوێت.بەڵام سەرپێچی کردن لە یاساکانی(تەلمود) پێویستی بە گەورەترین سزا هەیە کە ئەویش کوشتنە[3].

تەلمود یەکێکە لە بنەمەکانی پەروەردە لەلای جولەکە، گەنجی عبرانی دراسەی تەلمود دەکات ڕۆژانە (٧) سەعات بەدرێژای (٧) ساڵ بەتەواوی مانا و برگەو یاسا و ڕێساکانی لە ژێری وبیرکردنەوەی خۆیدا دەچەسپێنێ و لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا پەیڕەوی دەکات و دەیان کات بە بنەما بۆ هەست و هەڵوێست و کردارو گفوتاری خۆی.

گەر لەم ڕوانگەیەوە بڕوانینە سروشتی مامەڵە کردنی جولەکە لەگەڵ غەیری خۆیاندا، بەتەواوی ئەم ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێ[4].

---

١- موسوعة الاديان (الديانة اليهودية) الأستاذة وفاء فرحات ص (١٨٣).

٢- اليد الخفية : د. عبدالوهاب المسيري ص(٣١).

٣- موسوعة الاديان (الديانة اليهودية) ص(١٨٣).

٤- الأسلام و اليهودية ص (٦٠٠).

## تیشکێك لەسەر بڕگەو خاڵە بڕیار لەسەر دراوەکانی (تەلمود)

هەروەك پێشتر باسمان لێوە کرد کە (تەلمود) پایەو پلەیەکی زۆر گەورەی هەیە لەلای جولەکە و باس و خواسی دەربارەی سەرجەمی بوارەکانی (دینی و تەشریعی و سیاسی و قەزائی و عەقیدی و مێژووی و سەربازی و سیاسی و مامەڵە و کۆمەڵایەتی و دەیان و سەدان بواری تر) دەکات وبۆ هەر بوارێك لەو بوارانە دەیان خاڵ و بڕگەی داناوە کە دەکرێت بۆ هەر بوارێك ئەو خاڵانە باس بکەین کە پەیوەستە پێوەی.

### ١. خوای گەورە لە ڕوانگەی تەلمودەوە ((الله في التلمود) )

تەلمودی شەیتانی دەربارەی زاتی خوای گەورە وتەی زۆر نادروست و (کفر) ئامێزیان هەیە، کە سەرجەمی ئەو بیرو باوەڕانەیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم گەلە بەدکار وبەدڕەوشتە، بەتەنها مرۆڤەکان بەسوك تەماشا ناکەن و هێرش ناکەنە سەر پیرۆزیەکانیان، بەڵکو هێرشیش دەکەنە سەر زاتی پیرۆزی خوای گەورەو بێ ئەدەبی تەواوی لە بەرامبەردا ئەنجام دەدەن.

کە ئەمانە هەندێکن لە بیر و باوەڕە چەوت و نادروستەکانیان: –

١. ((ليس الله معصوما من الطيش و الغضب والكذب) )[1]

واتە: خوا بێ تاوان و بێ گوناه نیە لە ماندوو بوون و تورەی ودرۆکردن (سبحانه و تعالى عما يقولون)

٢. النهار إثنتا عشرة ساعة، في الثلاثة الاولى فيها يجلس و الله و يطالع الشريعه، و في الثلاثة الثانية يحكم، و في الثلاثة الاخرة، يجلس و يلعب مع الحوت ملك الاسماك) )[2].

واتە: ڕۆژ دوانزە سەعاتە، لە سێ یەکی یەکەم دا (خوا) دانیشتوەو شەریعەت دەخوێنێتەوە لە سێ یەکی دووەم دا فەرمان ڕەوای دەکات، لە سێ یەکی سێ

---

١– حقيقة اليهود : فؤاد بن سيد عبدالرحمان الرفاعي : ص (١٧).

٢– هەمان سەرچاوە.

یەمدا نان دەداتە جیهان، لە سێ یەکی کۆتایدا دادەنیشێ و یاری لەگەڵ نەهەنگی پادشای ماسیەکاندا دەکات؟!!

٣. ارواح الیهود مصدروها روح الله و ارواح غیر الیهود مصدروها الروح النجسة[1].

واتە: رۆحی جولەکە سەرچاوەکەی رۆحی خوایە، و ڕۆحی غەیری جولەکە سەرچاوەی ڕۆحی پیسە..

٤. الیهودي معتبر عند الله اکثر من الملائکة[2].

واتە : جولەکە لەلای خوا لە پێشتر و بەڕێز ترە لە فریشتەکان...

٥. لە ڕوانگەی تەلمودی شەیتانیانەوە(خواش) بێ تاوان و بێ گوناهـ نیە لە هەڵە.سبحانە و تعالی عما یقولون..ئەویش بە وەی کە (تەلمود) دەڵێت:

جارێکیان (خوا)، ڕقی هەڵگرت لە بەنی إسرائیل و تورە بوو لێیان و سوێندی لێ خواردن کە لە ژیانی هەمیشەی ئاخرەت بێ بەشیان بکات! !بەڵام دواتر خوا لە تورەییەکەی هێواش بووە و پەشیمان بوویەوە لەوەی کە پێشتر دەرهەق بە بەنی إسرائیل کردبووی[3]...

(تەلمود) (علیە اللعنە) وا دەڕوانێت بۆ خوا، کە خوا سەچاوەی شەڕ و خراپەیە هەروەك سەرچاوەی خێرە[4]!! .

٦. (قال القمر لله: أخطات حیث جعلتني آصغر من الشمس..فاعترف اللە بخطئە و قال اذبحو لي ذبیحة اکفربها عن ذنبي لانني خلقت القمر اصغر من الشمس)[5] .

واتە: مانگ بە (خوا) ی وت: هەڵەت کردووە لەوەی کە منت بچوکتر دروست کردووە لە خۆر! ! پاشان (خوا) دانی نا بە هەڵەی خۆیدا و وتی: حەیوانێکم بۆ

---

١- حقیقة الیهود : فؤاد بن سید عبدالرحمان الرفاعي : ص (١٧).

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- موسوعة الادیان: وفاء فرحات ص(١٨٣).

٤- هەمان سەرچاوە : ص(١٨٤).

٥- دراسات في الیهودیة : ص(٨٥).

سەر ببڕن تا ببێتە مایەی سڕینەوەی ئەو هەڵەی کە کردوومەو مانگم لە خۆر بچوکتر دروست کردووە!!

٧. یەکێکی تر لە خاڵە پڕ کفر و بێ ئەدەبیەکانیان بەرامبەر زاتی پیرۆزی (الله) دەڵێن:

((دژوارییەك لە نێوان (خوا) زاناکانی جولەکە دا دروست بوو لەسەر هەندێ باس و خواس کە ڕۆژانە لە بەینی (خوا) و (حاخامەکان) قسەیان لەسەر دەکرد، ئەم جیدالە درێژەی کێشا تا ئەو ئەندازەی بڕیار لەسەر ئەوە درا کە ئەم جیدال و جیاوازیە بدرێت بە دادگای باڵای حاخامەکان!! سەرئەنجام حاخامەکان گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە (خوا) هەڵەی کردووە حاخامەکان ڕاستیان کردووە!! (سبحانه و تعالى عما يۆفكون)[1].

## ٢.وەسفی جولەکە لە پەڕاوە ڕەشەکانی (تەلمود) دا

وێناکردنی کەسێتی جولەکە لە برگەو خالەکانی (تەلمود) دا بە شێوەیەکی زۆر سەیر و سەر سوڕهێنەرە.وا خۆیان دەبینن کە (ڕۆحی جولەکە) بەشێکە لە ڕۆحی (خوا) جیاوازە لە ڕۆحی غەیری جولەکە.هەروەك چۆن کوڕ بەشێکە لە باوك!!کە ئەمانەش بەشێکن لەو خاڵانە:

١.((لو لم يخلق اليهود لأنعمدت البركة من الارض، و لما خلقت الامطار و الشمس))[2].

واتە: گەر جەلەکە نەبوایە بەرەکەت لە زەوی دەبڕا، باران و خۆر بۆ جولەکە بەدی هێنراوە.

٢.خلق الناس باستثناء اليهود من النطفة الحصان، و خلق الله الاجنبي على هيئه إنسان ليكون لائقاً لخدمة اليهود الذين خلقت الدنيا لاجليهم[3].

---

١- حقيقة اليهود (ص(١٧) ).

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- هەمان سەرچاوە.

واتە: سەرجەمی مرۆڤەکان جگە لە جولەکە لە نطفەی ئەسپ دروست بوون، وە خوا غەیری جولەکەی لەسەر شێوەی مرۆڤ دروست کردووە بۆ ئەوەی بشێن بۆ خزمەتکاری جولەکە ئەوانەی کە دنیا لەبەر خاتری ئەوان بەدی هێنراوە!!

٣. ((الأجانب غير اليهود كاكلاب))[١]

واتە: هەرچی مرۆڤ هەیە جگە لە جولەکە وەك سەگن!!

٤. الامم الخارجه عن دين اليهود ليست كلابا فحسب، بل حميرا آيضا[٢].

واتە: ئەو نەتەوانەی کە لەدەرەوەی دینی جولەکەن بەتەنها سەگ نین، بەلکو گوێ درێژیشن!!

٥. الذي يقتل اجنبيا (آي غير اليهودى) يكفأ باالخلود في الفردوس[٣]

واتە: ئەو کەسەی کە غەیری جولەکەیەك بکوژێ پاداشت دەدرێتەوە بە فیردەوس.

٦. محرم على اليهودي ان ينجي احداً من الاجانب[٤]

واتە: حەرامە لەسەر جولەکە کە یەکێك غەیرە جولەکە ڕزگار بکات لە نارەحەتی.

٧. من العدل ان يقتل اليهودى كل أجنبي، لانه بذالك يقرب قربانا إلى الله.[٥]

واتە: لە دروستی و دادپەروەریەوەیە کە جولەکە هەموو نەتەوەیەکی تر بکوژێت چونکە بەم کارە قوربانی ئەنجام داوە بۆ خوا!!

٨. ((وهب الله اليهود حق السيطرة و التصرف بدماء جميع الشعوب و ماملكت))[٦]

واتە: خوا بەخشیویەتی بە جولەکە ماف دەسەڵاتداری و خاوەندارێتی و مامەڵە کردن بە خوێنی سەرجەم گەلانەوە.

---

١- حقيقة اليهود (ص(١٧)).

٢- هەمان سەرچاوە

٣- موسوعة الاديان: ص(١٨٦).

٤- اليهود : زهدي الفاتح ص(١٦٥).

٥- هەمان سەرچاوە

٦- هەمان سەرچاوە

٩. (( إذا سرق اليهودى غير اليهودى، فيمكن الإحتفاظ باالمسروق)) [١].

واته: ئەگەر جولەکەیەك دزی لە یەکێك کردوو جولەکە نەبوو، ئەوا بۆی نەگێڕێتەوە بەڵکو پارێزگاری لێ بکات لای خۆی!!

١٠. محظور عليك ان تسرق اخاك اليهودي، ولكن من حقك ان تسرق غير اليهودى [٢].

واته: یاساغە لەسەرت کە دزی لە برا جولەکەکەت بکەیت بەڵام مافی خۆتە کە دزی لە غەیری جولەکە بکەیت...

١١. ((تقديمك هدية إلي غير اليهودي يعد إثما عظيما، ولكن يسمع لليهودي ان يمنع الصدقات لفقراء غير اليهود و عيادة مرضاهم و التعزية بموتاهم لخلق جو من الوئام، بحيث يخيل إلي الانحيار بان اليهودهم اصدقاء طيبون، لانهم يعبرون عن مشاعرهم الطيبة)) [٣].

واته: پێشکەش کردنی هەر دیارییەك بۆ غەیری جولەکە بە تاوان هەژمار دەکرێت!! بەڵام ڕێگا دراوە بە جولەکە کە خێر و چاکە لەگەل غەیری جولەکەدا بکات وسەردانی نەخۆشیان بکات و ئامادەی پرسەی کۆچ کردنیان بێت، بۆ ئەو مەبەستەی کە کەشێکی ساز بسازێنێ، تا لە هەستی غەیرە جولەکەکاندا ئەوە دروست ببێ کە جولەکە دۆستەو هاوەڵیانە و کە سانی باشن، بۆ ئەوەی کە لە شعوریاندا جولەکە بە کەسانی باش ناو بەرن.

١٢.((يجب على اليهود السعي الدائم لغش المسحيين)) [٤].

واته: پێویستە لەسەر جولەکە هەوڵی بەردەوام بدات لەسەر فێڵ کردن لە گاورەکان.

---

١- اليهود : زهدي الفاتح ص(١٦٥).

٢- هەمان سەرچاوە ص(١٦٦).

٣- هەمان سەرچاوە ص(١٧٠).

١٣.((اليهود بشر، لهم إنسانيتهم، اما الشعوب و الامم الأخرى فيها عبارة عن حيوانات) ).

واتە: جولەکە مرۆڤن، خاوەن مرۆڤایەتی خۆیانن، بەڵام گەلان و میللەتانی تری غەیری جولەکە پێکهاتوون لە ئاژەلان و وەکو ئاژەڵ وەهان.

١٤.((من يفعل خيرا للمسحيين، فلن يقوم من قبرهِ قط) ).

واتە: ئەو کەسەی چاکە لەگەڵ گاورەکاندا بکات، هەرگیز لە گۆڕەکەیدا هەڵناستێتەوە.

١٥.((ارواح الاغيار من الشيطان، تماما كارواح الاغنام و الحيوانات، نطفة غير اليهودي هي كنطفة حيوان) ).

واتە: ڕۆحی غەیری جولەکە لە شەیتانەوەیە، بەتەواوی وەك مەڕو مالات و ئاژەڵان، نطفەی غەیری جولەکە وەك نطفەی ئاژەڵە.

١٦.((إذا قتل غير اليهودي رجلاً يهوديا او غير اليهودي فهو مسؤول و تجب محاكمته، اما إذا قتل يهودي غير يهودي فهو غير مسؤول و ولايحاكم) )[1].

واتە: گەر کەسێکی غەیرە جولەکە، جولەکەیەکی کوشت یان غەیرە جولەکەیەکی کوشت ئەوا بەر پرسە لێ ی پێویستە دادگای بکرێت، بەڵام ئەگەر جولەکەیەك غەیرە جولەکەیەکی کوشت، بەرپرسیار نیەو نابێت دادگای بکرێت.

١٧.((يحل قتل اليهودي المرتد عن دينه أينما كان، حتي وإن كان ردته مجردنية.) )[2].

واتە: دروستە ئەو جولەکەیە بکوژرێت کە لە دینی هەڵدەگەڕێتەوە لە هەر کوێ یەك بێت، ئەگەر هەڵگەڕانەوەکەشی بە نیەتیش بێت؟!!

١٨.((غير اليهودي الذي يدرس التلمود، واليهودي الذي يساعده على ذالك يجب قتلتها) )[1].

---

١- اليهود : زهدي الفاتح ص(١٧٠).

٢- هەمان سەرچاوە

واتە: ئەوانەی کە جولەکە نین و دراسەی تەلمود دەکەن و جولەکەیەکیش یارمەتی دەدات لەسەر ئەو دراسە کردنە پێویستە بکوژرێت!!!

١٩.((الربا محرم بين اليهود، و مباح تعاطيه من غير اليهود)) [٢].

واتە: کاری(سوو) خۆری یاساغە (حرامە) لە نێوان جولەکەدا، بەڵام ئاسای و حەڵاڵە وەرگرتنی لە غەیری جولەکە.

٢٠.((حياة غير اليهودي ملك لليهودي...)) [٣].

واتە: ژیانی کەسانی غەیری جولەکە ملکی جولەکەیە!!!

**٣. (ئافرەت) و (گرێ بەستی هاوسەری) و بوارەکانی (ڕەوشت) لە برگەکانی (تەلمود) دا.**

پەراوە ڕەشەکانی (تەلمود) دەیان برگە و خاڵی بڕیار لەسەر دراویان دەربارەی ئافرەت بە گشتی و گرێ بەستی هاوسەرگیری و بوارەکانی تایبەت بە ڕەوشت هەیە و ئەمانە هەندێکیانن:

١.الزنا بغير اليهود سواء كانوا ذكورا أم إناثا مباح.

واتە: بەدڕەوشتی کردن (زینا) لەگەڵ غەیری جولەکەدا جا نێر بێ یان مێ دروستە!!

٢.لا يحق للمرأة اليهودية أن تشكوا زوجها إذا زني على الفراش الزوجية.

واتە: ئافرەتی جولەکە مافی ئەوەی نیە کە سکاڵای پیاوەکەی بکات لەسەر ئەوەی کە زینای کردووە لەسەر جێگەی ژن و مێردایەتیان!!

٣.من حلم من اليهودية إنه جامع والدته يؤتي الحكمة
و من رأى أنه جامع خطيبته فهو محافظ على الشريعة
و من رأى أنه جامع أخته فمن نصيبيه نور العقل

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢- حقيقة اليهود: ص (١٨، ١٩).

٣- هەمان سەرچاوە

ومن رأى أنه جامع امرأة قريبه فله الحياه الابدية[1]

واته: هەرکەسێك شەیتانی ببێت لە خەویدا و دەستی لەگەڵ دایکی خۆیدا تێکەڵ کردبێت ئەوا کارزانی (حکمة) پێ خەڵات دەکرێت.

هەرکەسێك لە خەونیدا بینی کە دەستی لەگەڵ خێزانەکەیدا تێکەڵ کردووە، ئەوە پارێزگاری لە شەریعەت کردووە.

هەرکەسێك لە خەونیدا دەستی تێکەڵ کردبوو لەگەڵ خوشکی خۆیدا و زینای لەگەڵ دا دەکرد ئەوە (ڕووناکی ژیری) پێ دراوە.

هەرکەس لە خەونیدا زینای لەگەڵ ئافرەتە نزیکاکانیدا دەکرد، ئەوە ژیانی هەتا هەتای بۆ هەیە!!

٤.كل النساء غير اليهوديات مومسات[2].

واتە: هەموو ئافرەتێکی غەیرە جولەکە بەدڕەوشتن.

٥.((من حق الرجل ان يفعل بزوجته ماشاء واشتهى، تماما لحقه في قطعة لحم إشتراها))[3].

واتە: ماف پیاو لەسەر ژن ئەوەیە کە هەرچی دڵی ئارەزووی دەکات بەرامبەر هاوسەرەکەی ئەنجامی بدات، بە وێنەی پارچە گۆشتێك کە کڕیوویەتی.

٦.((يحق لليهودى ان يغتصب، ان يخادع، أن يقسم يمينا كاذبا ولكن بشرط أن يحرص أن لا يكتشف امره احد، حتى لايساء إلى سمعة إسرائيل)).

واتە: دروستە بۆ جولکە کە دەستدرێژی بکات، فێڵ بکات، سوێندی درۆ بخوات، بەو مەرجەی کە سور بێت لەسەر ئەوەی کە ئەم کارانەی ئاشکرا نەبێت لە لای کەس، تا نەبێتە مایەی خراپ کردنی سمعەی إسرائيل.

٧.((يحل لليهودي إغتصاب غير اليهودية، ولكن يحرم عليه الزواج منها))

---

١- حقيقة اليهود: ص (١٩).

٢- اليهود: ص(١٦٨).

٣- هەمان سەرچاوە

واتە: دروستە بۆ جولەکە، دەستدرێژی بکاتە سەر ئافرەتی غەیرە جولەکە، بەڵام دروست نیە داخوازی بکات.

٨.((يحل اغتصاب الطفلة غير اليهودية متى بلغت من العمر الثلاث سنوات))

واتە: دروستە دەست دێژی بکرێتە سەر منداڵی غەیرە جولەکە.گەر تەمەنیشی سێ سالانە بێت.

٩.((بما ان الطفلة غير اليهودية التى تجاوزت الثلاث السنوات بيوم واحد من عمرها صالحة للاغتصاب المضاجعة))

واتە: گەر منداڵێکی غەیرە جولەکە تەنها یەك ڕۆژ زیاتر بوو لە سێ ساڵ واتە سێ ساڵ و یەك ڕۆژ زیاتر بێت.تەمەنی دەست دەدات و گونجاوە بۆ ئەوەی دەستدرێژی سێکسی بکریتە سەر و کاری سەرجێکەی لەگەڵدا بکرێت...

### ٤.گاورەکان لە پەڕاوەکانی (تەلمود) دا

١.((يسوع المسيح ارتد عن الدين اليهودي و عبدالاوثان)).

واتە: (یە سوعی مەسیح) هەڵگەڕایەوە لە دینی جولەکە و دەستی کرد بە بت پەرستی.

٢. ((المسيح مجنون و ساحرو وثني و المسيحيون كفرة مثله))

واتە: (عیسا) شێتەو جادووگەرە و بت پەرستە، گاورەکانیش بێ باوەڕن وەك ئەو.

٣.((آحط الكفار من الناس هم من المسيح و أتباعه))

واتە: ((خراپترین بی باوەڕ لەناو خەڵکی دا عیسا و شوێن کەوتوانیەتی.

٤.((كنائس المسيحين بيوت ضالين و معابد اصنام فيجب على اليهود تخريبها))

واتە: کلیسای گاورەکان شوێنی سەرگەردان و نەزانەکان و شوێنگای بت پەرستییە، پێویستە لەسەر جولەکە کە بیان ڕووخێنێ!!

٥.((اناجيل النصارى واجب إحراقها لانها عين الضلال و الظلم و الخطايا))

واتە: ئینجیلەکانی گاورەکان پێویستە بسوتێنرێ چونکە سەرچاوەی گومڕای و ستەم و هەڵەن.

٦.((إن الكنائس النصرانيه بمقام قاذورات وأن الواعظين فيها أشبة بالكلاب النابحة) )

واتە : کڵێسای گاورەکان لە جێگەی شوێنە بیسەکاندایەو ئەوانەشی وتار دەدەن تیایدا هەروەك سەگی وەڕیو، وەهان.

٧.على اليهودى ان يلعن كل يوم النصارى ثلاث مرات.

واتە: پێویستە لەسەر جولەکە کە ڕۆژانە سێ جار گاورەکان بە نەفرەت بکات.

٨. ((يجب تخفيض نسبة الموالد عند المسيحين) )

واتە: پێویستە کار بکەین لەسەر ئەوەی کە ڕێژەی منداڵ بوون لەناو گاورەکاندا دابەزێنین! !

٩.((إبادة المسيحين تضحية ضرورية) )

واتە: لەناو بردنی گاورەکان گیان فیداییەکی پێویستە ! !

**٥. سوێند خواردن و یاساکانی لە (تەلمود) دا**

دەقەکانی (تەلمود) دەربارەی سوێند خواردن باوەڕیان وەهایە ئەو سوێندەی کە جولەکەیەك لەکاتی مامەڵە کردندا دەیخوات، لەگەڵ غەیرە جولەکەدا بە سوێند هەژمار ناکرێت! ! هەروەك سوێندێك وەهایە کە بۆ ئاژەڵێکت خواردبێت، وە سوێند خواردن بۆ ئاژەڵیش بە سوێند ناژمێردرێت.

کاتێك جولەکەیەك دزی لە غەیرە جولەکەیەك دەکات و دوای ئەو کارەی بە سزای دادگا دەکەوێت و زۆری لێ دەکەن کە سوێند بخوات وشاهیدی بدات لەسەر پاکانەی خۆی، ئەوە دروستە لەم حاڵەدا هەم سوێندی درۆ بخوات و هەم شاهیدی درۆش بدات بۆ کەسێکی تری جولەکە، کە دزی نەکردووە، چونکە (تەلمود) ڕۆژێکی تایبەتی بۆ ئەم حاڵەتانە داناوەو پێ ی دەوترێ ڕۆژی لێ بوردن (يوم الغفران) و

جولەکە تەوبەی تێدا دەکەن — بەحسابی خۆیان— لە هەڵەو تاوان و سوێندە درۆیانەی کە پێشتر خواردوویانە[1].

دروشمی هەرە گەورەو سەرەکی تەلمود لە سەیر کردنی گەلان و میللەتاندا بریتە لە سەیر کردنی گەلان و خەڵکانی غەیری جولەکە بە (گوێ درێژ) هەروەك لە یەکێك لە برگەکانیاندا باس لەم حاڵەتە دەکات ودەڵێت:

((الاممیون هم الحمر، الذین خلقهم الله لیرکبهم شعب الله المختار...))

واتە: تەواوی گەلان و میللەتانی—غەیری جولەکە— گوێ درێژن و خوا بۆ ئەو مەبەستە دروستی کردوون و بەدیهێناون کە گەلی هەڵبژاردەی خوا—جولەکە— سواریان بین!!

بەڵێ ئەمەی پێشتر باسکرا لە برگەو خاڵەکانی (تەلمود) مشتێکن لە خەرمانێكو هەزاران ئەوەندەی تر لەسەر تەلمود و برگە چەوت و دووژمن کارییەکان بنوسین تەواو نابێت، هەر بۆیە ئەم باسەم بەم چەند سەرنج و تێ بینییە تەواو دەکەم و دەڵێم:

خوێنەری خۆشەویست! ئەمە ڕاستێتی ئەو گەلەیە کە خۆیان بە نەوەی خواو گەلی هەڵبژاردە دەبین لە ناو تەواوی گەلانی سەر زەوی دا!! لە بەرامبەریشدا تەواوی گەلان و خەڵکی بەگشتی بە گوێ درێژ و ئاژەڵ دەزانن و لە واقعیشدا هەر مامەڵەی ئەوەیان لەگەڵدا دەکەن!! ئێستا ودوای تێ گەیشتنتان لە دەقەکانی تەوراتی دەستکاری کراو تەلمودی دانراوی دەستی حاخامەکانی جولەکە، هیچ لاتان سەیر نەبێت کە دەوڵەتی داگیرکەری (إسرائیل) هەرچی بکات لە داگیرکاری و کوشتنی منداڵ و ژن وپیر و بێ دفاع ورەشە کوژی و بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراوی فسفۆرو زیاد کردنی ئۆردووگا نشینەکان وبەکار هێنانی کاری سو خۆری وحساب نەکەردن بۆ هیچ قیەم و ڕەوشتێکی مرۆی و بێ ڕەحمی لە مامەڵە کردن و درۆ کردن و فڕاندنی خەڵکان و بەڕێوبردنی کەناڵە سێکسییەکانی دنیا و

---

١- موسوعة الادیان: ص(١٦٨).

کاری جاسوسی وگوێ نەدانە یاسای نێودەوڵەتی وساروخ باران کردنی فەڵەسطینیەکان و کردنەوەی دەیان وسەدان بەندی خانەی ئاشکرا و نهێنی و، وێران کردنی قدسی شەریف و کاول کردن و فەساد نانەوە لەسەر زەوی وهەزاران هەزاری تر لەمانە !!

ئێستا لات سەیر و سەرسوڕهێنەر نەبێت کە جولەکە بۆ وا دەکەن و پێشتریش لەسەردەمی موسا و دوای ئەودا بۆ وایان کردووە؟! ئەمانە بەتەواوی باوەڕیانەوە بڕگە لە دوای بڕگە و خاڵ لەدوای خاڵی (تەوراتی دەست کاری) کراوو (تەلمود) جێ بە جێ دەکەن لەسەرجەم بوارە جۆراو جۆرەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵیاندا و لادان لەو دوو سەرچاوەیە بە پشت هەڵکردن و کافربوون دەزانن، ئەوان ئاوا لە پەروەردگاری بەدی هێنەر وخاوەن دەسەڵاتی ڕەها دەڕوانن کە تۆمەت باری دەکەن بە دەیان و سەدان سیفەتی نادروست و ناشیا و کە سەرجەمی کفر و شرك و بێ ئەدەبین لەبەرامبەر بەو زاتە پاك و بێ گەردەدا، ئیتر چۆن بۆچون و هەڵسەنگاندنیان لە بەرامبەر خەڵکی و میللەتاندا بەو جۆرە نابێت کە هەیە!!!!؟!

بە تێ گەیشتنی من ناسین وشارەزابوون لەم گەلە بەدکارە واجبێکی شەرعیە و دەبێت هەموو کەس بەجیاوازی بیر وڕاو دین و دیدگایانەوە لەم گەلە ستەم کارو فێڵ بازە تەواو شارەزا بن تا لە شەڕیان بەدوور بێت.

ئەمانە دوژمنی بەتەنها مسوڵمان نین، بەڵکو دوژمنی خواو فریشتەکان وپێغەمبەران وسەرجام خەڵکین بە گشتی و بەجیاوازی تەمەن و ڕەگەز و دین وئایدۆلۆژیا و تەواوی جیاوازیەکان و بەڵگەشمان لەسەر ئەمە خاڵەکانی (تەلمودە) کە زۆر بەئاشکرا دژایەتی گەلان و میللەتەنی غەیری جولەکەی تێدا ڕەوا کراوەو کوشتن و لەناو بردنیان بە قوربانی کردن بۆ خوا دەزانن.

# بەندی سێهەم

## خەسڵەتەکانی جولەکە و تیشکێك لەسەر بیر وباوەڕیان لە قورئانەوە

گەر بچینە خزمەت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەربارەی (جولەکە) هەزاران ڕاستی و خاڵی ترمان بۆ ئاشکرا دەکات کە خوای بالا دەست شاهیدی دەدات لەسەر خەسڵەت و بیر وباوەڕە خراپەکانیان، تاوەکو ئێمەی باوەڕدار تەواو ئاشنا بکات بە ناسینی ئەم گەلە بەتکارەو غافڵ نەبوون لێیان. کە ئەمانەش هەندێکن لەو خەسڵەتانە.

### خەسڵەتی یەکەم:

قورئانی پیرۆز ئەو ڕاستیەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە هیچ گەل و دین و میللەتێك لەسەر زەویدا هێندەی جولەکە ڕقیان لە مسوڵمانان و باوەڕدارانی ڕاستقینە نیە!!

هەروەك دەفەرمێت: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانًا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴾ المائدة: ٨٢

واتە: دەبینی لە هەموو خەڵکی زیاتر، لە هەموو دوژمنان زیاتر هۆزی جولەکە دوژمنایەتی باوەڕداران دەکەن..........

### خەسڵەتی دووەم:

قورئان لەوە ئاگادارمان دەکات کە گەلی بەدکاری جولەکە لەسەر زمانی دوو پێغەمبەرەوە نەفەرتیان لێ کرا، کە ئەویش لەبەر ئەوە بوو فەرمانیان بە چاکە نەدەکردوو ڕێگریان لە خراپە نەدەکرد هەروەك دەفەرمێت:

﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾ المائدة: ٧٨ - ٧٩

واته : نەفرین كراوە لەوانەی كە بێ باوەر بوون لەنەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داود و عیسای كوڕی مریەم ئەمەش لەبەر ئەوەی كە ئەوانە یاخی و سەركەشن و دەست درێژی دەكەن، ئەوانە قەدەغەی تاوان و خراپەیان نەدەكرد، لە نێوان یەكتردا كە ئەنجامیان دەدا، ئای كە چەند كارو كردەوەی خراپیان دەكرد.

(إبن عباس) دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرمێت: ((لعنوا بكل لسان، لعنوا على العهد موسى فى التوراة، وعلى عهد داود في الذبور، وعلى عهد عيسا فى الانجيل، و عهد محمد في القرآن) )[١].

واتە: نەفرینیان لێ كرا بە هەموو زمانێك، لەسەردەمی موسادا و لە تەورات دا نەفرینیان لێ كرا لەسەردەمی داود لە زەبوردا نەفرینیان لێ كرا، لەسەردەمی عیساداو لە ئنجیل دا نەفرینیان لێ كرا، لەسەردەمی (محمد) داو لە قورئاندا نەفرینیان لێ كرا.

## خەسڵەتی سێ هەم

قورئانی پیرۆز باس لە گۆشەیەكی تری خیانەت وخەسڵەتی ئەم گەلە بەدرەفتارە بەوە دەكات كە هەمیشە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن كاری نادروست و نابەجێ دەدەنە پاڵ خوای تاك و تەنیا.هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ آل عمران: ٧٨.

---

١- صفوة التفسير : محمد علي الصابوني. ج(١) ص(٣٣١).

واتە: دەستەیەك لە وانە -واتە جولەکە- زمانیان بادەدەن و بەجۆرێك شت دەڵێن، گوایە تەورات دەخوێننەوە بۆ ئەوەی ئێوە چەواشە بکەن و وای پیشان بدەن کە ئەو کتێبە دەور دەکەنەوە، لە کاتێکدا کە ئەوەی دەی خوێننەوە لەو کتێبە نیە -واتە تەورات- وە دەڵێن((ئەوەی کە دەیخوێنین هەر ئەوەیە کە خوا ڕەوانەی کردووە، بەڵکو هەرگیز ئەوە لەلایەن خواوە نیە وە بەدەم خواوە درۆ دەکەن و چاکیش دەزانن کە درۆ و بوختان دەکەن.

## خەسڵەتی چوارەم

قورئان باس لە ستەمی جولەکەکان دەکات کە گەلێکی ستەم کار بوون و بەهۆی ئەم ستەمکاریانەوە خوای گەورە هەندێ شتی باشی حەڵاڵی لێ حەرام کردن، هەروەها بەهۆی بەربەست بوونیان لەبەردەم گەیاندنی دینی خوا و خواردنی (سو) و ماڵی خەڵکی بە هەق دووچاری سزای سەختی خوا بوون لە دنیا ودوارِۆژدا، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمێت: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ النساء: ١٦٠ - ١٦١.

واتە: بەهۆی زوڵم و ستەمی زۆربەی جولەکەکانەوە، بەهۆی ئەوەی کە زۆر کۆسپیان دەخستە بەردەم دینی خوا.ئێمە هەندێك نازو نیعمەتمان لێ حەرام کردن کە پێشتر بۆیان حەڵاڵ بوو.هەروەها بەهۆی سو خۆریانەوە (هەندێك شتی تری حەڵاڵمان لێ حەرام کردن، هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە کە ماڵی خەڵکی بە ناهەق دەخۆن، بێ گومان بۆ ئەوانەیان کە بێ باوەڕن، سزایەکی بە ئێشمان ئامادە کردووە.

## خەسڵەتی پێنجەم:

یەکێکی تر لە تابلۆ ناشرین وزەقەکانی جولەکەی بەدکار، بریتیە لە بێ باوەڕبونیان بە ئایەت و نیشانەکانی خوای گەورەو کوشتنی پێغەمبەرانی ڕەوانە

کراو بۆلایان بەناهەق، هەروەك قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێدەکا و دەفەرمێت: ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ النساء: ١٥٥.

واتە: لەوەو دوا بەهۆی پەیمان شکاندنیان و بێ باوەڕیان بە ئایەتەکانی خواو کوشتنی بە ناهەقی پێغەمبەران لەلایەن ئەوانەوە –خوا خەشمی لێ گرتن–وە ئەو قسەیەشیان کە دەڵێن، دڵی ئێمە داخراوەو بەرگی پێوەیە–مەبەستیان ئەوەیە کە ئامادە نین گوێ بۆ هیچ ئامۆژگارییەك بگرن– بەڵکو خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ ودەروونیانەوە، بەهۆی ئەوەوە کە خۆیان بڕیاری کافربوونی خۆیان داوە، وە زۆر کەمیان نەبێت باوەڕ ناهێنن.

## خەسڵەتی شەشەم:

باس کردنو وەسف کردنی خوای گەورە بە دەست قونجاوی و ڕەزیلی – سبحانە وتعالی عما یصفون– قورئان دەفەرمێت: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ المائدة: ٦٤.

واتە: جولەکە دەڵێن (خوا دەستی بەستراوە) و داخراوە، دەستی خۆیان دابخرێت و کەلەپاچە بێت و تووشی شەلەل بێت و نەفرینیان لێ بێت بۆ خۆیان و قسەیان(نەخێر وانیە) دوو دەستەی (پڕ بەرەکەتی خوا) هەمیشە و بەردەوام کراونەتەوە و چۆنی بوێت دەی بەخشێت...

## خەسڵەتی حەوتەم:

تاوان بار کردن و باسکردنی (خوا) بەوەی کە زاتێکی هەژارە و کەم دەستە خۆشیان–واتە جولەکە– دەوڵەمەند وخاوەن سامانن، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴾ آل عمران: ١٨١.

واتە: بێ گومان خوای پەروەردگار گوفتاری ئایەچی ئەو جولەکانەی بیست کە وتیان: خوا هەژارەو ئێمە دەولەمەندین !! ئێمە ئەو گوفتارانە تۆمار دەکەین لەسەریان، هەروەك کوشتنی پێغەمبەران بە ناهەق لەسەر دەستی ئەوان پاشان پێیان دەلێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر !!

### خەسڵەتی هەشتەم:

یەکێکی تر لە گەندەلیەکانی جولەکە پاشان گاورەکان بریتی بوو لەوەی کە هێندە لە خۆیان رازی بوون، خۆیان بە ئەوەی خواو نزیکی ئەو زاتە هەژمار دەکرد هەروەك خوای بالا دەست وتاك وتەنیا دەفەرمێت: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ المائدة: ١٨

واتە: جولەکە و گاورەکان دەڵێن ئێمە رۆڵەی خواو خۆشەویستی ئەوین (ئەی محمد) پێیان بڵێ، کەواتە بۆچی لەسەر گوناهـ و تاوان سزاتان دەدات؟ کەواتە ئێوەش مرۆڤێکن لەو مرۆڤانەی تر کە بەدی هێنراون.

(إبن كثير) لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت: ((اي نحن منتسبون إلى انبيائه وهم بنوه له بهم عناية وهو يحبنا)) [١]

واتە: بەڵێ ئێمە -واتە جولەکە- نەسەبمان دەگەڕێتەوە بۆ سەر پێغەمبەران و ئەوانیش نەوەی (خوا) ن و چاودێریان دەکات و (خواش) لەبەر ئەوە ئێمەی خۆش دەوێت.

---

١- مختصر ابن كثير: ج(١) ص(٤٩٩).

## خەسڵەتی نۆیەم:

بڕیاردانی ئەوە بۆ خواو هاوەڵ بۆ پڕیداکردنی یەکێکی ترە لە خەسڵەتە دزێوەکانیان کە باس کراوە لە قورئانی پیرۆزدا: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ التوبة: ٣٠

**واتە:** هەندێك لە جولەکەکان دەڵێن(عوزەیر) (کە یەکێك بووە لە پێغەمبەران) کوڕی خوایە، گاورەکانیش دەڵێن مەسیح کوڕی خوایە، ئەو بوختانانەیان کە بە زاریان دەیکەن، لە بوختانی ئەو بێ باوەڕانەی پێش خۆیان دەچێت، خوا بیان کوژێت، ئاخر ئەم بوختانە ناڕەوایە چۆن هەڵدەبەستن؟

## خەسڵەتی دەیەم:

یەکێکی تر لە خەسڵەتەکانی جولەکە بریتیە لە ناو بردن و نمونە هێنانەوە لەسەریان لە قورئانی پیرۆزدا بە (گوێ درێژ) ێك کە بارێك کتێبی لەسەر پشت بێت، کە بێگومان بوونی ئەو ڕێژە کتێبە زۆرە لەسەر پشتی گوێ درێژێك هیچ سودو قازانجێکی بۆ هەڵگرەکەی نیە تەنها ئەوە نەبێت کە بار قورسی بۆ دروست دەکات و توشی ماندوو بوون و پسانی دەکات.

خوای گەورە ئاوا نمونە لەسەر جولەکە دەهێنێتەوە کە ئەوان خۆیان بە خزمەت کار و هەڵگری تەورات دەزانن، بەڵام گوێ درێژێك چەند سود لە کتێبەکانی سەر پشتی وەردەگرێت، ئەوانیش لە ڕاستیدا هەر ئەوەندە....

قورئان دەفەرمێت: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ الجمعة: ٥.

**واتە:** نمونەی ئەوانەی کە تەوراتیان بۆ ڕەوانە کرا کە پەیڕەوی بکەن، بەڵام پەیڕەویان نەکرد، نمونەی ئەوانە وەك گوێ درێژێك وەهایە کە بارە کتێبێکی

هەلگرتبیّ، چەندە ناشرینە نمونەی ئەوانی کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەخەنەوە و بڕوای پیّ ناکەن.بیّ گومان خوا ڕێنومای ستەم کاران ناکات.

### خەسڵەتی پانزەیەم:

زۆر لە خۆ ڕازی بوون و وەسف کردنی خۆیان بەوەی کە دۆست ونزیکی خوان و لە هەموو کەس خۆشەویستترن لەلای پەروەردگار یەکێکی ترە لە خەسڵەتە نادروستەکانیان، هەروەك قورئان باسیان لێوە دەکات و بە درۆیان دەخاتەوە و بەجۆرێك پرسیاریان لەم سیفەتە لیّ دەکات کە نەتوانن وەلامی بدەنەوە، هەروەك دەفـــــەرمێت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ الجمعة: ٦ – ٧ .

واتە: ئەی پێغەمبەر بڵیّ: ئەی ئەوانەی لەسەر دینی جولەکەن، ئەگەر ئێوە بڕواتان وەهایە کە دۆست ولایەنگری خوان، کەواتە داوای مردن بکەن و ئاواتی مەرگ بخوازن !!(تا بگەن بەخواو لەم ژیانە پڕ لە ژانەدا ڕزگارتان بێت) !! بەلام ئەوانە هەرگیزاو هەگیز ئاواتی وا ناخوازن و مردن داواناکەن، چونکە خۆیان دەزانن چییان دەستپێشکەری کردووە، خواش زۆر زانایە بە کارو کردەوەی ستەم کاران....

پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرمێت: ((والذي نفسي بيده، لو تمنوا الموت ما بقى على ظهرها يهودي إلا مات)) [١].

واتە: سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە، گەر ئەوان–واتە جولەکە– خۆزگەی مردنیان بخواستایە، ئەوا جولەکە لەسەر زەویدا نە دەما و دەمردن...

---

١– تفسير القرطبي: ج(١٨) ص(٩٢).

## خەسڵەتی دوانزەیەم:

باسکردنیان بەوەی کە خاوەنی دڵی ڕەق و ڕەشن و خۆشیان شاهیدی دەدەن لەسەر ئەم خەسڵەتە خراپەیان هەروەك قورئان دەفەرمێت: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ (٨٧) وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ البقرة: ٨٧ – ٨٨

**واتە:** هەرکاتێك پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووی ئێوەدا نەگونجا بێت، خۆتان بە زل زانیوە و لوت بەرزیتان نواندووە و باوەڕتان نەهێناوە، ئەوجا دەستەیاکتان پێغەمبەرەکانتان بەدرۆ خستەوەو هەندێکی تریشتان لێ کوشتن، جولەکەکانی –سەردەمی پێغەمبەر– وتیان: دڵەکانمان داخراوە، بەڵکو ئەوانە خوا نەفەرینی لێ کردوون بەهۆی کفر و خوا نەناسییانەوە، زۆر کەم ئیمان دەهێنن و باوەڕ دەکەن.

## خەسڵەتی سیانزەهەم:

خۆ خەڵەتاندن و پاشان فریودانی خەڵکی بەوەی کە هەرکەس گاور وجولەکە نەبێت توخنی بەهەشت ناکەوێت و لە خۆشیەکانی بەهرەمەند نابێت، یەکێکی ترە لە خەسڵەتە دزێوەکانیان هەروەك قورئان دەفەرمێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ البقرة: ١١١.

**واتە:** جولەکە و گاورەکان دەڵێن: کەس ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر ئەوانە نەبێت کە جولەکەن یان گاور، جا ئەوە ئاوات و خەیاڵی خۆیانە –تۆش ئەی محمد– پێیان بڵێ: گەر ڕاست دەکەن بەڵگەکانتان لەسەر ڕاستی قسەکانتان بێننە مەیدانەوە؟

### خەسڵەتی چوادەیەم:

شاردنەوەی شاهیدی و ڕاستی یەکێکی ترە لە خەسڵەتە نابەجێکانیان، ئەویش بەوەی کە ئەوەکانی خۆیان (پێغەمبەریان) دەناسی و بەتەواوی دڵنیا بوون لەوەی کە لە تەوراتدا باس وخواسی هاتووە دوایین پێغەمبەرە بۆ سەرزەوی لەلایەن خواوە.بەڵام دژایەتیان دەکردوو بەدرۆیان دەخستەوە، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٤٦.

واتە: (محمدیان) دەناسی هەروەك نەوەکانی خۆیان.بێ گومان دەستەیەك لەوانە ڕاستی دەشارنەوە، لە کاتێکدا دەیانزانی کە ئەوەی دەیشارنەوە ڕاستە.

یەکێکی تر لە کارە دزێوەکانیان لەبواری شاردنەوەی ڕاستیەکاندا بریتی بوو لەوەی کە دەیان وت: ((إبراهیم و إسماعیل و إسحاق و یعقوب و نەوەکانی)) سەرجەم بەکۆ جولەکە بوون وەك ئێمە.خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمێت:

﴿ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَـٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ البقرة: ١٤٠

واتە: یاخود ئێوە دەڵێن کە: إبراهیم و إسماعیل و إسحاق و یەعقوب و نەوەکانی جولەکە یان گاور بوون، پێیان بڵێ: باشە ئێوە چاکتر دەزانن یان خوا؟! جا کێ لەوە ستەمکار ترە کە ڕاستیەك دەزانێت و دەیشارێتەوە.بێگومان خوا بێ ئاگا نیە لەوەی کە ئەنجامی دەدەن.

### خەسڵەتی پانزەهەم:

یەکێکی تر لە خەسڵەتە دزێوەکانیان بریتیە لە گاڵتە کردن و شۆخی کردنیان بە دین و دروشمە بەرزەکانی، هەروەك قورئان دەفەرمێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا

﴿ تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴾ المائدة: ٥٧ ـ ٥٨ واتـه: ئـەی بـاوەڕداران نەكـەن ئەوانـە بكەنـە پشتیوان وجێگـەی متمانـەی خۆتـان كـە گاڵتـە و لا قرتـێ بـە دینەكـەتان دەكـەن، چ لـە خاوەنـانی كتێبەكانی پێش خۆتان –كە گاور و جولەكەن– چ لە بێ باوەڕان، لـە خـوا بترسـن و پارێزگـار بـن، ئەگـەر ئێـوە بـاوەڕدا، ئەوانـە هـەركات بـانگ دەدەن بـۆ نوێـژو و- بیستەی بانگ دەبن دەیكەنە گەمە و گاڵتە، چونكە ئەوانـە كەسـانێكن كـە عـەقڵ و ژیری خۆیان لەدەست داوە.

خەسڵەتی شانزەهەم:

باوەڕ بوونیان بە بت پەرستی و كەسانی زۆردار و ستەم كـارو لـە ڕێگـە لادراو، پاشان فێڵ كردنیان لە مسوڵمانان و برەودان بـە گـومڕای و بـێ نـاوەڕۆكی بەسـەر إسلام دا، یەكێكی ترە لە خەسڵەتە شەیتانیەكانیان، هـەروەك قورئـان دەفـەرموێت:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَـٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴾ النساء: ٥١ ـ ٥٢.

واتـە: ئایـا نابینیـت و سـەرنج نادەیـت لەوانـەی كـە بەهرەیـەكیان لـە كتـێبی ئاسمانی پێ درا(بـەلام لەگـەڵ ئەوەشـدا) باوەڕیـان بـە فـاڵچی و جادووگـەرو بـت و پەیكـەر هەیـە، دەربـارەی ئەوانـەش كـە كـافرن دەڵـێن: ئەوانـە چـاكترن و ڕێبـازی ڕاستیان گرتوە لەوانەی كە باوەڕیان هێناوە بە إسلام !! ئەو جولەكانە كەسـانێكن كە نەفرینی خوایان لەسەرە، ئەوەی كە خوا نـەفرینی لـێ بكـات ئـیتر هـیچ كەسـت دەست ناكەوێت بیكەیتە پشتیوانی.

## خەسڵەتی حەڤدەیەم:

هەڵگری سیفەت یان ڕووخساری (مەیمون یان بەراز) ن هەروەك قورئان دەفەرمێت: ﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ۚ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ ﴾ المائدة: ٦٠.

واتە: ئەی محمد (پێیان) بڵێ ئایا هەواڵی لەوە خراپترتان بدەمێ کە کێ زەرەرمەند و پاداشتی سامناکی بۆخۆی مسۆگەر کردووە؟! بێ گومان ئەوانەی کە خوا نەفرینی لێ کردوون و ڕقی لێ هەڵگرتوون(هەندێك جاریش) کردوونی بە مەیمون و بەراز و بەندەی هەمو شتێکی ناشایستە.، ئەوانە جێگەو ڕێگەیان زۆر ناخۆشە و زۆر گومڕا و لادەرن لە ڕاستە ڕێ ی دروست.

زانای پایە بەرزی تەفسیر (إبن کثیر) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ((یا اهل الکتاب الطاعنین فی دیننا الذي هو توحید الله و إفراده باالعبادة دون سواه کیف یصدر منکم هذا و آنتم قد وجد منکم جمیع ماذکر )) [1].

واتە: ئەی خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکان (جولەکە و گاور) ئێوە چۆن تانەو تەشەر لە دینی ئێمە دەدەن لە کاتێکدا کە دینەکەمان بریتیە لە یەکتاپەرستی خوای تاك و تەنها و نە پەرستنی هیچ شتێك غەیری ئەو !!

پاشان (قرطبي) دەفەرمێت: ((ولما نزلت هذة الایة قال المسلمون لهم: یا إخوة القردة و الخنازیر فنکسوا رؤسهم إفتضاحاً...)) [2]

واتە: کاتێك ئەم ئایەتە لەسەر جولەکە هاتە خوارەوە، مسوڵمان –واتە هاوەڵان– بە جولەکەکانیان دەووت: ئەی برا مەیمون و بەرازەکانمان، ئەوانیش لە شەرمەزاری دا سەریان دادەخست.

شاعیریش دەڵێت:

---

١- تفسیر القران العظیم (ابن کثیر) ج(١) ص(٥٣٠).

٢- الجامع الاحکام القران: قرطبي : ج(٦) ص(٢٣٦).

فلعنـــة الله علـــى اليهـــود         إن اليهـــود إخـــوة القـــرود[1]

واته:

ئـەفرینی خـوا لەسـەر جولەكـە         بەڕاسـتی جولەكـە بـرای مـەیمونن

**خەسڵەتی هەژدەهەم:**

دوژمنایـەتیان لەگـەڵ ئـەمینی ئاسمانـەكان و هێنـانی وەحـی بـۆ سـەر دڵـی بێگەردی پێغەمبەران (جوبرەئیل و میكائیل) هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾ البقرة: ٩٧ – ٩٨

واتە: ئەی (محمد) پێیان بڵێ: هەركەسێ دوژمنی جوبرەئیلە (بابزانێ) كە هەر ئەو جوبرەئیلەیە كە بەفەرمانی خوا ئەو قورئانەی دابەزاندۆتە سەر دڵت كە كتێبە پێشوەكان بەڕاست دادەنێ و ڕێگە نیشان دەریانە بۆ (چاكە) و مژدە بەخشە بە باوەڕداران، ئەو كەسەی دژایەتی خوا و فریشتەكانی و پێغەمبەرەكانی و جوبرەئیل و میكائیل بكات، ئەوا با دڵنیا بێت كە خواش دوژمنی بێ باوەڕانە.

هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتە بریتی بوو لـەوەی كـە (جولەكـە) كـان وتیـان بـە پێغەمبەر: ((إنه ليس نبي من الانبياء إلا ياتيه ملك من الملائكة من عند ربه بالرسالة و بالوحى فمن صاحبك حتى تتابعك؟! قال (جبريل) قالوا: ذاك الذي ينزل بالحرب و بالقتال، ذاك عدونا ! ! لو قلت: ميكائيل الذي ينزل بالقطر و باالرحمه تابعناك) )[2]

واتـە: هـیچ پێغەمبـەرێك نـەبووە لـە پێغەمبـەران، مەگـەر فریشـتەیەك لەلایـەن خواوە نامەو، وەحی بۆ هێناوە، ئەو فریشـتەیەی كـە هاوڕێیەتـە كـێ یـە تاشـوێنت

---

١- الجامع لأحكام القران: قرطبي : ج(٦) ص(٢٣٦)

٢- الجامع لأحكام القران: قرطبي: ج(١) ص(٣٧).

بکەوین ئەی (محمد) ؟! پێغەمبەریش لە وەڵامدا فەرمووی: (جوبرەئیل) ئەوان لە وەڵامی پێغەمبەردا وتیان: جوبرەئیل بوو کە ئایەتەکانی لە دژی ئێمە ناردە خوارەوە بە جەنگ وکوشتنمان، ئەوە دوژمنمانە!! ئەی (محمد) گەر بت وتایە (میکائیل) ە کە باران و ڕەحمەت دەبارێنێ ئەوا شوێنت دەکەوتین....

بەڵێ جولەکەی بەدکار تەنانەت ڕقیشیان لە ئەمینی ئاسمانەکان و وەحی خوای گەورە بوو (چونکە) دەیان وت ئەو هۆکاری لابردنی پەردەیە لەسەرعەیب و هەڵەکانمان و ئایەتی جەنگ دێنێ لە دژمان.

## خەسڵەتی نۆزدەهەم:

بەرپا کردن و دژایەتی سەختیان لەگەڵ پێغەمبەران و هەوڵی کوشتن و ناشرین کردنیان بە هەموو جۆرێك، یەکێکی ترەلە خەسڵەتە گەندەڵەکانیان.جولەکەی بەدکار جیاواز لەناو گەلان و خاوەن دینەکاندا ڕاو بۆچونی زۆر دوژمن کارانەو کفر ئامێزیان هەیە دەربارەی بەرێزترین و بەرزترین دروست کراوی خوا کە پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لەسەر بێت) ئەویش بەم جۆرە:

### * وەسفی ئادەم لەلای جولەکە و کتێبە دەستکاری کراوەکانیاندا:

لە (سفر التکوین) دا باس لە سەرپێچی ئادەم دەکات کە لە بەهەشتدا ئەنجامی داو لە بەری ئەو درەختەی خوارد کە قەدەغەکرابوو لەسەری، بەڵام باس لە تەوبەی ئادەم ناکات کە پەشیمان بویەوە دواتریش خوا لێ ی خۆش بوو...بەڵکو لە(سفر التکوین) دا باس لەوە دەکات کە خوا نەفرینی لە ئادەم کردوو خەشم و غەزەبی خۆی داباراند بەسەریاندا.

لە (تەلمود) یشدا جەخت لەسەر ئەوە کراوەتەوە کە شەیتانەکان لە نەوەی (ئادەم) ن.پاشان (تەلمود) لە وەسفی ئادەم دا دەڵێت: ((خوا ئادەمی دروست کرد، دوو ڕووی هەبوو، لە ڕویەکیانەوە پیاوو لەوەی تریانەوە ژن، پاشان ئادەمی کردە دوو بەشەوەدرێژیەکەی دەگەیشتە ئاسمان، کاتێك ئادەم دەخەوت سەری لای خۆرهەڵات و قاچەکانیشی لای خۆرئاوا بوو، پاشان خوا وزەیەکی دابووە ئادەم لە

بینین دا کە تەواوی دنیای پێ سەیر دەکرد، بەلام دوای ئەوەی سەرپێچی لە فەرمانی خوا کرد، خوا دەستێکی دا بەسەری (ئادەم) دا و کەپسی کردوو بچوکی کردەوە وەك تەواوی مرۆڤەکانی تر، وە لەو کاتەوە دەری کرد لە بەهەشت کە سەعات (١٢) بوو.) )[١]

* دەربارەی یەکەم نێردراو (رسول) (نوح) "علیه السلام" دەڵێن:

لە(سفر التکوین) دا باس لە (نوح) بەم جۆرە دەکات و دەڵێت: ((لە سەرەتادا نوح کەسێکی جووتیار بوو، خەریکی کشتوکاڵ و ئاودێری بوو، پاشان عارەقی دەخوارد تا تەواو سەرخۆش بوو، دوای سەرخۆش بوونەکەی هیچی لەبەردا نەما و عەورەتی دەرکەوت (حام) ی کوڕی کە (بەباوکی کەنعان) ناو دەبرێت، عەورەتی باوکی بینی و پاشان بە براکانی وت، دواتر دوو کوڕەکەی تری نوح (سام و یافث) پارچە قوماشێکیان هێناو دایان بەسەر عەورەتی باوکیاندا و دایان پۆشی.کاتێك نوح هۆشی هاتەوە بە خۆیدا و زانی چی بەسەر هاتووە، نەفرینی لە (حام) کردوو دەستخۆشی لە دوانەکەی تر کرد......) )[٢].

* دەربارەی باوکی پێغەمبەران (إبراهیم) دەڵێن:

((إبراهیم) کابرایەکی درۆزن بووە و مامەڵەی بە داوێنی خێزانەکانیەوە کردووە!!!)

* دەربارەی پێغەمبەر (لوط) دەڵێن:

لە (سفر التکوین) دا بەم جۆرە باس لە پێغەمبەرێکی داوێن پاك و خاوەن قەدری وەك (لوط) بەم جۆرە دەکات ودەڵێت: ((لوط ودوو کچی سەرکەوتن بەسەر چیایەکدا و لەوێدا جێگیر بوون، کچە گەورەکەی بە خوشکە بچوکەکەی وت: باوکمان لێرەیەو پیاویشی لێ نیە کە بێتە لامان و کاری سەرجێگەیمان لەگەڵدا بکات!!؟! بۆ سەرخۆشی نەکەین و کاری سەرجێگەی لەگەڵدا نەکەین، ؟ هەر بۆ

---

١- التلمود شريعة بني آسرائيل : محمد البار : ص(٢٠).

٢- سفر التكوين : ٩: ٢٧: ٢٠

ئەو شەوە گەورەکەیان عارەقی دایە باوکی و سەرخۆشی کردوو کاری سەرجێگەی لەگەڵدا کرد، بۆ شەوی دوابیان بچوکەکەیان هەمان کاری لەگەڵ باوکیدا ئەنجام دا، سەرئەنجام (لوط) بەم کارانەی نەزانی و هەردوو کچەکەی سکیان لە باوکیان پڕ بوو، لە گەورەکەیان منداڵێکیان بوو بە ناوی (موآب) !! لە بچوکەکەشیان منداڵێکی تریان بوو....) )[1].

پاك و بێگەردی بۆ خواو پاشان بۆ پێغەمبەرە داوێن پاکەکانی، ئەمە گەورەترین بوهتانە کە بۆ ئەو پێغەمبەرانە دەکرێت لەلایەن جولەکەی داوێن پیسەوە!!!

ئەمە ڕەوشتی کەسانێکە کە خاوەنی هیچ قیەم و ڕەوشتێکی مرۆڤانە نین !!دەی چۆن دەگونجێت پێغەمبەرێك کاری وا ئەنجام بدا لەگەڵ کچەکانی خۆیدا، لەکاتێکدا هەردوو کچەکەی (لوط) "علیهم السلام" بریتی بوون لەوانەی کە ڕزگاریان بوو و لە گرۆهی بێ باوەڕان و سەرپێچی کاران نەبوون[2] !!

### * وەسفی (یعقوب) لە تەوراتی دەستکاری کراودا:

تەوراتی دەستکاری کراو زۆر بەناشرینی و نادروستی وەسفی پێغەمبەری مەزن و پایە بەرز (یعقوب) بەم جۆرە دەکات و دەڵێت: (("یعقوب" کەسێکی لاواز و فێڵ باز و درۆزن و ساختە کارو ڕیاباز بوو بەو ئەندازەیەی (٧) جار کڕنوشی بۆ براکەی برد....) )[3].

### * وەسف کردنی (موسا و هارون) لە تەوراتی دەستکاری کراودا:

مرۆڤ کاتێك دەقە ڕەش و تاریکەکانی تەلمود و تەوراتی دەسکاری کراوی جولەکەکان دەخوێنێتەوە، دەربارەی سەرجەم مەسەلەکان بەگشتی و باس و خواسی پێغەمبەران بەتایبەتی، تووشی شەرمەزاری وخەجالەتی دەبێت!! پاشان

---

١- سفر التكوين(١٩) ٣٧: ٣٠.

٢- من اليهودية الى الصهيونية : د. أحمد السمحراني ص(١١٣).

٣- المدخل لدراسة التوراة و العهد القديم : محمد علي البار : ص(٥٣).

تیٚ دەگات کە ئەم گەلە کە دوا پلەکانی بیٚ ڕەوشتی و بیٚ ئەدەبی و بیٚ باوەڕیان بڕیووە و هیچ مانایاکیان بۆ پیرۆزیەکان نەهێشتۆیەوە. ! !

(موسا وهارون) ڕزگارکەری جولەکە لە دەستی چەپەڵی فیرعەون و ئازاد کردنیان بەتەواوی مانای ئازادی، باڵام لە بەرامبەردا موسا و هارون بەخیانەتکار و هارون بەتایبەتی دروستکەری گوێرەکە دەزانن بۆ مەبەستی فێرکردنی بەنی إسرائیلەکان بە گوێرەکە پەرستی! ! ! !

لە (سفر الخروج) دا باسی هارون بەم شێوەیە دەکات و دەڵێت: ((هو الذي صنع العجل و دعا بني إسرائيل لعبادته...)) .

واتە: هارون بوو کە گوێرەکەکەی دروست کرد بۆ بەنی إسرائیلیەکان و بۆ پەرستنی...

* وەسف کردنی (داود) بەداوێن پیسی و غەدرو خیانەت؟!

* وەسف کردنی (سلێمان) بە بت پەرستی و شەیدا بوون بۆ ئافرەت؟!

پوختەی وتە لەم بارەوە:

هیچ گومان لەوەدا نیە کە پێغەمبەران سەرجەم بە کۆو بەبیٚ جیاوازی هەڵبژاردەی خوای تاك و تەنها بوون و پاکترین و بەڕێزترین مرۆڤ بوون لەناو مرۆڤەکاندا و هەڵبژاردە بوون لە کۆمەڵگاکانی خۆیاندا.

* پێغەمبەران سەرمەشق و ڕابەر و پێشەوا و پێشەنگ بوون لە سەرجەم کارە چاك و باشەکاندا و بەڵگەی خێر بوون بۆ گەلەکانیان.

* پێغەمبەران لە هەموو کەس زیاتر ترسی خوای گەورە لە دڵەکانیاندا بووە و شەرم و حەیایان لە خوای خۆیان کردووە.

* پێغەمبەران هیچ کات توخنی خراپەو کاری نابەجی نەکەوتون و پەنایان بۆ کاری لارو خوار نەبردووە چونکە پەروەردە کراوی دەستی جوبرەئیل بوون و بەردەوام وەحی بۆ هێناون.

* قسەی جوان و دادپەروەری وراست گۆی وپەیمان داری و سۆز و بەزەی و یارمەتی و سەرجەمی ڕەوشتە بەرزەکان، ڕەوشتی دیارو بەرچاوی پێغەمبەران بووە و لەوانەوە سەرچاوەی گرتووە بۆ کەسانی تر.

* کاری سەرەکی پێغەمبەران بریتی بووە لە ئاشنا کردنی (خوا) بە خەڵکی دروستکردنی سۆز و خۆشەویستی لە نێوان (دروستکەر و دروست کراودا).

* پێغەمبەران لە هەموو کەس زیاتر بە گژی گەندەڵی و خراپەو چەوتی و بەدڕەوشتی و خوارو خێچیدا چوونەتەوەو لەم پێناوەشدا توشی دەیان و سەدان کۆسپ و سزای دەستی گەلە زۆردارەکانیان بوون، هەر لە لێدان دەربەدەر کردن وبوهتان بۆ هەڵبەستنو دواجار تیرۆر کردن وکوشتن.

* ئەوەی لە (عهد القديم) (تەوراتی) دەسکاری کراودا دەی خوێنیتەوە بەرامبەر بە پێغەمبەران تەنها دەتوانن لە بەرمبەریدا ئەوە بڵێن کە شەیتان هاتۆتە گۆو قسەی وەهای کردووە، چونکە سەرەکی ترین پەیامی پێغەمبەران بریتی بووە لە ناساندنی شەیتان و شەیتان ڕەفتارەکان تا لە شەڕیان بە دوور بن.

نمونەی ئەم بوختانەی ناو تەورات (عهد القديم) گەورەترین بەڵگەن لەسەر دەستکاری کردنو شیواندنی تەورات لەلایەن جولەکە بەدڕەوشتەکانەوە و (وەحی) خوا بەرییە لەم باسە و بوهتانە.

لە کۆتایدا ئەوە دەڵێم: ((گەر ئەمەی کە پێشتر باسمان لێوە کرد بیروباوەڕو سیفەت و خەسڵەتی ئەم گەلە نەفرین لێ کرا و بەد ڕەفتارە بێت، ئیتر چۆن متمانەیان پێ بکەین و باوەڕ بە بەڵێنە درۆینەکانیان بکەین و شوێن یان بکەوین؟!!

هەروەك قورئان دەفەرمێت: ﴿۞أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ۝٧٥﴾ البقرة: ٧٥

واتە: ئایا ئێوە ئەی گرۆهی باوەڕداران بەتەمان و ئومێدەوارن کە جولەکە ئیمان و باوەڕ بهێنن بە ئاینەکەی ئێوە؟!! لە کاتێکدا کە دەستەیەك لە

شارەزاکانیان گوفتاری خوایان دەبیست لە (تەورات) دا، پاشان دەست کاریان دەکرد، دوای ئەوەی کە تێکەیشتبوون و دەیان زانی ڕاستییەکە چیە!!!

### خەسڵەتی بیستەم:

شێواوی و دید لێڵی بیروباوەڕی جولەکە دەربارەی ڕۆژی دوای (یوم القیامة) یەکێکی ترە لە خەسڵەتەکانیان.جولەکە باوەڕی وەهایە کە پاداشتی کردەوەکان بەپێ ی جۆری کردەوەکەیە نەك بە پێ ی بیرو باوەڕ، هەروەك دەڵێن: ((اشهد السماوات و الارض على إنه سواء كان المرء يهوديا او وثنياً، رجلا او إمراة، حرا او مقيدا، فاءنه سينعم باالجزاء حسب اعماله دون سواها))

واتە: ئاسمانەکان و زەوی شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ پاداشت دەدرێتەوە بەپێ ی کردەوەی خۆی –نەك بە پێ ی بیرو باوەڕی چی بووە– جا ئەو کەسە کە پاداشت دەدرێتەوە جولەکەیە یان بت پەرستە یان پیاوە، یان ژن، یان ئازادە، یان بەندە، جیاوازی نیە..

گەر لەم ڕونگە بەتاڵەی ئەوانەوە سەرنجی پاداشتی ڕۆژی دوای بدەین ئەوا بێ گومان دووڕوان (المنافقين) لە پێش هەموو کەسانەوە دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکرێتەوەو ڕزگاریان دەبێت لە دۆزەغ، چونکە دووڕوان لە هەموو سەردەم و کاتێکدا نیشانی کردەوەی چاك و باشی خۆیان دەدەن و کفر و بەدکاری خۆیان دەشارنەوە.

لەلایەکی تر، گەر پاداشتی مرۆڤەکان تەنها بە سەیرکردنی کردەوەکانیان بێت!!کەواتە لێرەدا چ بەهایەك بۆ بیروباوەڕو مەبدەء و دەمێنێتەوە!! لەکاتێکدا کە بیروباوەڕ (العقيدة) لایەنێکی نادیارو شاردراوەیەو دووڕوی تێدا ئەنجام نادرێت چونکە (خوا) ئاگاداریەتی و بە نهێنیەکانی دەزانێ، بەڵام کردەوە درۆی شاخداری تێدا دەکرێت و دەگونجێت خراپترین کەس کردەوەی جوان نمایش بکات بۆ چەواشەی بەرامبەرەکانی!!!!.

لەم کاتەدا جولەکە باوەڕیان بە بیروباوەڕ (العقیدة) نیە بۆ هەڵسانگاندنی کەسایەتی تاکەکان و دەکرێت بڵێین جولەکەگەرای دینی کردەوەیە نەك دین و بیروباوەڕ.

هەر لەم ڕوانگەیەوە کە دەتوانین بڵێین، لە دینی جولەکەدا هێندە بەپێێن و ئاشکرا باس لە ڕۆژی دوای و پاداشت و سزا نەکراوە تەنها ئەوەندە نەبێت کە:

١.هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوەو لەزەت لە خۆشیەکانی نابات تەنها جولەکە نەبێت؟!

٢.حاخامەکانی جولەکە باوەڕیان وەهایە کە دۆزەخ سێ دەرگای هەیە: دەرگایەك لە وشکانی، دەرگایەك لەسەر دەریا، دەرگایەکیش لەلای اورشلیم، جا حاخامەکانی باوەڕیان وەهایە کە ئاگری دۆزەخ دەسەڵاتی بەسەر بەنی إسرائیلیەکان و قوتابیەکانیان دا نیە....)) [١]

٣.ڕۆژی دوای لەلای جولەکە نەخۆشی بەردەوامە و نەناخۆشی بەردەوام.

٤.مردن لەلای ئەوان وەك ئاوی ناو پەرداخ وەهایە دەڵێن ڕۆح جارێکی تر ناگەڕێتەوە ناو جەستەی مردووەکە (بێ گومان ئەمە بیر وباوەڕی هەندێکیانە).

٥.ئاگری دۆزەخ دەستەڵاتی بەسەر جولەکەدا نیە و ئەوان دوورن لێوەی.

٦.(مسوڵمانان و گاورەکان) بە هەتاهەتای لە ئاگردا دەمێننەوە.

٧.بایەخدان بە دنیا گەورەترین مەبەستە لەلای جولەکە.

---

١- التلمود شريعة بني اسرائيل –حقائق و وقائق– محمد صبري : ص(٢٢).

## کۆمەڵ و لایەنەکانی جولەکە (الفرق الیهودیة)

بێ گومان شوێن کەوتەکانی دینی جولەکە بە حوکمی ڕاوبۆچوونی هەڵسەنگاندنیان بۆ مەسەلە دینی و تەشریعی و سیاسیەکان بوونەتە چەندین کۆمەڵ و بەشەوە کە گرنگترین و لە بەرچاوترینیان ئەمانەن:

**١. السامریون:**

هۆکاری ناودار بوونی ئەم کۆمەڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ شاری (سامرە) ی عێراق، کە لەسەردەمی خۆی لەوێدا ژیاون، هەروەها ئەم کۆمەڵەیە ناوی تریشیان هەیە، بەناوی (بنوا إسرائیل) یان (بنوا یوسف)[١].

(سامریاکان) باوەڕیان وەهایە کە تەنیا ئەمانن لەسەر دینی ڕاستی موسا ماونەتەوە. دەکرێت بیرو باوەڕی سامریەکان باس بکەین لەم چەند خاڵەدا:

أ–باوەڕیان بەیەکتا پەرستی خوا هەیە.

ب– باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی موسا هەیە و بە دواین پێغەمبەری دەزانن.

ج–باوەڕیان بە تەورات هەیە کە وتەی خوای گەورەیە.

و– باوەڕیان بەوە هەیە کە چیای (جرزیم) لە (نالبس) قبلەی راستەقینەی جولەکەیە.

هـ– باوەڕیان بە ڕۆژی دوای هەیە و پێ ی دەڵێن (یوم البعث).

و– باوەڕیان بە هاتنەوەی عیسا ڕزگارکەر هەیە[٢].

ن– باوەڕیان وەهایە کە تەورات بە زمانی ئەمانە نەك زمانی عبری[٣].

ح– سامریەکان کۆنترین بەش وکۆمەڵی جولەکەن و کەمترین ژمارەیان هەیە[٤].

---

١، ٢. ادیان و فرق : د. أمین القضاة ص(٥٤).

٣،٤. الیهودیة : عقیدة و شریعة : د. اسعد السمحراني ص(٥٤).

٥. ادیان و فرق : ص(٥٦).

١– موسوعة الادیان : ص ١٧٦

٣– هەمان سەرچاوە.

٤– هەمان سەرچاوە

**٢. (الفريسيون) يان (الربانيون):**

ووشەی (فەریسیون) بەمانای گۆشەگیر (المنعزل) دێت وە ئەم بزوتنەوە بۆ یەکام جار لە سالیّ(٢٠٠) ی پێش زاین دا دەرکەوت[1].

نازناوی ئەم کۆمەڵەیە لەنێوان خۆیاندا بە(حسیدیم) ی عبری ناو دەبەن کە مانای (لەخوا ترس و لە گوناهـ پارێز) دێت.

- **بیروباوەڕی فەریسیەکان:**

أ- فەریسیەکان باوەڕیان وەهایە کە تەورات بەتەنها کتێبی پیرۆزی ئەوان نیە، بەڵکو لەگەڵ تەورات دا چەندین ڕیوایەتی شەفەوی تریش هەیە لەگەڵ ئامۆژگاری و تەفسیری تر.

ب- فەریسیەکان باوەڕیان وایە کە زاناکانی جولەکە (الحاخامات) دەسەڵاتی رەهایان هەیە پاشان بێ گەردو بێ هەڵەن و تاوان ناکەن واتە (معصومن) و سەرجەمی وتەکانیان لە خواوە سەرچاوەی گرتووە، هەربۆیە سەرپێچی کردنی حاخامەکان سەرپێچی کردنی خوایە ! ! هەروەك دەڵێن:

((ویلتزم المؤمن بأن یعتبر آقوال الحاخامات کاالشریعة، لان اقوالهم هی قول الله الحی، فاءذا قال الحاخام إن یدك الیمنی هی الیسری و بالعکس، فصدق قوله ولا تجادله...) )[2].

واتە: پێویستە بڕواداران-لەلای جولەکە- قسەی حاخامەکان وەك شەرع سەیربکات چونکە قسەی ئەوا یانی قسەی خوای زیندوو، ئەگەر یەکێ لە حاخامەکان وتی: دەستی ڕاستت چەپە یان بەپێچەوانەوە، ئەوە قسەکەی بەڕاست بزانەو دەمە دەمەی لەگەڵ دا مەکە ! ! !

ج-باوەڕیان بەنەمری دەروون و زیندو بوونەوەی لاشە هەیە.

د- باوەڕیان بەتەواوی تەورات و تەلمود هەیە.

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢ - ادیان و فرق(٦٠).

هـ-باوەڕیان بە سەرجەم پێغەمبەرانی دوای موسا هەیە.

و- باوەڕیان بە خوای گەورە و پاشان بە بوونی (شەیتان) هەیە.

م- باوەڕیان بەوە هەیە کە کردەوەی مرۆڤەکان کار قەزاو قەدەر دەکات و دەیان گۆڕێت[1].

ن- فەریسیەکان بەتەنها کۆمەڵێکی دینی نین بەڵکو حیزبێکی سیاسیشن.

**٣. الصدوقیون:**

یەکێکی تر لە تیرەو کۆمەڵەکانی جولەکە پێیان دەوترێت (الصدوقیون).نەسەب و هۆکاری ناو هێنانی ئەم کۆمەڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك بەناوی (صادوق) لەسەردەمی (داود) و (سلیمان) پێغەمبەردا.

بیروباوەڕی (صدوقیەکان) بەم جۆرەیە.

أ-باوەڕیان بە زیندوو بوونەوەی مردووەکان نیە لەناو گۆڕەکاندا.

ب-باوەڕیان بە تەلمود نیە وإینکاری لیّ دەکەن[2].

ج-باوەڕیان بە پاداشت و تۆڵەی ڕۆژی دوای نیە.

د-باوەڕیان بە بوونی فریشتەو پەری نیە (الجن و الملائکە).

هـ-تەنها باوەڕیان بە تەوراتە!!

و- قەزاو قەدەر بەرپەرچ دەدەنەوەو باوەڕیان پیّ ی نیە.

ئەم کۆمەڵەیە بەتەواوی مانا بیّ دینن و بیروباوەڕی بەناو ڕۆشنبیریەکان و چینە دەوڵەمەنەکانی جولەکەن...

**٤. القراءون یان (العنانیون):**

نەسەبی ئەم کۆمەڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ (عنان ی کوڕی داود)، ئەم کۆمەڵەیە لە کۆتاییەکانی سەدەی (٨) ی زاین لە عێراق دەرکەوتن و کۆمەڵێکی کەمن لەناو جولەکەکان دا.

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢- المسوعة المسیرة في الادیان و المذاهب المعاصرة: ص(٥٦٨).

بیروباوەڕی ئەم کۆمەڵەیە:

أ-باوەڕبوون بەوەی کە لە (عهد القدیم) (تەورات) دا هاتووە.

ب-باوەڕ نەبوون بە تەلمود و هێرش کردنە سەر دەقەکانی.

ج-یەکسانی دەکەن لە نێوان نێر و مێ دا لە میرات دا.

د-لە بواری خواردن داماسیو کولله ناخۆن.

هـ- باوەڕیان بە عیسا هەیە ودەڵێن لە تەورات دا باسی هاتووە.

**٥. المتعصبون:**

یەکێکی تـرە لـە کۆمەڵـەکانی جولەکـە و بیروباوەڕیـان زۆر نزیکـە لـە کۆمـەڵی فەریسیەکان.

بیروباوەڕی ئەم کۆمەڵەیە:

أ-باوەڕیان بە مەسحی چاوەڕوان کراو هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی.

ب-خوێن گەرمی زۆریان تێدایە بۆ نیشتیمان.

ج-خاوەنی هیچ لێ بوردنێك نین و بە تەواوی مانا توند ڕەون.

د- مردن لای ئەمانە باشتر و لە پێشترە لە گوێڕایەڵی کردنی غەیری جولەکە.

**٦. الکتبة:**

یەکێکی ترە لە کۆمەڵەکانی جولەکە و بۆیە ناو نـراون بـەم نـاوە چـونکە کـارو پێشەیان بریتیە لە نوسینەوەی شەریعەت بۆ هەرکەس کە خوازیاری بێت.

هەروەها یەکێکی تر لە کارەکانیان بریتیە لە وتاردان بۆ ئەوانەی کە گوێیان لێ دەگرن.نوسین و وتاردان باشترین هۆکارە بەدەستی ئەم کۆمەڵەیەوە بۆ بەدەست هێنانی پارەو ماڵی خەڵکی.

**٧. السبئیة:**

ئەم کۆمەڵەیان شوێن کەوتەی (عبدالله ی کوڕی سەبەئن) کە (عبدالله) هاتە ناو ئیسلامەوە بەشێوەیەکی دووڕوی و ویستی وەها بووکە لەناوەو بەنهێنی إسلام

لەناو بەرێت، هەر ئەمە بوو -عبدالله- کە شۆڕشی دژ بە (عثمان) ی کوڕی عەفان -ڕاگەیاند و فیتنەی دروست کرد لەو دەمەدا، عبدالله دەستێکی باڵای هەبوو لە دروستکردنی حەدیسی درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە[1]...

٨. اليهودية الاصلاحية:

ئەم کۆمەڵەیە لە دژی ئەو کۆمەڵە جولەکانە دروست بوون کە فەسادو بەدکاریان دروست کردبوو، ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوو لە چاکردنەوەی ئەو خراپانەی کە لەلایەن کۆمەڵەکانی تری جولەکەوە دروست کرا بوون-بەحسابی خۆیان-.

ئەمانە بانگەشەی چاکە خوازیان بریتی بوو لە:

أ-لابردن و سڕینەوەی ئەو نوێژەی کە مۆرکی نەتەوەی جولەکە بوو، پاشان گۆڕینی زمانی عبری نوێژ بە زمانی ئەڵمانی.

ب-دانانی موسیقاو سرودی بەکۆمەڵ لەناو نوێژدا!! پاشان ڕێگەدان بە تێکەڵاو بوونی هەردوو چینی نێر و مێ لە نوێژدا.

ج-هەڵسان بەئەنجامدانی و دروست کردنی خانوویەك بۆ پەرستن، و ناونانی بە (الهيكل) مەبەستیشیان لەم کارە بریتی بوو لە قوڵ کردنەوەی خۆشەویستی جولەکە بۆ ئەو نیشتیمانەی کە تیایدا دەژین.

٩. اليهودية الارثوذكسية:

بیروباوەڕی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوو لە:

أ-باوەڕبوون بەوەی کە تەورات وتەی خوایە و گەر تەورات نەبوایە بوونی جولەکە لەسەر زەویدا وەك گەل نەدەبوو.

ب-باوەڕ بوونی تەواویان بە تەلمود و بەشەکانی.

---

١- الموسوعة الميسرة في الاديان و المذاهب المعاصرة: ص(٥٦٨).

٢. اديان و فرق ص(٦٨).

ج-باوەڕی تەواویان بەوە هەیە کە جولەکە (شعب الله المختار) ە،

د- زمانی نوێژ لای ئەوان (عبریە) و ڕێگا بە تێکەڵ بوونی دوو ڕەگەز نادەن.

١٠. اليهودية المحافظة:

یەکێکی ترە لە کۆمەڵەکانی جولەکە و گرنگترین بیرو باوەڕیان بریتیە لە

أ-باوەڕیان بە تەلمود نیە و بە دروستکراوی حاخامەکانی دەزانن.

ب-بانگەشەی گەڕانەوەو هیوا دەکەن بۆ خاکی فەڵەستین.

ج-دەڵێن دەبێت نوێژەکانمان بە زمانی عبری بێت نەك زمان تر.

١١. القبالة:

١٢. ناطوري كارتا:

١٣. زيوي و يهود الدونمة:

# بەندی چوارەم

## تەشریع لە دینی جولەکە دا

پێش ئەوەی باس لە تەشریع و یاسا جۆراو جۆرەکان بکەین لە دینی جولەکەدا پێویستە پێناسەیەکی خێرا بۆ وشەی تەشریع بکەین لە رووی زمانەوانی و پاشان زاراوەییەوە، یا زیاتر تێبگەین و ئاشناش ببین لە مەبەستەکانمان.

شەریعەت لە زمانەوانیدا بە مانای (المذهب و الطريقة المستقيمة) دێت:
واتە: مەزهەب و رێگەی راست یان (نهج او وضح و بين المسالك) کە ئەویش بە واتای: بەرنامە و رون کاری و رێ رۆشنی دێت[1].

لە رووی زاراوەی زانایانیشەوە بە مانای((سن القوانين و تبيينها) ) واتە: دانانی یاسا و رونکردنەوەی، یان (هو التزام العبوديه) واتە: پەیوەست بوون بە بەندایەتیەوە مانی دێت[2] .

یان ((ماشرع لعباده من الدين أي من الحكام المختلفة، سميت هذة الاحكام شريعة))[3]

واتە: دانانی بەرنامەی دین بۆ بەندەکانی لەلایان خواوە، بەدانانی ئەو یاسایانەی کە جێ ی جیاوازین، ئەمان ناودەبرێن بە یاساکانی شەریعەت.

((شەریعەتو دین و (ملة) سەرجەم بەیەك مانا دێن و بە هەمووشیان دەوترێت شەریعەت[4]...

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی(شەرع) یان (شەریعەت) بریتین لە کۆمەڵە یاسایەك کە خوای گەورە دایناوەو دەربارەی سەرجەم بوارەکانی (حەڵاڵ–حەرام–بوارەکانی

---

١– المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية : د. عبدالكريم زيدان.

٢– الاسلام و اليهودية : ص ٣٩٩.

٣– المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية.

٤– الاسلام و اليهودية : ص ٣٩٩.

یاسایی و بواری کەسێتی – تاوانەکان – سزاکان – خێزان – میرات – زەواج – تەلاق – پاك و خاوێنی – عیبادەتەکان – زەکات – شەعائیرەکان – جەژنەکان...... ).

لەم ڕوانگەیەوە دەکرێت بوارەکان جیا بکەینەوە و هەر مەسەلەیەك بە شێوەیەکی سەربەخۆ باس بکەین لە دینی جولەکەدا، کە ئەوانیش لە چەند خاڵێکدا کۆبکەنەوە:

## خاڵی یەکەم: ئەو یاسایانەی کە پەیوەستن بەعیبادەتەکانەوە

عبادەت مانایەکی گشت گیری هەیە و بریتیە لە ملکەچ بوون و پەیوەست بوونو خۆ بەکەم زانین بۆ خوای باڵادەست[1].

**عبادەت ئەم چەند خاڵە دەگرێتەوە:**

**١. پاك و خاوێنی (الطهارة)**

پاك و خاوێنی (الطهارة) لای جولەکەکان بەزمانی (عبری) پێ ی دەوترێ (طهوراة) و لەبەرامبەریشدا وشەی ((طماة) ) هەیە، کە بەمانای پیسی (النجاسة) دێت[2]...

**پاك وخاوێنی لە یاسای جولەکەدا دوو مانای هەیە:**

**مانای گشتی:** کە ئەمیش بریتیە لە جێ بە جێ کردنی یاساکانی شەریعەت، تەورات زۆر بە ئاشکرا باسی لەم بوارە کردووە و ناوی ناوە پاك و خاوێنی و پیرۆزی (الطهارة والقداسة) ئەویش بەوەی کە دەڵێت:

((فتتقد سون و تكونون قديسين لاني أناقدوس) )[3]

واتە: پیرۆز بن و ببنە پیرۆز چونکە من پیرۆزم.

**مانای تایبەتی بۆ پاك و خاوێنی:** بریتیە لە پاککردنەوەی جل و بەرگ و شۆردنی لاشە و پاك ڕاگرتنی لە هەموو پیسییەك[1].

---

١- المصباح المنير في غريب الشرح الكبير –للرافعي

٢- موسوعة الاديان ج(٥) ص(٢٤٣).

٣- دلالة الحائرين – موسى بن ميمون (ص٦٠٣).

* مانای پیسی (النجاسة) ش بریتە لە: سەرپێچی کردن لە فەرمانەکانی شەریعەت و دورکەتنەوە لە شتە نادروستەکان...((ئەوەی پێشتر باسمان کرد لە مانای پاك و خاوێنیو مەبەستەکانی لە شەریعەتی جولەکەدا، دەتوانین بڵێین-ئەمڕۆ جولەکە بەتەواوی مانا دوور کەوتونەتەوە لەم بوارەدا چ لە رووی ناوەو چ لە رووی دەرەوەیان دا ئەویش بە حوکمی دەستکاری کردن وشێواندنی تەوراتەوە، پاك و خاوێنی لە دینی جولەکەدا پەیوەستی بەم چەند خاڵەوە هەیە کە بریتین لەمانە.

ا- الجماع: بەمانی بەیەك گەیشتنی ژن و پیاو کاری سەرجێگەی، لە شەریعەتی جولەکەدا هەرکات ژن و پیاو کاری سەجێگەییان کرد، ئەوا پێویست دەبێت لەسەریان خۆیان بشۆرن بە ئاو.[2]

ب- الحیض: بریتیە لە سوڕی مانگانەی ئافرەت و لە شەریعەتی جولەکەدا زۆر بەئاشکرا خۆ شۆردنی بۆ ئافرەتەکە پێویست نەکردووە، بەڵکو ئەو پیاوە خۆ شۆردنی لەسەرە کە دەچێتە لای ئافرەتێك کە لەسوڕی مانگانەدایە.

ج- الاحتلام (شەیتانی بوون) : بریتیە لە دەرچونی شلەی مەنی لە زەکەری پیاو بەبێ ئەوەی دەستەڵاتی خۆی تێدا بێت ئەویش لە خەودا.ئەمانیش لە شەریعەتی جولەکە دا پێویستە خۆیان بشۆرن تەنانات ئەوانەی کە جولەکەش نەبوون لە کۆنداو ئەم حاڵەتەیان بەسەردا هاتووە خۆیان شۆردووە، کە بێ گومان مصریە کۆنەکان بوون[3].

د- النفاس (منداڵ بوون) : بریتیە لە حاڵەتی دوای منداڵ بوونی ئافرەت.

لە(سفر التکوین) دا باسی لەم حاڵەتەی ئافرەت کردووە و بە پیسی دەزانێت هەروەك چۆن لەحاڵەتی حەیزدا بە پیسی زانیوەو خۆ شۆردنی لەسەر پێویست کردووە.

---

١- سفر اللاويين.

٢- الاسلام و اليهودية : ص ٢٣٢

٣- السنن القيوم

و- دەست دان لە مردوو : (جا مرۆڤ بێت یان ئاژەڵ، یان دەست دان لە شتە پیسەکان یان دەست دان لەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان ناخورێت، ئەمانە سەرجەم بەکۆ دەبێت ئەو کەسەی کە ئەمانەی ئەنجام داوە یان یەکیانی ئەنجام داوە خۆی بشوات)

یەکێکی تر لەو شتانەی کە لە شەریعەتی جولەکەدا پێویستی بە خۆشتن هەیە بریتیە لە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو یان گۆشتی ئاژەڵە ڕاوکەرەکان هەروەك لە سفر التكوين دا هاتووە: ((وكل إنسان اكل ميتة او فريسة يغسل ثيابة و يستحمم بماء ويبقي نجسا ألي المساء، ثم يكون طاهر) )[1]

واتە: هەموو مرۆڤێك کە مردارەوە بووی خوارد یان ئاژەڵی ڕاوکەری خوارد دەبێت بەرگ و پۆشاکی بشوات بە ئاو، دواتر دەمێنێتەوە بەپیسی تا شەو پاشان پاك دەبێتەوە.

## ٢. نوێژ کردن لە شەرعەتی جولەکەدا:

سەرەتا نوێژ کردن لەسەرجەم دینە ئاسمانیەکاندا بە گەورەترین عیبادەت هەژمار دەکرێتو کاری سەرەکیو لە پێشینی هەموو پێغەمبەران بووە "علیهم السلام").

بەڵێ باسکردنی (نوێژ) لە شەریعەتی جولەکەدا هەروا کارێکی سانا نیە، چونکە بە چەند قۆناغدا تێپەڕیوەو شتی زۆری بۆ زیاد کراوە و لە بەرامبەریش دا شتی زۆری لێ کەم کراوەتەوە، هەروەها لە ناو کۆمەڵەو لایەنەکانی جولەکەدا جیاوازی زۆر هەیە لەم بارەیەوە.

نوێژ لە زمانی عبریدا (تفیلاە) ناونراوە بە مانای (سزادانی خودی خۆت) (تعذيب الذات) و دەرخستنی ملکەچی دێت[2] ...

---

١- سفر اللاويين

٢- موسوعة اليهود و اليهودية : عبدالوهاب المسيري ج(٥) ص (٢٢٦).

نوێژ لە شەریعەتی جولەکەدا بە دەیان قۆناغدا تێ پەڕیوە و بەتەواوی مانا لەسەر شکڵ و شێوازی خۆی لای داوە، لەسەرەتادا نوێژی جولەکە بریتی بوو لە قوربانی بەخشین، کاتێك کەسێکیان بیویستایە نوێژی بکردایە بۆ مەبەستی سوپاس کردنی خوا، قوربانیەکی پێشکەش دەکرد، وە ئەگەر کەسێك بیویستایە نوێژ ئەنجام بدات بۆ مەبەستی لێ خۆشبوونی تاوانەکانی دووبارە قوربانیەکی ئەنجام دەدا[1]..

نوێژ لای جولەکە دوو جۆری هەیە جۆرێکاین پێیان دەوترێ نوێژی تاکە کەسی (فردي) کە ئەمەش هەموو کەسێك بەتەنها و لە کاتی دیاری کراوی خۆیداو لە مناسەبەی دیاری کراودا ئەم نوێژەیان ئەنجام دەدا.

جۆری دووەمیان بریتیە لە نوێژی بە کۆمەڵ (جماعي) ئەویش لە کەنیسەدا، جولەکە ئەم نوێژەیان بە کۆمەڵ ئەنجام دەدەن و لە (١٠) کەس کەمتر نین و لە (١٣) ساڵ گەورەترن، پاشان گەورەی و فەزڵی نوێژی بە کۆمەڵ لای ئەوان زیاترە لە نوێژی تاك[2].

لە یاساکانی شەریعەتی جولەکەدا نێرینە کە تەمەنی گەیشتە (١٣) و مێ ینە کە تەمەنی گەیشتە (١٢) ساڵ، ئەوە گەیشتونەتە تەمەنی باڵغ بوون و تەکلیفی شەرعیان لەسەر واجب دەبێت، لەم کاتەدا بە نێرینە دەوترێت ((البار متسفاه) ) و بە مێ ینەکەش دەوترێ ((البات متسفاه) ) ئەوەش بۆ ئەوەی کە بۆ یەکەم جار تەورات بخوێنرێ بەسەریاندا[3]..

---

١- الاسلام و اليهودية : ص (٢٦٣).

٢- اليهودية (د. عبدالمجيد ، ص(١٤٩).

٣- التعريف على الديانة اليهودية.

**جولەکە لە ڕۆژێکدا سێ جار نوێژ دەکەن، کە بریتین لە:**

أ-نوێژی بەیانی یان چێشتەنگاو کە بە زمانی عبری پێی دەوترێت (شحريت) کاتەکەشی لەو ساتەوە دەست پێدەکات کە خەتی سپێ و شین لە یەکتری جیا دەکرێتەوە تا کاتی هەڵهاتینی خۆر، ئەم نوێژە گەورەترین و گرنگترین نوێژە لایان[1] ..

ب- نوێژی نیوەڕۆ، ئەمیش دوای نیوەڕۆ ئەنجامی دەدەن بە کەمێك، کاتەکەشی بریتیە لە لادانی خۆر بەڕووی ڕۆژئاوا بوون دا تا پێش ئاوا بونی خۆر بە کەمێك، بەم نوێژەشیان دەوترێت (منحه)[2].

ج- نوێژی شەو کە بە (عربيت) بەزمانی عبری هاتووە، و کاتەکەشی نزیك کاتی نوێژی عیشای ئێمە دەکات[3].

**طقوسی نوێژیشیان بریتیە لە:**

أ- شوردنی هەردوو دەست و هەندێکیان لە بەناو دیندارەکانیان بەتەواوی جەستەیان دەشۆن.

ب- دانانی کڵاوێکی بچوك لەسەریان لە کاتی نوێژ کردن دا، چونکە لەسەر کردنی ئەم کڵاوەو داپۆشینی سەریان بە بڕوای خۆیان بەڵگەیە لەسەر ڕێز، بێ گومان لە کاتەکەنی تری وەکو خوێندنی تەورات یان یاد کردنی خوا یان پێشوازی کردنیان لە کەسانی خاوەن پلەو دەستەڵات، ئەم کڵاوە لەسەر دەکەن.

ج- لەکاتی نوێژیان دا ڕوو دەکەنە اورشليم (قدس) کە (قدس) قیبلەی ئەوانە.

د- لەکاتی نوێژ کردنیان دا پارچەیەك قوماشی سپی دەدەن بەسەر شانیان دا و (٨) چمکی هەیە، چواریان سپی و چوارەکەی تریشیان شینی ئاسمانیە.

---

١- اليهود عقيدة و شريعة ص(٨٠).

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- الفكر الديني اليهودي (ص(١٨١) د. حسن.

### ٢. ڕۆژوو لە شەریعەتی جولەکە دا: fasting

لە بەرامبەر وشەی (صوم) عەرەبی کە بەمانای ڕۆژو دێت، وشەی (تسوم) ی عبری هەیە و هەمان مانا دەگەیەنێت[1]...

ڕۆژو عبادەتێکی ڕۆحیەو خوای گەورە دایناوە لەسەر بەندە باوەڕدارەکانی کە ئەنجامی بدەن، کە بێگومان دەیان و سەدان حیکمەت و فەلسەفەی گەورە و گەرنگی تێدایە و یەکێکیان بریتیە لە ئازاد بوون ڕزگار بوون لە دەست هەوا و ئارەزووە شەیاتانیەکان.

لە هیچ دەقێك لە دەقەکانی تەورات و بە تایبەت (سفر اللاوین) دا وشەی (صوم) (ڕۆژو) بە ئاشکرا نەهاتووە، کە ئەمە فەرزێکە و پێویستە ئەنجام بدرێت، تەنها ئەوەندە نەبێت کە لە تەوراتدا چەند دەستە واژەیەکی زۆر کەم هاتووە بەناوی ((تذليل النفس) ) واتە : مل کەچ کردنی دەروون، هەروەك سفر اللاوین دا هاتووە و دەڵێت: ((تذللون نفوسكم) )[2].

واتە: دەروونی خۆتان ملکەچ بکەن.

پاشان لە (سفر الخروج) دا باس لە ڕۆژوی موسا دەکات، لە کاتێکدا کە لەلایەن خوای گەورەوە تەوراتی پێ خەڵات کراو دەڵێت:

((وكان هناك عند الرب اربعين نهارا و اربعين ليلة لم يأكل خبزاً و لم يشرب ماءً) )[3].

واتە: کاتێك لەلای خوا بوو-موسا- بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژو و (٤٠) شەو نە نانی خواردوو نە ئاوی خواردەوە؟!!

لەم دەستە واژانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مەفهومی جولەکە بۆ ڕۆژو بریتیە لە (دەستهەلگرتن لە خواردن و خواردنەوە و لە شەوەوە بۆ شەو- واتە

---

١- موسوعة اليهود و اليهودية : عبدالوهاب المسيري

٢- سفر اللاويين

٣- سفر الخروج

پێش هەڵهاتنی خۆری بەیانی تا ئاوا بوونی خۆری ئەو ڕۆژە- ئەمیش بۆ مەبەستی ملکەچ کردن بە دەروون و نەفەسی ئەو کەسە.

پاشان ئەو کەسانەی کە ڕاڤەی تەوراتیان کردووە باس لە ڕۆژوو دەکەن، کە چ پەیوەندییەکی بە سڕینەوەی تاوانەوە هەیە، بەم جۆرە: ((کل جهاد ضد الخطية و شهواتها يجب ان يبتدئ بالصوم...)) [1].

واتە: هەموو جەنگاندنێك لە دژی هەڵە و ئارەزووەکان پێویستە بە ڕۆژو دەست پێبکات.

بێ گومان (تەلمود) دەستی باشی هەبووە لە ڕێنمونی کردنی ڕۆژوان ی جولەکە، ئەویش بەو جۆرەی کە، کەسی ڕۆژوگر نابێت بۆ ماوەی (٢٥) سەعات قۆنەرەی چەرم لە پێ بکات [2] !!!

پاشان جولەکە لە سەردەمانی کۆن دا و لە کاتی ڕۆژ وگرتن دا بەرگ وپۆشاکیان لەبەر خۆیاندا لادەبرد و خۆڵیان دەکرد بەسەر خۆیاندا کە بەمەش بێتاقەتی و خەمباری خۆیان پێ دەردەخست و تەعبیر دەکرد.پاشان وازیان لە شتنی دەستەکانیان دەهێناو دەگریان [3].

جولەکە ئاوا ڕۆژویان دەگرت و بە هیچ شیوەیەك لە ناوەڕۆك وفەلسەفەی ڕۆژو حاڵی نە بوو بوون، تا ئەو کاتەی کە عیسا بوویە دواین پێغەمبەریان، (عیسا) "عليه السلام" کە بینی جولەکە ئاوا ڕۆژو دەگرن بەرەنگاریان بوویەوەو ئاگاداری قوتابی و شوێن کەوتووەکانی کردەوە کە وەك جولەکە نەکەن، هەروەك لە ئینجیلی (متى) دا باس لەم حاڵەتە دەکات و دەڵێت: ((متى صمتم فلا تكونوا عابسين كالمرائين، فاءنهم يغيرون و جوههم لكي يظهر للناس صائمين...)) [4]

---

١- التربية الدينية المسيحية ص (٣٠٢).

٢- الاسلام و اليهودية : ص(٢٨٧).

٣- المجتمع اليهودي ص(٢١٤).

٤- انجيل متى (٦) ١٦-١٨.

واتە: هەرکاتێ ڕۆژوتان گرت خۆتان دەر مەخەن وەك ڕیابازان، ئەوانە واتە- جولەکە رووی خۆیان دەگۆڕن، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی دەرخەن کە بەڕۆژون؟!

## ئەو کات و مانگانەی کە جولەکە رۆژووی تێدا دەگرن

جولەکە کۆمەڵە ڕۆژویەکی زۆریان هەیەو بەحسابی خۆیان لە پێغەمبەرانیان وەرگرتووە، هەندێکیشان خۆیان بۆخۆیانیان دروست کردووە بە درێژای سەردەم، کەئەوانیش بریتین لە:

١. ڕۆژووی ڕۆژی پاك بونەوە ((صوم يوم الكفارة) ) جولەکە لەم ڕۆژوەیاندا باوەڕیان وەهایە کە خوا لەسەجەم گوناهەکانیان خۆش دەبێت.

جولەکە زۆر پەیوەستن بەم ڕۆژو گرتنەوەو گەر ئەم ڕۆژە بکەوێتە رۆژی (شەمە) شەوە هەر بە ڕۆژو دەبن، کە ئەمەش لە راستیدا پێچەوانەی یاساکانی خۆیانە کە دەڵێت:

((أي يوم من ايام الصيام إذا وقع يوم السبت فاءنه يؤجل إلى يوم التالي) ) [1].

واتە: هەر ڕۆژێکی ڕۆژو گرتن گەر بکەوێتە رۆژی شەمەوە ئەوا دوا دەخرێت بۆ ڕۆژی دواتر–واتە یەکشەمە–.

٢. ڕۆژوی گەورە (صوم الكبير) ئەم ڕۆژوەیان پاش جەژنی (فصح) ەو ماوەی (٤٠) ڕۆژ دەخایەنێت کە ئەمە (موسا) ئەنجامی داوە، ئەویش لەو کاتەی کە دەچێتە خزمەت پەروەردگاری بۆ وەرگرتنی تەورات[2]

٣. ڕۆژوی عاشورا (صوم عاشوراء)

لە (١٠) ی مانگی (تشری) یەو ئەم ڕۆژووە گوزارشت لەو ساتە دەکات کە خوای گەورە موسا و بەنی إسرائيلەکانی ڕزگار کرد لە دەستی فیرعەون و موساش لەم ڕۆژەدا بە ڕۆژو دەبوو وەك دەربڕینی سوپاس گوزاری بۆ خوای تاك و تەنها، جولەکەش پارێزگاریان لەم یادە کرد تا ئەو کاتەی کە پێغەمبەر (ص) گەیشتە

---

١- موسوعة اليهود و اليهودية: ٢١٤،٥

٢- تفسير المنار : محمد رشيد رضاء: ج (٢) ص(١١٦).

مەدینە، بینی کەوا جولەکەکان لەم ڕۆژەدا بە ڕۆژو دەبن!! پرسیاری لێ کردن دەربارەی ئەم بە ڕۆژو بوونەیان، ئەوانیش لە وەلام دا وتیان: (هذا یوم صالح، هذا یوم نجي الله فیه بني إسرائیل).

واتە: ئەمە ڕۆژێکی باشە، ئەم ڕۆژە بوو کەوا خوا بەنی إسرائیل ی ڕزگار کرد لەدەستی دوژمنی-کە فیرعەون بوو- موسا تیایدا بە ڕۆژو بوو.پێغەمبەر ﷺ کە گوێ بیستی ئەمە بوو فەرمووی: (فانا احق بموسی منکم فصامه و امر بصیامه))[1]

واتە: ئێمە لە پێشترین بە موسا لە ئێوە پاشان خۆی بەڕۆژو بوو فەرمانیشی کرد بە باوەڕداران لەو ڕۆژەدا بە ڕۆژو بن.

٤. ڕۆژوی حەڤەی تەموز (صوم السابع عشرة من تموز)

جولەکە لەم ڕۆژەدا لەبەر هەندێ ڕوداوی نەتەوەی بە ڕۆژو دەبن کە بریتین لە:

أ-ئەو ڕۆژەی کە موسا لەوحەکانی تەوراتی تێدا شکاند و دانی بە زەوی دا.

ب-ئەو ڕۆژەی کە (بنو خضنصر) پادشای بابل، چووە اورشلیم (قدس) و گەمارۆی دا بەتەواوی سەربازەکانیەوە سەرئەنجام ئەو شارەی سوتاند.

ج-ئەو ڕۆژەی کە سەرکردەی ڕۆمەکان بە ناوی (بو ستهوموس) تەوراتی سوتاند لە ئورشەلیم دا.

د- ئە ڕۆژەی کە (تیتوس) ی گەورەی ڕۆمەکان هێرشی کردە سەر (قدس) بە مەبەستی لەناو بردنی جولەکە لە فەلەسطین دا لەساڵی (٧٠) ی زاین دا.

٥. ڕۆژوی جەدالیا (صوم الجدالیا)

ووشەی (جەدالیا) عبریەو بە مانای (یهوەی گەورە) دێت، ئەم ڕۆژوە گوزارشت لە ڕووداوی سەربڕینی فەرمان ڕەوای فەلەسطین دەکات لە دوای لەناوبردنی (هیکل).

٦. ڕۆژوی ئەستیر(صوم استیر)

---

١- رواه البخاري بشرح ابن حجر -باب صیام یوم العاشورا ج(٤) ص (٣٠٠).

وشەی ئەستیر لە بنەڕتدا هیندییەو بە مانای ئافرەتی بچوک دێت ئەمەش بە (استیری کچی ابیجا) ی جولەکە دەوترا لە نەوەی بنیامین[1].

٧. ڕۆژوی زەکەریا (صوم زکریا)

ئەمیش بەناوی(زەکەریای کوڕی یەهویاداعی) کاهینی جولەکەوە ناونراوە کە ئەم کەسە بەناوبانگ بووە لە ڕێز و پلە بەرزیدا[2].

٨. ڕۆژوی حەوتی ئازار (صیام السابع من آذار)

ئەمیش گوزارشت لە مێژووی مردنی موسا دەکات و پێی دەڵێن (یوم الغفران الصغیر) واتە ڕۆژی لێ خۆشبوونی بچوک.

٩. ڕۆژوی دووشەمان و پێنج شەممان

لە هەموو هەفتەیەك دا و لەم ڕۆژانەدا تەورات دەخوێنریت لە پەرستگاکاندا[3].

١٠. هەندێ ڕۆژوی تایبەتیان هەیە کە بریتین لە ئەمانە:

أ-بەڕۆژو بوون لە کاتی مردنی دایك و باوکیان دا.

ب-بە ڕۆژوبونی بووك و زاوا لە کاتی گواستنەوەی بوك دا.

ج-بەڕۆژو بوون لە کاتی بینینی خەونی ناخۆش دا.

د- بە ڕۆژوبوون لە جەژنی ڕزگار بوونی إسرائیل دا.

---

١- قاموس الكتاب المقدس ص(٦٣).

٢- هەمان سەرچاوە ص(٤٢٨).

٣- موسوعة اليهود و اليهودية : ج(٥) ص (٢١٤).

### چەند سەرنجێك لە ڕۆژووی جولەكە

أ- لەبواری عبادەت دا تازە گەریان داهێناوە لەلایەن حاخامەكانیانەوە و پەیوەندی بە شەریعەتی خواییەوە نیە.

ب- گەر سەرجەمی ڕۆژی بە ڕۆژوبونەكانیان كۆ بكەیەنەوە، نزیكی سالێك هەر بەڕۆژو دەبن كە ئەمەش لە حیكمەت و فەلسەفەی ڕۆژووەوە زۆر دوورە و خوای گەورە كاری وەها فەرز ناكات لەسەر بەندەكانی.

ج- زۆربەی ڕۆژوەكانیان یان پەیوەستە بە بۆنە نیشتمانیەكانەوە وەیان پەیوەستە بە ڕۆژە ناخۆشیەكانیانەوە كە ئەمەش دوورە لە كرۆكی عیبادەتەوە.

### ٤. حەج لە شەریعەتی جولەكە دا:

حەج لە ڕووی زمانەوانیەوە، بەمانی نیەت و سەردان دێت[١]، وە لەزارەوەی شەرعیش دا بە مانای سەردانی جێگە پیرۆزەكان دێت كە لە دینێكە وە بۆ دینێكی تر ئەو جێگە پیرۆزانە دەگۆڕێت.

حەجی جولەكە بریتیە لە سەردانی كردنی (بیت المقدس) سی جار لە هەموو سالێك دا.

لە (سفر التثنية) دا دەلێت: (ثلاث المرات في السنة يحضر الجميع ذكورك امام الرب الهك في المكان الذي يختاره..)

واتە: سێ جار لە سالێك دا تەواوی نێرینەكانیان ئامادە بن لەبەردەم پەروەردگاری پەرستراوی ئێوە لەو جێگایەی كە بۆ ئێوە دیاری كراوە.

### ٥. زەكات لە شەریعەتی جولەكدا

زەكات لە ڕووی زمانەوانیەوە بە مانای (گەشەو زیاد بوون) (النماء و الزيادة) دێت، لە زاراوەی شەرعیشدا بەمانای بەخشینی پارەی تایبەت كە ڕێژەی ئەو پارەیە گەیشتبێتە ڕێژەی زەكات، لەلایەن دەولەمەندانەوە بۆ هەژاران.

---

١- القاموس المحيط : مادة الحج ج(١) ص(١٨٨).

زۆر ئەستەمە لە تەواوی شەریعەتی جولەکە و گاورەکاندا تەنها سەرچاوەیەك بەدی بکەیت کە باس لە واجب بوونی زەکات بکات لە شەریعەتی جولەکەدا.

تەنانەت ئەو سەرچاوە ئیسلامیانەی کە توێژینەوەیان لەسەر دینی جولەکە کردووە ئاماژەیان بۆ زەکات نەکردووە کە بەشێکە لە پەرستن لەلای جولەکە تەنها ئەوەندە نەبێت کە هەندێ دەقی (سفر اللاوین) فەرمان بە چاکە دەکات لەگەڵ هەژاران وکەم دەستان دا، بە بێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە ئەم کارە کارێکی عیبادەتیە.

## ٦. جەژن و بۆنەکان لە شەریعەتی جولەکە دا

دەستە واژەی جەژنەکان (اعیاد) لە بەرامبەری دا (صجیم) ی عبری هاتووە، وشەی (صجیم) ئاماژەیە بۆ هەرسێ جەژنی (الفصح، الاسابیع، المظال).

جەژنەکان بە گشتی دەسورێنەوە لەگەڵ ڕۆژو مانگەکانی ساڵ دا و کۆمەڵێك لە خەڵکی کە بیروباوەڕی هاوبەش لە نێوانیاندایە کۆ دەبنەوە و ئاهەنگ ساز دەکەن.

جولەکە جەژن وبۆ نەکانیان زۆر بە گەورەو پیرۆز ڕادەگرن لە دڵیانداو پلەو پایەی زۆر گەورەی هەیە.

**نمونەی ئەو ڕۆژانەی کە جولەکەکردوویانە بە جەژن وئاهەنگ ی تێدا ساز دەکەن:**

### ١. ڕۆژی شەممە (یوم السبت) Sabbath

ڕۆژی شەممان لای جولەکە جەژنی هەفتانەیە، ئەم ڕۆژە ڕۆژی پشودانەو هەموو کار کردنێك تیایدا قەدەغەیە. بە زمانی (عبری) بە شەممە دەڵێن (شابات) کە ئەمەش بابلیە کۆنەکان ئەم وشەیەیان بەکار هێناوە بە واتای (ڕۆژو گرتن و دوعا) کردن.

هۆکاری پشودانی جولەکە لەم ڕۆژەدا دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە وتەکانی (سفر التکوین) کە دەڵێت: ((فرغ الله فى اليوم السابع من عمله الذي عمله، و إستراح فى

اليوم السابع من جميع عمله الذي عمله، و بارك الله اليوم السابع و قدسه لانه إستخرج من جميع عمله الذي خلقه الله ليصنعه ) )[1].

واته: له ڕۆژی حەوتەمدا خوا لەسەرجەمی ئیشەکانی بوویەوە، له ڕۆژی حەوتەمدا پشوی دا و خوا ئەم ڕۆژە- واته شەمە- پیرۆز کرد چونکه پشوی دا له سەرجەمی ئیشو کارەکانی که پێشتر دروستی کردبوون.

ئەم جەژنەیان له ئاوابوونی خۆر له ڕۆژی هەینیەوە دەست پێدەکات تا کاتی ئاوا بوونی خۆر له ڕۆژی شەممەدا[2] .بێ گومان ئەم ڕۆژە- واته شەممە - چەند تایبەت مەندییەکی خۆی هەیه که بریتین له مانە:

١.دەست هەڵگرتن له هەموو ئیش وکارێك.

٢.تەرخان کردنی ئەو ڕۆژە بۆ پەرستن و پێشکەش کردنی قوربانی.

٣.دەست هەڵگرتن له نوسین، بەتایبەتی گرێبەستی هاوسەرگیری (عقد الزواج) و گرێبەستەکانی تر.

٤.تەنها بت پەرستی تاوانەکەی لەوه گەورەتره که بێ ڕێزی لەبەرامبەر- شەممان- دا بکرێت و سزای سەرپێچی کاریش بریتیه له کوشتن و ڕەجم کردن[3].

٥.ئاگر کردنەوه به هەموو جۆرێك لەم ڕۆژەدا قەدەغەیه.

٦.سەفەر کردن بۆ هەرجێگەیەك بێت قەدەغەیه.

٧.هەندێك لەو جولەکانەی که زۆر پەیوەستن به یاساکانی شەریعەتی خۆیانەوه تەنانەت له ماڵدا نایەنه دەرەوه.

٨.لەسەرەتای هاتنی ڕۆژی شەممانـدا جولەکەکان دوعا بۆ هاتنی ئەم ڕۆژە دەکەن که به عبری پـێ ێ دەوترێ(قیدوش) جولەکەکان دوعا بەسەر پەرداخێك

---

١- سفر التكوين ،الاصحاح (٢) برگەی (٢،٣).

٢- سفر الخروج ، الاصحاح(٣١) برگەی (١٢-١٨).

٣- له (سفر الخروج) دا دەڵێت ((كل من صنع عملا في اليوم السبت يقتل قتلا) ) واته : هەر کەسێك له ڕۆژی شەممانـدا کار بکات دەبێت بکوژرێت.

عارەق دا دەکەن پێش نان خواردنیان و پاشان گەورەی خێزان دوعا دەکات و ئەندامانی خێزانیش (ئامین) ی بۆ دەکەن[1].

هەروەها دوعای تەواو بوونی شەممەشیان هەیەو پێ ی دەڵێن(هفدالاه) (havdalh) ئەم دوعایەش دەخوێنرێت بەسەر خواردن دا و ئامازە بەوە دەکات کە ڕۆژی شەممە ڕۆژێکی زۆر پیرۆزەو جیاوازی تەواوی هەیە لەگەڵ ڕۆژانی دوای خۆی دا.

**٢. عيد الفصح يان (عيد الفسح) Passover**

لە زمانی (عبری) دا پێی دەوترێت (بیساح) ئەویش باواتای تێپەڕ بوون و ڕۆشتن دێت..

ئەم جەژنە بەیەکەم جەژنی ساڵانەی جولەکە ناو دەبرێت و پێویستە ئاهەنگ لەم جەژنەدا ساز بکرێت.

ئەم جەژنەیان گوزارشت لە ڕزگار بوونی گەلی بەنی إسرائيل دەکات بەڕابەرایەتی (موسا) لە دەستی فیرعەن وە ڕۆیشتنیان بەلای دەریای سور دا.

هەروەها بە (عيد الفطير) ناو دەبرێت و لەم ڕۆژەدا نان ئامادە دەکەن بەبێ (خمرە وخوێ) لەگەڵ هەندێ سەوزەوات و گیا دا ئەمیش بۆ مەبەستی وەبیر هێنانەوەی خۆیان کە لە بیابانی سینادا ژیانیان بردۆتە سەر.

گرنگترین ڕۆژی ئەم جەژنەیان بریتیە لە دوو ڕۆژی سەرەتا و دوو ڕۆژی کۆتای و سەرەتای ئەم جەژنەیان لە چواردەی مانگی یەکەمی ساڵی عبریەوە دەست پێ دەکات کە ژمارەی ڕۆژەکانی (٨) ڕۆژە.

**٣. جەژنی سەری ساڵ ی جولەکە "عيد رأس السنه اليهوديه" Rash Hashanah**

بەزمانی عبری پێ ی دەوترێت(روش هشاناه) واتە (سەری ساڵ) ئەمەش جەژنێکی تریانەو ئاهەنگ دەگێڕن بۆ ماوەی دوو ڕۆژهەرچەندە تەلمود دەڵێت:

---

١- موسوعة اليهود و اليهودية : عبدالوهاب المسيري .

ڕۆژەکانی ئەم جەژنە بریتین لە (٤) ڕۆژ، لەم جەژنەیاندا جولەکەکان محاسەبەی نەفسی خۆیان دەکەن –بزعمهم– و لە ڕۆژی چوارەم دا بە ڕۆژو دەبن و ئەو ڕۆژوەشیان بە (صوم جدليا) ناو دەبەن، جیاوازی هەیە لەسەر ئەوەی کە کام لەمانگە عبرییەکان سەرەتایە، بەپێ ی تەرتیبی مانگە عبرییەکان (تشری) یەکەم مانگە لەسەری سالّ دا و مانگەکانی تر لە دوای ئەوەوە دەست پێدەکەن بەلاّم هەندێکیان دەلّێن (نیسان) سەرەتای مانگەکانە بە تەقویمی عبری چونکە نیسان لە تەوراتدا باس کراوە بەوەی کە سەرەتای مانگەکانی سالە، هەر ئەم مانگەیە واتە نیسان کە ئاهەنگی تیادا ئەنجام دەدەن بە بۆنەی دەرچون و ڕزگار بوونی بەنی إسرائیلیەکان لە مصر، کە ئەمەش گەورەترین یادە لەلای جولەکەکان .

مانگی (تشري) لەلای بابلیە کۆنەکان سەرەتای سالە کە (تشرینو) بەمانای (سەرەتا) (البداية) دێت لەزمانی بابلیەکاندا کە ئەوان باوەڕیان وا بوو سەرجەمی خواوەندەکانیان کۆ دەبنەوە و لەو ڕۆژەدا لە پەرستگای (مردوك) واتە (گەورەی خودا) بۆ مەبەستی نوێ کردنەوەی جیهان و فەرمان ڕەوای بەسەر تاك و کۆمەل دا.

جولەکەکان ڕۆژی سەری سالّی تازەی خۆیان بە ڕۆژی پاکبوونەوە لە گوناهـ و تاوان هەژمار دەکەن، جولەکەکان لەم ڕۆژەدا سەلام لە یەکتر دەکەن.

لەم ڕۆژەدا گەورەترین (طقوس) ی دینیان بریتیە لە فوو کردن بە کەڕەنەدا بە سێ دەنگی جیاواز کە هەر دەنگە بەلّگەیە لەسەر شتێکی تایبەت پاشان لە جەژنی سەری سالّیان دا بەرگی سپی لەبەر دەکەن لەکاتی نوێژەکانیاندا.

## ٤. جەژنی المظلة یان ((المظال) ) (سوکوت) feast of tabernacles Succot

بەزمانی (عبری) پێ ی دەوترێت (سوکوت) هەروەها (عیدالسلام) یان (عیدالبهجة) یان (عیدالجمع) ناوی هاتووە.

ئەم جەژنە گوزارشت لە حالّی بەنی إسرائیلیەکان دەکات کە ماونەتەوە لە بیابانی سینا دا، دوای دەرچونیان لە میصر و ڕزگار بوونیان لە فیرعەون.

ئەم جەژنەیان لە بنەڕەت دا جەژنی کۆکردنەوەی بەروبومی کشتوکاڵە، جولەکە ئاهەنگ ساز دەکەن بەم یادەوە هەڵدەستن بە هەلگرتنی کشتوکاڵی ئەو ساڵەیان، هەر بۆیە بە (عید الحصاد)یش ناو براوە.ژمارەی ڕۆژەکانی ئەم جەژن (٩) ڕۆژەو دەکەوێتە مانگی (تشری) یەوە.

جولەکەکان چەند ئاهەنگێك دەگێڕن لەم جەژنەدا کە ئەمانەن:

أ-ئاهەنگ دەگێڕن بە ئازاد بوونی بەنی إسرائیلەکان و دەرچوونیان لە میصر و جێگر بوونیان لە بیابانی سینا دا.

ب-ئاهەنگ گێرانیان بە کۆکردنەوە هەلگرتنی تەواوی بەروبومە کشتوکاڵیەکانیان لە عەمبارەکانیان دا.

ح-ئاهەنگ دەگێڕن بەهۆی تەواو بوونی جەژنە تەوراتیەکانەوە.

د-ئاهەنگ دەگێڕن بە تەواو بوون و خەتم کردنی دەورەی ساڵانەی خوێندنی تەوراتەوە.

**٥. جەژنی بوریم یان فوریم یا جەژنی مەساخر(عید بوريم او عيد فوريم او عيد المساخر purim) )**

ئەم جەژنەیان پەیوەندی بە ڕووداوێکی مێژوویەوە هەیە کە لەسەدەی (٥) ی پێش زاین دا ڕوویداوە، هوکارەکەشی بریتی بوو لەوەی کە وەزیری پادشای فارسەکان بە ناوی (هامان) فەرمانی بە لێدانو لەناوبردنی جولەکەکان دەرکرد، ئەم جەژنەیان (٢) ڕۆژەوە دەکەوێتە (١٤) ی مانگی ئازارەوە و چەند تایبەتمەندییەکیشی هەیە:

١.گۆرانی و سەما و خواردنەوەی مەی.

٢.بەڕۆژو بوون لە (١٣) ی ئازار دا.

٣.کۆبونەوەیان لەبەردەم (هەیکەل) لە شەوی (١٣) ی ئازار دا و خوێندنی (سفراستیر).

٦. جەژنی باکورە (عید الباكورة)

بە زمانی عبری پیّ ی دەڵێن (بکوریم) ئەم جەژنە تایبەتە بە پێشوازی کردنی جولەکە لە پێگەیشتنی بەروبوومی کشتوکاڵەکان.

جولەکەکان ئاهەنگ بەم یادەوە دەگێڕن لە مانگی (ابریل) کە یەکێکە لە مانگە عیبریەکان.

٧. جەژنی ئەسابیع (عید الاسابیع)

بە زمانی عبری پیّ ی دەوترێت (شفوعوت) واتە هەفتەکان، و نهێنی لە ناوهێنانی ئەم جەژنە بەم ناوە بریتیە لەوەی کە (٧) هەفتە لەدوای جەژنی (الفصح) ەوە دێت..

هەروەها (عید الحصاد) واتە جەژنی بەرهەم ناودەبرێت، کاتی ئەم جەژنە دەکەوێتە (٦-٧) ی مانگی (سیوان) بەمانگی عبري.

٨. جەژنی هەتاف (عید الهتاف)

بە زمانی عبری پیّ ی دەوترێت (تروعة) یان(شوفار) کە ئەمیش بە واتای بانگەوازدێت بە دەنگی بەرز.

لەلای جولەکەکان بە (عید الملاد العالم) یش ناو دەبرێت، چونکە بەروبوومی ساڵی پێشوتری تێدا کۆدەکەنەوە پاشان بەروبوومی ساڵی نوێشیان دەوەشێت بۆ سەوز بوون. کاتی ئەم جەژنەیان بریتیە لە یەکەم ڕۆژی مانگی (تشری).

٩. جەژنی تەدشین (عید التدشین) (Hannukah)

بەزمانی عبری پیّ ی دەوترێت(حانوخە) ژمارەی ڕۆژەکانی ئەم جەژنە (٨) ڕۆژەو لە (٥) ی مانگی (کسلو) بە تەقویمی عبری دەست پیّ دەکات و لە (٣) ی مانگی (طبت) یان (تیضت) کۆتای دێت.

هۆکاری دروست بوونی ئەم جەژنە، ڕووداوێکی مێژوویە و بریتیە لە گەڕانەوەی (یهودای حەشمونی) بۆ قودس و بنیادنانەوەی دروشمەکانی جولەکە بۆ (هەیکەل).ئەم جەژنە لە ڕاستیدا لە (عهد القدیم) دا باس و خواسی نەهاتووە، هەر

بۆیە گرنگیەکی نیە و کارکردن لەم ڕۆژەدا قەدەغە نیە، لەم ڕۆژەدا بەشێوەیەکی زۆر سادە ئاهەنگ دەگێڕن و لە ڕۆژی یەکەم دا تەنها یەك گڵۆپ دادەگیرسێنن پاشان لە ڕۆژی دووەم دا دوان و تا هەشتەم ڕۆژ دەیکەنە هەشت گڵۆپ.

**١٠. جەژنی کەفارە (عید الکفارە)** day of Atonement ,yom kippur

بەزمانی عبری پێ ی دەوترێ (یوم کیبور) واتە: ڕۆژی پاك بوونەوە سڕینەوەی تاوان و گوناهـ، وشەی (کیبور) لە بنەڕەت دا وشەیەکی (بابلیە) و بەمانی (پاکبوونەوە) دێت.

ئەم جەژنە بەیەکێك لە هەرە جەژنە گەورەو پیرۆزاکان هەژمار دەکرێت لەلای جولەکە.

کاتی دەست پێ کردنی ئەم جەژنە بریتیە لە ڕۆژی دەهەمی مانگی (تشری) هەروەك لە سفر اللاوین دا دەڵێت: ((اما العاشر هذا آلشهر السابع فهو یوم الکفارة محفلا مقدسا یکون لکم))[١].

واتە: ڕۆژی دەیەمی مانگی (٧) ەم ڕۆژی پاك بوونەوەتانەوە و پیرۆزە بۆ ئێوە.

هۆکاری ئەم جەژنەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە موسا(علیە السلام) بۆ دووەم جار (لە سینا) دابەزی کە پارچەکانی تەوراتی پێ بوو، مژدەی دا بە بەنی إسرائیلیەکان کە خوا لە گوناهی گوێرەکە پەرستییەکەیان خۆش بووە.

کاتی دەست پێکردنی ئەم جەژنە بریتیە لە ئێوارەی ڕۆژی نۆهەمی مانگی تشری و بەردەوام دەبێت تا دوای ئاوا بوونی خۆر لە ڕۆژی داهاتوو دا کە نزیکەی (٢٥) سەعات دەکات.

---

١- سفر اللاويين ٢٧: ٢٣.

## تایبەتمەندیەکانی ئەم جەژنە

١. بەڕۆژو بوون لەم ڕۆژەدا.

٢. لەسەر کاهینەکان پێویستە کە لەم ڕۆژەدا بەرگی سپی لەبەر کەن کە بەڵگەیە لەسەر خاکی بوون و هەست کردن بە هەڵەو تاوان.

٣. کاهینی گەورە لەم ڕۆژەدا دوو بەران دەکاتە قوربانی یەکەمیان لەلای (هیکل) و پاشان خوێنەکەی بڵاو دەکاتەوە، بەرانی دووەمیان لەسەر بەردێك دەکاتە قوربانی لە دەشت دا، ئەمیش بەبیروباوەڕی خۆیان بۆ ئەوەیە کە (شەیتان) (عزازئیل) هێمن بکەنەوە تاتەواوی گوناهی جولەکەکان هەڵبگرێت؟

٤. دەست هەڵگرتن لە کاری ژن و مێردایەتی (الجماع) و لە پێ نەکردنی پێڵاوی چەرم.

٥. هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕۆژی شەممەاندا حەرامە، لەم ڕۆژەشدا بەهەمان شێوە حەرامە.

٦. لە ڕۆژی ئاسای دا جولەکە سێ نوێژ دەکەن، بەڵام لەم ڕۆژەدا (یوم الکفارة) دوو نوێژی تر زیاد دەکەن و ژمارەی نوێژەکان دەکەن بە (٥) نوێژ.

٧. جولەکەکان باوەڕیان وەهایە کە لەم ڕۆژەدا خوا لە سەرجەمی تاوانەکانیان دەبوورێت جا تاوان و خراپەو دەستدرێژی و خوێن ڕشتن و پەیمان شکێنی درۆ و فێڵ و گەندەڵیەکانیان هەرچەند بێت !!!

کەبەڕاستی ئەمەخراپ ترین بیرو باوەڕە لە ناویاندا و ڕێگە خۆش کەرو هاندەرێکی زۆر گەورە یە بۆ سوربون بەدەوام بوونی جولەکە لەسەر پێشێلکاری و ستەم و تاوانە دڕندانەکانیان.

٨. هیچ ڕۆژێك نیە لای جولەکە لەم ڕۆژە پیرۆزتر بێت، هەربۆیە بە (السبت الاسبات) واتە شەممەی شەممەکان ناوبراوە کە ئەم ڕۆژە لای خۆیان، جولەکە لەسەرجەم تاوانەکانی پێشتریان کە ئەنجامیان داوە پاك دەبنەوە؟!!

### ١١. جەژنی سەربەخۆی (عید الاستقلال) Independence day

بە زمانی عبری پێ ی دەوترێت (یوم هاعتسماءوت) ئەم جەژنەیان بریتیە لە ئاهەنگ گێرانی جولەکەکان بە بۆنەی دامەزراندنی دەوڵەتی صەهونی لە فەلەسطین، کە دەکەوێتە (٥) ی ئایاری مانگی عبری، سەرەتای ئەم ئاهەنگەیان لەسەر چیای (هرتزل) دەست پێدەکات و فەرمان دەدرێت بە کردنەوەی ئاگرێك و بەدوای ئەویشدا (١١) ئاگری تر دادەگیرسێنرێ کە بەڵگەیە لەسەر (١٢) کۆمەڵگەی جولەکە.

دواتر ئەو ئاگرانە بەناو ئاهەنگەکادا دەگێڕدرێت و پاشان نمایشی سەربازی ئەنجام دەدرێت لەلایەن هێزە چەکدارەکانی سوپای ئیسرائیل و نوێترین چەکی سەربازی سەردەمی تێدا نمایش دەکرێت، پاش خوێندنەوەی هەندێ دوعا و بڵاو کردنەوەی بەیانات، بڕیار لەسەر خواردنەوەی سێ پەرداخ عارەق دەدرێت، کە یەکەمیان بۆ دەوڵەتی جولەکەیە و دووەمیان بۆ هێزە چەکدارەکان و سێ هەمیشیان بۆ گەلی جولەکەیە.

ئەم یاد و بۆنەیە جەژنێکی سیاسیەو بەرگی دینیان لەبەر کردووەو کە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندن و دروستکردنی دەولەتێکی سەربەخۆ بۆ جولەکەکانی دنیا لە بەرواری ١٤: ٥: ١٩٤٨ لە بەرامبەر (٥ ی ئایاری ساڵی ٥٧٠٨ بە تەقویمی عبری).

## دوا وته لەسەر جەژن و بۆنەکان:

گەر سەرنجی ناوەڕۆك و هۆکاری جەژنەکانی جولەکە بدەین دەگەینە ئەو راستییەی کە زۆربەی بۆنەو جەژنەکانیان دانەرو ڕێخەری دەستی سەرگەورە وحاخامەکانیانەو لە فەرمانی خواوە دوورە.

پاشان گەر بەراوردێکی خێرایان بکەین لەگەڵ ئیسلامدا جیاوازیەکی بێ ئەندازە دەبینین ئەویش بەم شێوەیە:

١. لە ئیسلام دا دوو جەژنی ساڵانە هەیە کە هەردوکیان لە دوای دوو رووداوی گەورە و گرنگەوە دێن، یەکەمیان ڕەمەزانە کە مانگی قورئان و مانگی تەوبە کردنو دورکەوتنەوەی بەندەکانە لە خراپەو تاوان و خواردن و خواردنەوە.

دووەمیشاین دوای بەجێ هێنانی واجبی حەج و کۆبوونەوەی مسوڵمانانە لە تەواوی دنیا و لە کاعبەی پیرۆز و ئەنجامدانی بەندایەتی و پەرستش بۆ خوای تاك و تەنها و زیندوکردنەوەی کاری گەورەی (إبراهیم) لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوای گەورە و سەربڕینی (إسماعیل) و پاشان گۆڕینی ئەم فەرمانە بە بەرانێك، دوای ئەوە جەژنێکی هەفتانەش هەیە بۆ مسوڵمانان کە پێ ی دەوترێت (جومعة) باوەرداران لەم رۆژەدا بە یادی خواو سڵاوات و قورئان خوێندنەوە سەرقاڵن، لە مزگەوتەکاندا کۆ دەبنەوە بۆ بەجێ هێنانی ئەم دروشمە خواییە.

بەڵێ گەرەترین سیما و سومبل لە هەر سێ جەژنەکەدا بریتیە لە (گەورەگرتن و بەتاك پەرستنی خوا و خۆ جوان کردن و خۆ رازاندنەوەو دڵخۆشی و سەردان کردنی یەکتر وقەدەغەکردنی ڕۆژو گرتن تیایاندا و نوێژ کردن و یارمەتی دانی هەژاران و کەم دەستان بێ نەوایان.

بەڕاستی ئەمە ناوەرۆکی جەژن و بۆنەکانە لە ئیسلامە جا تۆی خوێنەری بەڕیز خۆت دادوەربە لە بەراورد کردنی ئەم جەژنانەو جەژنەکانی جولەکەدا تا بزانی چەندە جیاوازیان لە نێوان دایە ! ! !

## خـالّی دووەم: ئـەو یاسـا وتەشـریعانەی کـە پەیوەنـدیان بـە حەرامەکانەوە هەیە

بێ گومـان لـە دینی جولەکەدا چەند ئاژەڵێـك هەن کـە خـواردنی گۆشتیان حەرامە.

ئەوانیش بریتین لە:

١) لە(سفر الاوین) دا باس لـە حـەرامێتی گۆشـتی (وشـتر و کەروێشـك و بەران) دەکات و دەڵێت:

((من لحمها لا تاكلوا وجثتها لا تلسموا إنها نجسة لكم) ) [1].

واتە: لە گۆشتیان مەخۆن ودەست مەدەن لە لاشەیان چونکە ئەوان پیسن بۆ نێوە.

٢) لە باڵدارەکان (داڵ، قەلـە ڕەش، نەعامـە و بـاز و پەپوسلێمانکە(هد هـد) و شەمشەمە کوێرەو کۆی گشتیان نزیکەی (٢٠) باڵدارن کە خواردنی گۆشـتیان بـەپێ ی تەشریعی جولەکە حەرامن)

٣) ئەو گیاندارانەی کە بەسـەر زەوی دا دەڕۆن وەك مشـك و جـرج و بـزن مـژە خواردنایان حەرامە.

زانایانی جولەکە جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا دەربارەی ئەو ئاژەڵ و گیاندارانەی کە گۆشتیان ناخورێ ئایا تەنها بە مردووی پیسن یان بە زیندوویش؟!!

کۆمـەڵی (فەریسـیەکان) کـە گـەورەترین کۆمـەڵی جولەکـەن باوەڕیـان وەهایە هەندێ لەو ئاژەڵانە لە دوای مردنیان پیسن و دەست لێدانیان، پیسە جا بەشـێوەی سروشتی مردبێتن یان کوژرابێتن.

چونکە هەندێك لەو ئاژەڵانە بۆ بەرژەوەنـدی مرۆڤـەکان بـەکاردێت وەك (گـوێ درێژ و ئەسپ ومایین) [2].

---

١- سفر اللاويين : ١١: ٨.

٢- الاسلام و اليهودية : ص(٢٤١).

بەلام کۆمەلێکی تریان بەناوی (صدوقیون) باوەڕیان بە پێچەوانەی باوەڕی فەریسیەکانە و دەلێت: دەست دان لەو ئاژەلانەی کە خواردنی گۆشتیان حەرامە بەزیندوی بێت یان مردووی وەك یەکەو مرۆڤەکەی پێ پیس دەبێت.

٤) خوێن، بەشێوەیەکی وەها پیس نیە لە شەرعیەتی جولەکەدا تەنها لە دوو حالەت دا نەبێت.

ئەویش (سوڕی مانگانەی ئافرەت (الحیض) و خوێنی دوای مندال بوون (النفاس) )

٥) (مەنی) لە هەموو حالەتەکان دا بە (پیس) ناوبراوە جا لە حالەتی سروشتی دا بێت یان ناسروشتی، ئەم باوەڕەشیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە (مەنی) بناغەی دروستبوونی مرۆڤە- کە مەبەست پێ ی ئادەمە-و دەلێت ئەو بووە هۆی تێکدانی سروشت بەوەی کە هەلەیەکی ئەنجام دا، جا ئەو (مەنی) هۆکاری پەیدا بوونی مرۆڤایەتیە لە دوای ئادەمە و هەلگری هەمان سیفەتی ئەون بەمەش هەلگری سیفەتی پیسن[1].

٦) مرۆڤ بە مردووی لە شەریعەتی جولەکەدا بە یەکێ لە شتە پیسەکان دادەنرێت، ئەویش کە لە (سفر العدد) دا دەلێت: ((هذه هي الشريعة إذا مات إنسان في خيمة فكل من دخل الخيمة وكل من كان في الخيمة يكون نجسا) )[2]

واتە: ئەوە یاسایە ئەگەر مرۆڤ مرد لە مالدا، هەرکەسێ بچێتە ئەو مالەو هەرکەسێ لەو مالەشدا بێت ئەوە پیسە!!!

٧) ئەوانەی کە جولەکە نین کە بەزمانی عبری پێیان دەوترێت(الجوييم) سەرجەم بە کۆو بەبێ جیاوازی لە شتە پیسەکانن، هەروەك (تەلمود) دەلێت ((الخارجون عن دين اليهود خنازير النجسة))[3].

---

١- سفر اللاويين : نجيب جرجس

٢- سفر العدد (١٩) ١٦: ١٤.

٣- اسرائيل و التلمود : ابراهيم خليل أحمد ص (٦١).

واته: ئەوانەی کە لە دینی جولەکە دەرچون بەرازی پیسن.

هەروەها حاخامەکان دەڵێن: ((أن المرأة اليهودية إذا أخذت حماما طقوسيا بعد الدورة الشهرية كان يجب ان تحذر مقابلة فرد من الجوييم او كلب او خنزير او حمار، وإن قابلت ايامنها كان عليها ان تغير طريقها لأنه تسينجسها مرة آخري) )[1].

واتە: ئەگەر ئافرەتێکی جولەکە خۆی بشوات لە دوای سوری مانگانەی پێویستە خۆی بپارێزێ لە ڕووبەڕو بوونەوەی غەیرە جولەکە و سەگ و بەراز و گوێ درێژ، گەر هەریەك لەمانە بەرەو ڕووی هات ئەوا بارێگەی ڕۆیشتنی بگۆڕێت و بەرەو ڕوویان نەڕوات چونکە بۆ جارێکی تر تووشی پیسی دەبێتەوە.

## خاڵی سێ هەم: دەست نوێژ Abiution

یەکێکی ترە لەو یاسا تەشریعیانەی کە لە دینی جولەکەدا باسیان لێوە کراوە بریتیە لە دەست نوێژ، ئەویش لە پێش ئەنجام دانی هەر واجباتێکی دینی دانراوە، و دوای هەموو شتیك کە بەرەو پیسی بیان بات.

بێ گومان دەست نوێژ لە شەریعەتی جولەکەدا سێ بنەمای هەیە:

١.حەمام کردن وخۆشوردن بەتایبەت بۆ ئەو ئافرەتانەیان کە لە سوڕی مانگانەیان تەواو دەبن.

٢.شوردنی هەردوو دەست و هەردوو قاچ (ئەمیش بۆ ئەو کاهینانەی کە فەرزەکان ئەنجام دەدەن لە (هەیکەل) دا.

٣.شۆردنی هەردوو دەست.

لە هەندێ شوێنی تریشدا شۆردنی دەستەکان واجب کراوە وەك دەست شتن پێش نان خواردن و نوێژ کردن ودوای هەڵسان لە خەو و دوای سەردان کردنی مردوو.

---

١- موسوعة اليهود و اليهودية : عبدالوهاب المسيري ص(٢٤٤) ج(٥).

### خاڵی چوارەم: خواردنی شەرعی و حەڵاڵ (کوشیر) Kosher

ئەم خاڵە باس لە سەرجەمی ئەو خواردنانە دەکات کە گونجاوو لەبارن بۆ خواردن و حەڵاڵن لە شەریعتی جولەکەدا، کە (کوشیر) وشەیەکی عبریە و بەو مانەیە کە باسمان کرد.

ئەو یاسایانەی کە پەیوەستن بەم بوارەوە بریتین لە: -

١.سەرجەمی ئەو ئاژەڵ و باڵدارانەی کە پاکن لە دینی جولەکەدا حەڵاڵن تەنها ئەوانە نەبێت کە پێشتر باسمان لێوە کرد.

٢.خواردنی ماسی بە هەموو بەشەکانیەوە حەڵاڵن لە شەریعەتی جولەکەدا.

٣.چوار جۆر (کولە) حەڵاڵە لە دینی جولەکەدا، بەلام حەشەراتەکانی تر خواردنیان حەرامە.

٤.خواردنی سەوزەوات و میوە سەرجەم بە کۆمەڵ حەڵاڵن.

### خاڵی پێنجەم: (سەربڕینی شەرعی) Ritual Slaughter

بەزمانی عبری پیّ ی دەوترێت (شحیط) کە ئەمەش زاراوەیەکە ئاماژە بەسەر بڕینی ئاژەلان دەکات کە ئەویش دەبێت ئەو چەقۆیەی کە ئەو ئاژەڵەی پیّ سەردەبڕدریّ تایبەت بێت و کول نەبێت، پاشان دەبێت ئەو ئاژەڵە یان ئەو باڵندەیە بەتەواوی پشکنینی پزیشکی بۆ ئەنجام بدرێت ئەوجا بڕیار لەسەر سەر بڕینی بدرێت.

### خاڵی شەشەم: ڕۆژ ژمێری جولەکە (التقویم الیهودیه)

ئەم خاڵە دەدوێت لە ناوی مانگ و ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ لەلای جولەکە ئەویش بەم جۆرە:

ڕۆژمێری جولەکە زۆر ئاڵۆزە ئەویش بەهۆکاری ئەوەی کە ئەوان بە پێی مانگە (قەمەریەکان) حسابی ڕۆژەکانی خۆیان دەکەن، لەم کاتەدا ژمارەی مانگیان (٣٠)

ڕۆژ دەکات یان (٢٩) ڕۆژە بەم جۆرەش ساڵ پێکدێت لە (٣٥٤) ڕۆژ، ڕێکخستنی مانگەکانی ساڵی عبری بەم جۆرەیە:

| م | ناوی مانگی عبری | ژمارەی ڕۆژەکان | لەبەرامبەر تەقویمی زاینی |
|---|---|---|---|
| ١ | تشری | ٣٠ | ئوکتوبر |
| ٢ | حشوان | ٢٩ یان ٣٠ | کۆتایی ئوکتوبر – نوفمبر |
| ٣ | کسلو | ٢٩ یان ٣٠ | کۆتایی نوفمبر – دیسمبر |
| ٤ | طبت | ٢٩ | کۆتایی دیسمبر – ینایر |
| ٥ | شباط | ٣٠ | کۆتایی ینایر – فبرایر |
| ٦ | آذار | ٢٩ | کۆتایی فرایر – مارس |
| ٧ | نیسان | ٣٠ | کۆتایی مارس – أبریل |
| ٨ | آیار | ٢٩ | کۆتایی أبریل – مایو |
| ٩ | سیوان | ٣٠ | کۆتایی مایو – یونیە |
| ١٠ | تموز | ٢٩ | کۆتایی یونیە – یولیە |
| ١١ | آب | ٣٠ | کۆتایی یولیو – أغسطس |
| ١٢ | أیلول | ٢٩ | کۆتایی أغسطس – سبتمبر |

**خاڵی حەوتەم: (ئەو تەشریع و یاسایانەی کە پەیوەندیان بە تاوان و سزاوە هەیە لە دینی جولەکەدا (الجریمە و العقویە).**

تاوان (الجریمة) بە مانای ئەو قەدەغەکراوانە دێت کە خوای گەورە حەرامی کردون و لە بەرامبەر ئەنجامیاندا تۆڵەی داناوە[١].

لەلای جولەکەش بریتیە لە: ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە شەریعەتی جولەکە یاساغی کردوون[١].

---

١- الاحکام السلطانیة و الأحکام الدینیة : أبی الحسن الماوردي.

سزا (العقوبة) لەلای زانایانی إسلام بریتییە لە سزادانێکی دنیای کە خوای گەورە لە بەرامبەر قەدەغە کراوەکاندا بڕیاری لەسەر داوە[2].

لەلای زانایانی جولەکەش (سزا) (العقوبە) بریتیە لە باسکردن لە مەندێ تۆڵەو سزا بەبێ ئەوەی تێگەیشتنی تەواو لە بارەیانەوە باس کرا بێت.

## تاوانی کوشتن و سەندنەوەی تۆڵە لە دینی جولەکەدا

## (جریمە القتل و عقوباتها)

تاوانی کوشتن یەکێکە لە هەرە ئەو تاوانە گەورانەی کە خوای گەورە پێ ی تورە دەبێت و هەڕەشەی زۆر توندی لە ئەنجام دەرانی کردووە.

یەکەم تاوانی کوشتن لە سەر زەوی دا لە کوشتنی هابیل ی کوری ئادەمەوە دەستی پێ کرد لە لایەن قابیل ی برایەوە.

لە تەشریعی جولەکەدا سزای پیاو کوژ کوشتنەوەیەتی هەر وەك لە سفر الاويين دا دەڵێت: ((و من قتل إنسانا يقتل)) [3].

واتە: ئەوەی کە کەسێك بکوژێت دەکوژرێتەوە.

**شەریعەتی تەورات ئەم مەسەلەیەی کردووە بە سێ بەشەوە: —**

**١. کوشتنی بە ئەنقەست (قتل العمد):**

ئەو کەسەی کە کەسێکی تر بە ئەنقەست بکوژێت، دەبێت بکوژرێتەوە لەلایەن خاوەنی کوژراوەکەوە و نابێت لێ ی ببورێت هەر وەك لە (سفر العدد) دا هاتووە دەڵێت: ((ولا تاخذوا فدية عن نفس القاتل المذنب الموت بل إنه يقتل)) [4].

---

١- سفر اللاويين.

٢- الجنايات في الفقة الاسلامية : د. محمد هاشم عمر.

٣- سفر اللاويين.

٤- سفر العدد ٣١: ٣٥.

واتە: فدیە (بەخشش) وەرمەگرن لە کەسی تاوانباری پیاو کوژ، کە کەسێکی کوشتووە بەڵکو دەبێت بکوژرێتەوە.

**٢. کوشتنی بە هەڵە (القتل الخطأ):**

ئەم جۆرەیان بریتیە لە کوشتنی کەسێك لە لایەن کەسێکی ترەوە بەلام بەدەستی ئەنقەست نا بەڵکو بەشێوەی هەڵە، لەم حاڵەتەدا پیاو کوژ ناکوژرێتەوە بەڵکو پیاوکوژ لەو شارەوە ڕادەکات بۆ شارێکی تر و پیّ ی دەوترێت شاری پەناگە (مدینە الملجا) پیا وکوژان کە بە هەڵە کەسێکی تر دەکوژن ئەو شارە بە جێدەهێڵن و دەچنە شارێکی تر...[1]

**٣. بوون بە هۆکاری کوشتنی کەسێك (القتل بسبب)**

ئەم جۆرەیان کە سێك دەکوژرێت بەڵام ئەوەی کە کوشتویەتی پیاوکوژی ڕاستەقینە نیە، بەڵکو بۆتە هۆکاری ئەوەی کە ئەو کەسە بکوژرێت.

بۆنمونە: گەر کەسێك خاوەنی گایەك بێت و ئەم گایە لە کەسێك بدات و کە کەسەکە بمرێت، ئەوا سەرئەنجام گاکە دەکوژرێت و لە گۆشتەکەی ناخورێت و گەر شایەتێك هەبوو لەسەر ئەوەی کە خاوەنی ئە گایە ئاگاداری ئەم ڕووداوە نیە و دەستی تێدا نیە ئەوا ئازاد دەکرێت و تاوانبار نیە، هەروەك لە(سفر الخروج) دا دەڵێت: ((وإذا نطح ثور رجلا او إمراة فمات يرجم الثور و لا يؤكل لحمه، وأما صاحب الثور فيكون بريئا) )[2].

واتە: ئەگەر گایەك دای لە پیاوێك یان ئافرەتێك و مردن، گاکە بەردباران دەکرێت و گۆشتەکەشی ناخورێت، وە خاوەنی گاکەش بیّ تاوانە.

---

١- سفر العدد : ٣٥: ١٠-١١.

٢- سفر الخروج ٢١: ٢٨-٢٩.

بەڕاستی گەر سەرنجێکی ئەم سێ خاڵە بدەین تەنها فەوضامان دێتە پێش چاو چوونکە کوشتنەوەی پیا وکوژ ئیشی دەستەڵاتە نەك خاوەنی کوژراوەکە، بەمە ئاگری دووژمنایەتی و خوێن ڕشتن زیاد دەکات.[1]

## ئەو تاوانانەی کە کوشتن سزایانە لە شەریعەتی جولەکەدا

بێ گومان هەندێ تاوان هەن لە شەریعەتی جولەکەدا، گەر هەرکەس ئەنجامیان بدات کوشتن پاداشتیەتی، ئەوانیش بریتین لە:

### ١. خواردنی خوێن (آكل الدم):

دووجار لە شەریعەتی جولەکەدا باس لە تاوانی خواردنی خوێن کراوە بکەرانیشی بە سزای کوشتن هەڕەشەیان لێ کراوە، هەروەك لە سفر الاويين بەم جۆرە باس کراوە:

((و كل الدم لا تاكلوا فى جميع مساكنكم من الطير و من البهائم، كل نفس تاكل شيئا من الدم تقطع تلك النفس من شعبها))[2].

واتە: هەموو خوێنێك مەخۆن لە تەواوی ماڵەکانتاندا لە خوێنی باڵندەو ئاژەڵان، هەموو کەسێك ئەگەر هەندێك لە خوێنی خواردووە ئەوا دەبێت ئەو کەسە بکوژرێت.

### ٢. نێربازی (اللوط):

یەکێکی تر لەو تاوانانەی کە شەریعەتی جولەکە یاساغی کردوەو سزای کوشتنی بۆ داناوە بریتیە لە نێربازی، واتە: دەستێکەڵکردنی نێر لەگەڵ نێردا هەروك لە (سفر الاويين) دا دەڵێت: ((إذا إضطجع رجل مع ذكر إضطجاع إمراتە فقد فعلا كلاهما رجسا إنهما يقتلان))[3].

---

١- بداية المجتهيد و نهاية المقتصدة (ابن رشد).

٢- سفر اللاويين

٣- سفر اللاويين ٢٠: ١٣.

واتە: گەر پیاوێك كاری سەرجێگەی لەگەڵ كوڕێكدا ئەنجامدا لەسەر جێگەی ژنەكەی، ئەوا هەردووكیان كاری پیسیان ئەنجام داوە و دەبێت هەردووكیان بكوژرێن.

سزای ئەم كارە بریتیە لە ڕەجم كردنی هەردوكیان بەبەرد هەتا دەمرن[1].

**٣. چونە لای ئاژەڵ (إتیان البهائم):**

یەكێكی ترە لە و تاوانانەی كە كوشتن پاداشتیەتی بریتیە لەوەی كە پیاوێك یان ئافرەتێك ئارەزوە جنسیەكانی خۆیان لەگەڵ ئاژەڵێك دا بەتاڵ بكەنەوە، هەروەك دەڵێت: ((و إذا جعل رجل و مضجعهُ مع بهيمة يقتل....)) [2].

واتە: ئەگەر پیاوێك كاری سەرجێگەی لەگەڵ ئاژەڵێكدا ئەنجام دا ئەوە دەبێت بكوژرێت.

**٤. چونە لای ئافرەت بۆ كاری سەرجێگەی لەكاتی سوڕی مانگانەیدا:**

ئەمەش یەكێكی ترە لەو حاڵانەی كە ئەنجام دەرانی بەسزای كوشتن دەگەن، ئەویش ئەو پیاوانە دەگرێتەوە كە دەچنە لای خێزانیان بۆ كاری ژن مێردایەتی لە كاتی سوڕی مانگانەی خێزانەكانیان دا (الحيض).

سەرئەنجام هەردووكیان دەكوژرێن واتە چ پیاوەكە و چ ژنەكەشی!!!لە ڕاستیدا ئەم یاسایە هیچ ژیریەكی تێدا نیە و دوورە لە دادپەروەریەوە، چونكە ئەو ئافرەتەی كە ئەم حاڵەتەی لەگەڵ دا دەكرێت چ دەسەڵاتێكی هەیە كە پیاوێكی هێندە لاوازی هەیە و ناتوانێت دان بە خۆیدا بگرێت؟!!)) [3].

---

١- تفسير سفر اللاويين : نجيب جرجس ص(٢٥٢).

٢- سفر اللاويين.

٣- الاسلام و اليهودية (ص ٤١٣).

٥. کار کردن له ڕۆژی پاك بوونەوە (العمل في اليوم الكفارة):

هەروەك پێشتر له باسی جەژنەکانی جولەکەدا باسمان کرد کە یەکێك لە جەژنەکانیان ڕۆژی پاك بوونەوە وسڕینەوەی تاوانەکانیانە (يوم الكفارة).

کە ئەویش دەکەوێتە دەیەم ڕۆژی مانگی (تشری) بە تەقویمی جولەکە.

لەم ڕۆژەدا کار کردن بە هەموو جۆرێك قەدەغەیە و سەرپێچی کەرانی ئەم ڕۆژە بە کوشتن سزا دەدرێن[1] ! !.

٦. جوێن دان بە دایك و باوك:

یەکێکی ترە لەو تاوانانەی کە لە شەریعەتی جولەکەدا کوشتنی لەبەرامبەردا دانراوە هەروەك لە (سفر اللاويين) دا دەڵێت: ((كل إنسان سب اباه او امه فانه يقتل)) [2].

واتە: هەر مرۆڤێك گەر جوێنی دا بە باوکی یان بە دایکی دەبێت بکوژرێت.

وە کوشتنیشی بە بەرد دەبێت و ڕەجم دەکرێت تا دەمرێت، هەروەك لە (سفر التثنية) دا دەڵێت: ((...فيرجمه جميع رجال مدينة بحجارة حتى يموت)) [3].

واتە: سەرجەم پیاوانی شارەکەی خۆی کۆدەبنەوە و بەردی تێ دەگرن تا دەمرێت.

## داوێن پیسی (الزنا) لە شەریعەتی جولەکەدا Adultery

بێ گومان داوێن پیسی یەکێکە لەو تاوانە چەپەڵانەی کە دژی فطرەتی مرۆڤەکانە و بەهۆیەوە شەرم دەڕوات و مرۆڤەکانی بێ بەش دەبن لە ئاسایشی دەروونی و ئەم سیفەتە بەتەواوی مانا لەگەڵ گەورەی مرۆڤە تەندروستەکاندا ناگونجێت.

---

١- سفر اللاويين ٣٠: ٢٣

٢- سفر اللاويين.

٣- سفر التثنية.

تاوانی زینا لە ناو جولەکەدا بەشێوەیەکی زۆر خراپ بڵاو بۆتەوە کە سنورێکی بۆ نیە.جولەکە وا دەبینین کە (جنس) (sex) غەریزەیەکی مرۆییە و پێویستە کە تێر بکرێت.

لە ڕێگەی ژن وژن خوازییەوە، زینا لە نێوان جولەکدا حەرامە، بەڵام لەگەڵ غەیری جولەکەدا دروستە و کێشەیەکی نیە.

بەربڵاو بوونی زینا لەنا وجولەکدا هێندە سنور شکێنە، دەقەکانی تەورات بە تەنها باس لە زینای پیاوێکی جولەکە ناکات لەگەڵ غەیرە جولەکیەك دا بەڵکو باس لە زینای کەسە زۆر نزیك و مەحرەمەکان دەکات هەر لە:

(پیاو لەگەڵ ژنی باوکی دا (باوە ژن)، پیاو لەگەڵ ژنی کوڕەکەیدا (بوك)، پیاو لەگەڵ دایکی خێزانی دا (خەسو)، پیاو لەگەڵ کوڕەزا و کچەزای خۆیدا، پیاو لەگەڵ ژن خوشکی خۆیدا، پیاو لەگەڵ دایکی خۆیدا، پیاو لەگەڵ پوریدا، پیاو لەگەڵ ئامۆژنی دا !!!

هەروەك وتمان ڕێژەی زینا هێندە زۆرە لەناو ئەم گەلە بەد کارەدا دەقەکانی تەورات هەڕەشە لەوانە دەکات کە زینا و داوێن پیسی لەگەڵ نزیەکانی خۆیدا دەکات بەبێ جیاوازی و سەرجەم بەکۆ بە کوشتن و لەناو بردن.

## خواردنەوەی عارەق و مادده هۆش بەرەکان و باس کردنیان لە شەریعەتی جولەکەدا

گومان لەوەدا نیە کە عارەق و مادده هۆش بەرەکان سەرەکی ترین هۆکارن بۆگەندەڵ کردنی ژیانی مرۆڤەکان و پارەو ماڵ و ئەقڵیان.

بەڵام شەریعەتی جولەکە عارەقی بە یەکێ لە تاوانە گەورەکان هەژمار نەکردووە تەنها لە (سفر اللاویین) دا باس لەوە دەکات کە خواردنەوەی (مەی) قەدەغەیە.

بەڵام لە تەواوی (آسفار) ە کانی تردا فەرمان کراوە بە خواردنەوەی (عارەق)، تەنانەت ئەو دەقانەش کە باس لە قەدەغەی عارەق خواردنـەوە دەکـەن، تـەنها بـۆ ئامۆژگاریە نەك بۆ سزا و تۆڵە سەندنەوە.

## دزی لە شەریعەتی جولەکدا

سەرجەم پەیامـە ئاسمانیـەکان (دزیـان) مـەحکوم کـردووە ئەنجامدەرانیشـیان بەسەرگەردان و لادەر لە ریێ ی ڕاست ناو بردووە.

لە شەریعەتی جولەکـەدا (دزی) لـە (جولەکـە) یەکێکـە لـە تاوانـە گـەورەکان و مایەی تورەکردنی خوایە، تەنانەت لە هەندێ لە دەقەکانی (عهد القدیم) دا تۆڵەی بە کوشتن لێ دەکرێتەوە.

بەڵام ئەوەی جیێ ی سەرنج و لەسەر وەستانە، ئەوەیـە کـە ئـەم سزایە تـەنها بەسەر جولەکەیەکدا جیێ بە جیێ دەکرێت کە دزی لە جولەکە بکات نـەك لـە غـەیری جولەکە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، دزی کـردن لـە غـەیری جولەکـە کـارێکی سـادەیە و نابێت ئەوەی کە جولەکەیەك دەیـدزێت لـە غـەیرە جولەکەیـەك بـۆی بگەڕێنێتـەوە، هەروەك لە دەقە گەندەڵەکانی تەلمودا هاتووە و دەڵێت: ((یحـق لیهـودي آن یسـرق مال غیر الیهودي، و السرقة من غیر الیهودي لا تعتبر السـرقة...إذ إن العـالم لم یخلـق إلا من اجل الیهود)) [1].

واتە: مافی خۆیەتی کە جولەکەیەك ماڵی غەیرە جولەکەیەك ببات بۆ خۆی-واتە بیدزێت- چونکە دزی کردن لـە غـەیرە جولەکـە بـە دزی نابـژێردرێت!!....جیهـان بەگشتی دروست نەکراوە مەگەر لەبەر خاتری جولەکە نەبێت؟!!

هەروەها حاخامەکانیان دەڵێن: ((إن الیهودي یرتکب ذنبا عظیما إذا رد للأممي ماله المفقود لأنه بفعله هذا یقوي الکفرة، ویظهر الیهودی بذلك إنه یحب الوثنین ومـن احب الوثنین فقد آبغض یهوه)) [2].

---

١- المسیح المنتضر و تعالیم التلمود.

٢- من طرئف العادات و الغرائب المعتقیدات : د. محمود سلام : ج(٢) ص(٧٠).

واته: جولەکەیەك بە گێڕانەوەی ماڵێکی لێ ون بۆ غەیرە جولەکەیەك تاوان بار دەبێت چونکە بەم کارەی بێ دینەکان بەهێز دەکات، بەمەش کەسی جولەکە دەریدەخات کە بت پەرستەکانی خۆش دەوێت، هەرکەس بت پەرستانیشی خۆش بوێت ئەوا (یهوە) – کە ئەوان بەخوای خۆیانی دەزانن– ڕقی لێ هەڵدەگرێ.

## خاڵی هەشتەم: ئەو یاسا و تەشریعانەی کە پەیوەندیان بە ژن هێنان و طەلاق ی ئافرەتەوە هەیە بەشێوەیەکی گشتی:

یەکێکی تر لە لایەنە گرنگانەی کە پێویستە باسیان لێوە بکەین لە شەریعەتی جولەکەدا بریتین لە بوارەکانی (خێزان– ئافرت – ژن هێنان – جیا بوونەوە – منداڵی ناشەرعی...) چەند باسێکی تر.

**یەکەم: ئافرەت (لە شەریعەتی جولەکدا) (المراة في الشريعة اليهودية):**

شەریعەتی جولەکە بەشێوەیەکی کەم بۆ ئافرەت دەڕوانن و بە بنچینەی تاوانی دەزانن، هەر بۆیە کاتێك پیاوێکی جولەکە نوێژ دەکات سوپاسی خوا دەکات کە بە (ئافرەت و نەفام و بت پەرست) دروستی نەکردووە.

پاشان جولەکە باوەڕیان وەهایە کە (حەواء) هۆکاری سەرەکی بووە لە خواردنی بەری ئەو درەختەی کە لە بەهەشتدا لێیان قەدەغە کرا بوو سەرئەنجام دەرکران لە بەهەشت.

توخمی(مێ) لەناو جولەکەدا هەر لە ساتی لەدایك بوونیەوە بەسوك و بێ نرخ تەماشا دەکرێت و خانەوادەکەی توشی بێ زاری وغەمباری دەکات[1].

لەیەکێك لە دەقەکانی پەرتوکە إسرائیلەکاندا هاتووە و دەڵێت: ((هیچ ڕزقێك لەوە باشتر نیە کە خوا کوڕێکت بداتێ و هیچ شتێکیش لەو بەشە خراپتر نیە کە کچت بداتێ ))[2].

---

١– مركز المرأة في الشريعة اليهودية (السيد عاشور) ص ١٩٢.

٢– الأحكام الشرعية للأحوال الشخصية للأسرائيل : أحمد شلبي.

ئافرت لە پێش شوو کردنیدا لە ماڵی باوکی دا بە تەواوی مانا مل کەچە بۆ فەرمانەکانی باوکی و بەئارەزووی خۆی ژیانی بۆ دیاری دەکات.

لە کاتی شوکردنیش دا وەك کاڵەیەك لەلایەن باوکیەوە دەفرۆشرێت بە زاوا هەروەك لە (سفر الخروج) دا بەم جۆرە باس کراوە: ((فاالزواج في اليهودية صفقة شراء تعديها المرآة مملوكة تشتري من آبيها عند النكاح فيكون زوجها سيدها المطلق)) [1].

واتە: هاوسەرگیری لەناو جولەکەدا وەك مامەڵەی کڕین و فرۆشتنە، ئافرەت لە باوکی دەکڕدرێت لەکاتی مارەبڕین دا و هاوسەرەکەی دەبێتە خاوەنداری ڕەهای!!

لەم کاتەدا ئافرەت لەماڵی مێردی خۆیدا ماف خاوەندارێتی و مامەڵە کردنی نیە بە ماڵی پیاوەکەیەوە مەگەر لەسەر ئیزنی ئەو نەبێت، هەروەك لەیاساکانی شەریعەتی جولەکەدا پیاوخاوەنداری ڕەهایەو ئافرەت خاوەی هیچ نیە چونکە لەکاتی مارەکردنیدا بە پارە لەباوکی کڕاوە!!!

ئافرەت لەلای جولەکە یەکێکە لە شتە پیسەکان، ئەویش لەکاتی سوڕی مانگانە (الحیض)، کاتی منداڵ بوون و نابێت دەست بدات لەهیچ کارێکی ماڵ تا پاك دەبێتەوە، کە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر بە سوك تەماشا کردن و بێ ڕێزی ئافرەت لەلای جولەکە، تەنانەت لەکاتی جیابوونەوەش دا لەگەڵ پیاوەکەیدا (الطلاق) لە شەریعەتی جولەکەدا ئافرەت وەك چەقۆیەك وەهایە بە دەستی پیاوەکەیەوە و هەرچۆنی بوێت بەو جۆرە ڕای دەوەشێنێ و بەکاری دێنێ و هۆکارەکان لە جیابوونەوە بە هیچ جۆرێك باس ناکرێت، بەڵکو بەجێ دەهێڵرێت بۆ ویستی پیاوەکە و ژن لەم کاتەدا لە ژێر ڕەحمەتی پیاوەکەیدا ژیان بە ترسەوە بەسەر دەبات [2].

---

١- اليهود في التأريخ الحضارات الاولى : غوستاف لوبون ، ص٥٠.

٢- مركز المرأة في الشريعة اليهودية (السيد عاشور) ص ٩٩.

دەتوانین پلەو پایەی ئافرەت لە تەشریعی جولەکەدا بەم جۆرە بناسین:

١-ئافرەت بنچینەی خراپەیە و ئەو بەرپرسی یەکەمە لە دەرکردنی ئادەم لە بەهەشت. ! !

٢-ئافرەت لە یاساکانی تەشریعی جولەکەدا میرات نابەن و بێ بەشن لێ ی، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە خاوەنی برا نەبێت.پاشان ئافرەت لە ماڵی مێرد میراتی بەرناکەوێت.

٣-ئەگەر ئافرەت تەنها ناڕەواییەکی ئەنجام دا لە ماڵی مێردەکەیدا ئەوە پێویستە لەسەر پیاوەکەی طەلاقی بدات.

٤-گەر پیاوێك لەسەر جێگەی خێزانی خۆی کاری داوێن پیسی لەگەڵ ئافرەتێکی تردا ئەنجام دا ئەوە بۆ خێزانەکەی نیە کە هیچ سکالایەك تۆمار بکات لە دژی پیاوەکەی کە کاری زینای لەگەڵ ئافرەتێکی تردا ئەنجام داوە.

٥-ئافرەت لە تەشریعی جولەکەدا بە عەقڵ کام دانراوە، تەنانەت یەکێك لە حاخامەکانی جولەکە دەڵێت(أن تعليم المرأة سخافة) .

واتە : فێرکردنی ئافرەت سەخافەتە ! !

بێ گومان ئەمەی کە باس کرا دەربارەی سەیرکردنی ئافرەت لەلای جولەکە، دڵۆپێکە لە دەریایەك لەو سوکایەتی و بێ ڕێزیانەی کە جولەکە بەرامبەر بە ئافرەت دەیکەن و بۆچونیان دەربارەی هەیە.

دووەم : ژن هێنان (الزواج) Marriage:

گەر سەرنجی تەورات (عهد القديم) بدەین دەبینین کەوا جەخت لەسەر ژن هێنان و کاری هاوسەرگیری دەکاتەوە و هۆکارەکەشی دەگێڕێتەوە بۆ زۆر بوون و زیاد بوونی نەوە، لە کتێبی (الاحوال الشخصية للأحكام الشرعية للإسرائيلين) دا دەڵێت: ((الزواج فرض على كل إسرائيلي و أن الأعزب يرتكب جريمة لا تقل عن جريمة القتل، لأن عدم الزواج سبيل لاءطفاء نور الله) )[١] .

---

١- التلمود و التأريخ و تعاليمة : ص ٥٧-٥٨: ظفر الاسلام خان.

واتە: کاری هاوسەرداری فەرزە لەسەر هەموو إسرائیلیەك -جولەکەیەك- وە مانەوە بە کچێنی تاوانە و هیچی کەمتر نیە لە تاوانی کوشتن، چونکە نەبوونی هاوسەرگیری ڕێگەیەکە بۆ کوژانەوەی نوری خوا!!!.

سێ یەم: گرێ بەستی هاوسەرگیری (عقد الزواج) Ketubbah:

گرێ بەستی هاوسەرگیری بە زمانی عبری پێ ی دەوترێت (کتوباه) کە ئەویش بریتیە لەو گرێ بەستەی کە لە نێوان بووك و زاوادا ئەنجام دەدرێت و زاوا ملزم دەکرێت بە هەندێ کار لە بەرامبەر بوکدا، وە گرێ بەستی هاوسەرگیری یەکێکە لە مەرجەکانی ژن هێنان لە شەریعەتی جولەکەدا، بێ گومان دەقەکانی ئەم هاوسەرگیریە بە زمانی ئارامی دەنوسرێتەوە و دوو شاهید واژۆی ئەم گرێ بەستە دەکەن، پاشان هەندێ شتی تر لەو گرێ بەستەدا دەنوسرێ بە زمانی ئەو شوێنەی کە ئە دوو کەسەی تێدا دەژیو دواتر لەلای بوك ئەو نوسراوە دەپارێزرێت ) [1].

هیچ دەقێك نیە لە (عقد قدیم) (تەورات) دەربارەی تەمەنی شوکردنو ژن هێنان، تەنها ماددەی (٢٣) ی کتێبی (إبن شمعون) ی جولەکە نەبێت، کە باس لە تەمەنی (١٣) سالّی دەکات بۆ نێرینەو تەمەنی (١٢) سالّی بۆ مێینە.کە کاتی ژن هێنان و شوکردنیانە و تەمەنی بالّغ بوونە، هەرچەندە کۆمەلێکی تری جولەکە بەناوی (القرائیین) جیاوازیان هەیە لەسەر ئەم مەسەلەیە و دەلّێن (تەمەنی گونجا و بۆ ژن هێنان بە نیسبەت پیاوە وە بریتیە لە (١٨) سالّ و تەمەنی گونجاویش بۆ ئافرەت لە شوکردن بریتیە لە (١٦) سالّ) [2].

هەروەك پێشتر باسمان کرد کە باوك سەردار و گەورەی ڕەهای منداڵەکانیەتی و بە ئارەزووی خۆی چارەنوسی منداڵەکانی دیاری دەکات، تا ئەو ئەندازەی کە کچی خۆی دەتوانێت بفرۆشێت بەو کەسەی کە پارەی باشی دەداتێ ).

---

١- موسوعة الیهود و الیهودیة : عبدالوهاب المسیري .

٢- الأحکام الشرعیة للأحوال الشخصیة للأسرائیلین: صابي بن شمعون (ص٧).

داوی تەواو بوونی گرێبەستی هاوسەرگیری، ئاوا پەیمان دەدات بە بووک لە سەر (جل و پۆشاک بۆ کڕینی و چارەسەرکردنی گەر نەخۆش کەوت و پارە پێدانی و بەڕێوەبردنی پێداویستیەکانی ژیانی و بەخاک سپاردنی لەکاتی مردنیدا، پاشان بە پێدانی ماڵی میرات بە منداڵە کورەکانی!! پاشان ئەو ئافرەتە بەپاکی و پڵست هەڵکردوو ناو دەبرێت گەر بەرپەرچی دواکاری پیاوەکەی بداتەوە لە مەسەلەی ژن و مێردایەتیدا و کاری سەرجێگەی دا و بە پێچەوانەوە.

هەر بۆیە (إبن شمعون) لە مادەی (٩٧) دا دەڵێت: ((لیس للمرأة منع الرجل عن نفسها بغیر عذر، وإلا عرضت حقوقها للضیاع)) [١].

واتە: نابێت بەرهەڵستی بکات لە ماف دانی بە پیاوەکەی بەبێ بیانو، ئەگەر ئەم کارەی ئەنجام دا ئەوا تەواوی مافەکانی لەدەست دەدات.

پاشان پیاو لەم بوارەدا سەرپشکە لەوەی کە چۆن لە ژەت لە هاوسەری ببات بە هەموو جۆرێك، هەروەك چۆن پارچەیەك گۆشت لە بازاڕ دەکڕێت و بە ویست و ئارەزوی خۆی، دەی کوڵێنێ، دەی برژێنێ، سوری دەکاتەوە ئارەزوی خۆیەتی، لەم بارەوە نمونەی ئافرەتێك باس دەکەن کە دێتە لای یەکێك لە حاخامەکانی جولەکە و شکات لە پیاوەکەی دەکات بە وەی کە لە ڕێگەی دروستەوە کاری ژن ومێردایەتی لەگەڵدا ناکات!!

حاخامەکەش لەوەڵامدا پێ ی دەڵێت: ((لا یمکنني أن أمنعه عن هذه المسألة یا ابنتي، لأن الشرع قدمك قوتا لزوجك)) [٢]

واتە: من ناتوانم ڕێگری لە پیاوەکەت بکەم لەسەر ئەم مەسەلەیە ئەی کچی خۆم، چونکە شەرع -واتە شەریعەتی جولەکە- تۆی کردوتە پارویەك بۆ پیاوەکەت.

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢- الكنز المرصود في القواعد التلمود : روهلنج.

**گرێبەستی هاوسەر گیری لە شەریعەتی جولەکەدا سێ بنەمای هەیە کە بریتین لەمانە:**

١.دەبێت ناوی ئافرەتەکە لەسەر پیاوەکە بهێنری و پیرۆز بکرێت بەوەی کە عالقە لە پەنجەی یەکتر بکەن بە شاهیدی دوو کەس.

٢.دەبێت ئەو گرێ بەستە بە پێ ی یاساکانی شەریعەتی جولەکە بێتو بنوسرێتەوە.

٣.نوێژ دەکرێت لەو کاتەدا و پێ ی دەڵێن: (صلاة البركة) ئەویش بە ئامادە بوونی (١٠) پیا وبەلایەنی کەمەوە ) [1]

**چوارەم : فرە ژنی (تعدد الزواج):**

بەشێوەیەکی ڕەها یاساکانی تەشریعی جولەکە فرە ژنیان حەڵاڵ کردووە و سنورێکیان بۆ دا نەناوە، وە لە دەقەکانی تەورات (العهد القديم) دا هیچ دەقێك نیە دەربارەی حەرام کردنی فرە ژنی، هەرچەندە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەلایەن هەندێ لە حاخامەکانی جولەکەوە هەوڵی زۆر درا بۆ دانانی سنورێك بۆ فرە ژنی بە تەواوی حەرام کراو سزاش ئامادە کرا بۆ ئەو کەسەی کە چەند ژنێك لە یەك کاتدا کۆدەکاتەوە، سزاکەشی بریتی بوو لە بە کافر سەیر کردن و دەرکردنی لە کۆمەڵگای جولەکەدا ) [2] .

بەڵام دەقەکانی وتەی (إبن شمعون) پێچەوانەی قسە حاخامەکان بوو بەوەی کە دەڵێت: ((لا ينبغي للرجل آن يكون له آكثر من زوجة...)) [3] .

واتە: ئاساییە پیاو زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێت.

یان لە وتەیەکی تریدا دەڵێت: ((إذا كان الرجل في سعة من العيش و تقدير أن يعدل، أو كان له مسوغ شرعي جاز أن يتزوج بأخرى)) [1]

---

١- اليهودية عقيدة و شريعة ص ١٢٨.

٢- الفكر الديني اليهودي أطوره و مذاهبه: حسن ظاظا ، ص ١٩٣.

٣- الأحكام الشرعية : ابن شمعون.

واتە: ئەگەر پیاوێك ژیانی باش بوو- واتە دەوڵەمەند بوو- لە توانایدا بوو کە دادپەروەر بێت، یان بەڵگەیەکیشەرعی بەدەستەوە بوو، ئەوە ڕێگە پێدراوە کە ژنێکی تر بهێنێت.

بەم جۆرە نە لە تەورات و نە لە تەلمودا دەقێك نیە لەسەر قەدەغە کردنی فرە ژنی و ئەو بۆچونانەی کە سنور بۆ فرە ژنی دادەنێت و قەدەغەی دەکەن تەنها قسەی حاخامەکانە.

**پێنجەم : جیابوونەوە (الطلاق):**

یاساکانی شەریعەتی جولەکە ڕێگەیان داوە بە جیابوونەوەی ژن و مێرد لە یەکترو یاساغی نەکردووە..

بێ گومان ئەم مافانەش دراوەتە پیاوو ئافرەت هیچ مافێکی تیایدا نیە و پیاو بە ئارەزوی خۆی بەکاری دەهێنێت، هەر بۆیە مەسەلەی جیا بوونەوە لە ناو جولەکەدا بە ڕێژەیەکی زۆر بڵاوبۆتەوەو پیاوان لەسەر مەسەلەی زۆر سادەو بێ نرخ هاوسەرەکانی خۆیان طلاق دەدەن، تەنانەت لەسەر جوان ئامادە نەکردنی خواردن، هەروەك هەندێ لە زانایانی جولەکە دەڵێن: ((إن الزوج إذا لم تحسن طبخة آكل فلزوجها أن يطلقها)) )[2].

واتە: ئەگەر ئافرەتێك خواردنی باش دروست و ئامادە نەکرد ئەوە بۆ پیاوەکەی هەیە لێ ی جیا بێتەوە.

هەروەك وتمان (طلاق) بەدەستی پیاوە، ئەویش لە مادەی (٣٢٤) ی کتێبەکەی (إبن شمعون) دا بە ئاشکرا باس لەم حاڵەتە دەکات و دەڵێت: ((الطلاق في يد الرجل)) ) واتە: جیابونەوە (طلاق) لە دەستی پیاودایە.

پاشان لە مادەی (٣٢٥) دا دەڵێت: ((قبول المرأة للطلاق ليس شرطا)) )[3]

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢- مركز المرأة في الشريعة اليهودية : عسى عاشور: ص٤

٣- الأحكام الشرعية : ابن شمعون

واتە: قبولّ بوونی طەلاق لەلایەن ئافرەتەوە بە مەرج ناگیرێت بۆ جیا بوونەوە.

بێ گومان جولەکە وشەی (طلاق) بۆ ئەم مەبەستە بەکار ناهێنن، بەڵکو وشەی (جروشیم) کە بەمانای دەرکردن لە مالّ دێت (الطرد من البيت)

شێوازی وتنی دەستە واژەی (طلاق) لەلایەن پیاوەوە بەم جۆرە دەبێت کە (إبن شمعون) لە مادەی (٣٢٥) دا دەڵێت: ((يسلم الرجل بيده وثيقة الطلاق لزوجته قائلا لها: إستلمي و ثيقة طلاقك فانت طالق و صرت حلا لغيري) )[١]

واتە: پیاو بەدەستی خۆی گرێ بەستی جیابونەوەی دەدات بە دەستی خێزانەکەیەوە و پێ ی دەڵێت: بگرە گرێبەستی جیابوونەوەت، تۆ طەلاق دراویت و حەلاّلی بۆ کەسێکی تر.

شەشەم: میرات (الميراث):

یاساکانی شەریعەتی جولەکە بڕیاری میراتی داوە بەتەنها بۆ کوڕ و کچ تێیدا بێ بەشە.

((کاتێک پیاوێک دەمرێت و خاوەنی کوڕو کچە بەتەنها کوڕەکانی میرات وەردەگرن. کچەکانی لە سەروەت و سامانی باوکیان بێ بەشن) )[٢]

تەنها ئافرەت لە یەك حالّەت دا میراتی مالّی باوکی بەردەکەوێت کە برای نەبێت و بەو مەرجەشی کە شوی کردبێت کەسێکی نزیك هۆزەکەی خۆی، ئەویش لەبەر ئەوەی کە پارەو مالّی ئەو میراتە نەچێتە دەرەوەی ئەو خانەوادەو هۆزە، بەلاّم گەر پێچەوانەی ئەم یاسایە ئافرەتان جولاّنەوەو شویان کردبێت یان شو بکەن بە کەسێکی دوورو بێگانە، ئەوە لەو مافەی بێ بەشە.

بەڵێ یاساکانی شەریعەتی جولەکە هیچ مافێکیان لە مەسەلەی میرات بۆ ئافرەت دانەناوە ئەگەر کچ بێت یان ژن بێت، تەنها بەو مەرجە نەبێت کە باسمان کرد.

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢- مركز المرأة في الشريعة اليهودية (السيد عاشور) ص ٢٥٠.

به شێوەیەکی گشتی باساکانی میرات لە شەریعەتی جولەکەدا بەم جۆرەیە:

١.باوك میرات لە کوڕ دەبات و کوڕیش میرات لە باوك دەبات.

٢.ئەگەر باوك مرد کوڕی نەبوو ئەوە کچ لەم حاڵەتە میرات دەبات.

٣.دایك نە میرات لە کوڕ دەبات، نە کچ.

٤.هەرچی ئافرەت دەستی کەوتووە لە سەروەت وسامان بە مردنی دەبێت میرات بۆ پیاوەکەی و کەسی تری تێدا بەشدار نیە لە منداڵەکانی و نزیکەکانی، چما منداڵەکانی لەو پیاوە بن یان لە پیاوێکی تر.

جولەکە هۆکاری میرات دان بە نێرینەو بێ بەش کردنی مێ یینە بەوە باس دەکەن کە دەڵێن:

١.کوڕ پارێزگاری لە نەژادی باوکی دەکات، بەڵام کچ بە حوکمی ئەوەی کە شو دەکات و دەڕوات بۆ ناو خێزانێکی تر ناتوانێت بەم کارە هەڵسێت.

٢.کوڕ پارێزگاری لە دابو نەریتی خێزانەکەی دەکات و بیروباوەڕەکانی دەپارێزێت لە کاتێکدا کچ توانادار نیە بەسەر ئەم حاڵەتەدا.

٣.کوڕ نافرۆشرێ لەکاتی هاوسەرداری بەڵام کچ دەفرۆشرێ!!!؟.

٤.کوڕ لە جێ ی باوکە لە ڕووبەڕووبونەوەی پێشهاتەکاندا.

حەوتەم: ئەو ئافرتانەی کە حەرامە هێنانیان لە شەریعەتی جولەکەدا:

لە شەریعەتی جولەکەدا هێنان و داخوازی کردن و ژن و مێردایەتی لەگەڵ ئەم چەند کەسەدا قەدەغەیە و حەرامە بەشێوەیەکی گشتی لە (سفر التکوین) دا باسیان لێوە کراوە کە بریتین لەمانە:

١.دایك (الام).

٢.ژنی باوك (باوە ژن).

٣.خوشك (الأخت).

٤.کچەزا و کوڕەزا (بنت الابن بنت البنت).

٥.زڕخوشك.

٦.بوك (زوج الابن).

٧.ئامۆژن (زوج العم).

**هەشــتەم: شــوكردنی ئــافرەتی جولەكــە بــە غــەیرە جولەكــە و بــە پێچەوانەشەوە:**

جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان (سفر) ەكان دا دەربارەی ئەم باسە، لە (سفر اللاويين) دا زۆر بە ئاشكراو ڕاستەوخۆ باس لەم بوارانە نە كراوە، بەتەنها ئەوەندە نەبێت كە (إصحاح) ی (٢٤) دا باس لە حەڵاڵ بوونی ئەم حاڵەتە دەكات و بەكارێكی ئاسای دەزانێت.

تەنانەت باس لە ئافرەتێكی جولەكە دەكات بەناوی (إبن شلوميه) كە شوی كردووە بە پیاوێكی غەیرە جولەكەی (مصر) ی.

بەڵام لە (سفر التثنية) دا ئەم مەسەلە بە پێچەوانەوەیە و حەرامە ئافرەتی جولەكە شو بە پیاوانی غەیرە جولەكە بكەن و بە پێچەوانەشەوە.

ئەم یاسایەشیان لەوەوە سەرچاوەی گرتووە كە جولەكە خۆیان بە گەلی هەڵبژاردەی خوا دەزانن و غەیری خۆشیان بە ئاژەڵ و گوێ درێژ، هەر لەبەر ئەم حاڵەیە كە خۆیان لە ئاست غەیری خۆیان دا نابیننەوە و لەم كاتەدا هۆكارەكە هۆكاری ڕەگەز پەرستی و دەمار گیرییە نەك دینی.

لە هەندێ حاڵەتدا ئەو منداڵەی لە نێوان ژن و پیاوێكی جولەكە و غەیرە جولەكە دا دروست دەبێت بە منداڵی ناشەرعی (زۆڵ) ناودەبرێت.

هەرچەندە ئێستا ئەم یاسایە لەناو جولەكەدا كاری پێناكرێت و ئافرەتی جولەكە خۆیان ڕچە شكێنی ئەم بەستەڵەكە فكریەی جولەكە بوون و كاری هاوسەرگیری لەگەڵ غەیری جولەكەدا ئەنجام دەدەن.

**نۆهـەم: هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژن دا (الـزواج الارملـه) levirate Marriage:**

بە زمانی عبری پێ ی دەوترێ (یبوم) (بێ گومان) بێوەژن (الارملة) بەو ئافرەتانە دەوترێت کە شویان کردووە و دواتر پیاوەکانیان لەدەست داوە جا بەهەر هۆکارێك بێت.

لە شەریعەتی جولەکەدا بەو ئافرەتانە دەوترێت کە پیاوەکانیان مردون و منداڵیان لێیان نەبووە.

(لە یاساکانی (العهد القدیم) (تەورات) دا حەرامە کە ئافرەتێکی بێوەژن شو بە برای مێردەکەی بکات گەر منداڵی هەبێت، بەڵام لە بەرامبەردا واجبی کردووە لەسەری کە شو بەبرای مێردەکەی بکات دوای مردنی مێردەکەی گەر منداڵی لە پیاوە مردووەکەی نەبوو بێت، هەروەك لە (سفر التثنیة) دا دەڵێت: (گەر پیاوێك خاوەنی ژنێك بێت و منداڵی لێی نەبێت و دواتر پیاوەکەی بمرێت ئەوە دەبێت ژنەکەی شو بکاتەوە بە برای مێردەکەی بۆ ئەوەی غەیرە جولەکەیەك نەی خوازێت، هەروەك مێرد مامەڵەی لەگەڵ دا دەکات و ئەو منداڵەی لە نێوانیان دا دروست دەبێت، ناو دەنرێت بە ناوی ئەو پیاوەی کە پێشتر هاوسەری ئەم ئافرەتە بووە و پاشان مردووە، ئەمەش لەبەر ئەوە کە ناوی ئەو کەسە مردووە نەسرێتەو و ون نەبێت لەناو إسرائیلیەکاندا) )[1])

بەڵام ئەگەربرای پیاوە مردووە کە (هێوەر) ی ئەم ئافرەتە دەکات، بەم ئافرەتە ڕازی نەبێت جا لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئەو ئافرەتە بێوەژنە دەچێت بۆلای ریش سپی ئەو جێگەیەی کە تیایدا دەژین سکاڵا لە هێوەرەکەی دەکات.

پیاوانی ریش سپیو ماقوڵی ئەو شوێنە بانگی کابرا دەکەن و قسەی لەگەڵدا دەکەن دەربارەی ئەم مەسەلەیە، سەرئەنجام گەر نەیان توانی قەناعەت بە کابرابکەن لەسەر ئەوەی کە براژنەکەی بهێنێت، ئافرەتە بێوەژنەکە لە بەرچاوی

---

١- سفر التثنیة : ٢٥: ١٥-١٠.

خەڵكی ئەو شوێنە دا نەعلەكانی لە پێ دادەكەنێ و دەكەوێتە سەری مێوەرەكەی وە پێ ی دەڵێت: (ئاوا دەكرێت لە پیاوێك كە ئەم داخوازیە ئەنجام نەدات) [1]

دەیەم ؛ خەتەنەكردن لە دینی جولەكەدا؛

بەزمانی (عبری) ی پێ ی دەڵێن (بریت میلاە) و لەیاساكانی تەشریعی جولەكەداخەتەنەكردنی كوڕ یەكێكە لەواجباتەكان ودەبێت كوڕلە ڕۆژی هەشتەمی لەدایك بونیداخەتەنە بكرێت گەر حالەتەكەی تەندروستیو باش بێت، هەروەك لە(سفرالاویین) دا بەم جۆرە هاتوەو دەڵێت: ((وفي يوم الثامن تختن قلفة المولود ) ) [2]

واتە: لەڕۆژی هەشتەم دا لەدایك بووەكەتان خەتەنە بكەن (بێ گومان مەبەستی منداڵە كوڕەكانە).

جولەكە لەم مەسەلەیەدا زۆرتوندن و ئەوانەی كە خەتەنە نەكراون بۆیان نیە لە خواردنی جەژنی (الفصح) بخۆن ! !

خەتەنە فەرزە لەسەر هەموو ئەوانەی كەسۆزیان بۆ جولەكە هەیە ودەیەوێت كاری هاوسەرگیریان لەگەلدا ئەنجام بدات.

كاری خەتەنە كردن هێندە گرنگە لەلای جولەكە كەتا ئەمرۆش بەردەوامەو ئەنجامی دەدەن تەنانەت لەلایەن كەسایەتیە نوێ خوازەكانیشیانەوە، بەسەرجەم مەرج و طقوسەكانیەوە) ) [3]

یانزەهەم: (سوو) (الربا) لەیاساكانی تەشریعی جولەكەدا؛

هەركات باس لەسیفەتی چەپەڵی (سوو) (الربا) لە هەر جێگەو شوێنێكدا بكرێت چ لەئێستەوچ لە سەردەمانی ڕابردوودا، خێراو دەستبەجێ جولەكەت دێتەوە بەرچاو، چونكە هیچ گەلێك نیە لەسەر ڕووی زەویداوبەدرێژای مێژوو، تەنانەت ئێستاش هێندەی جولەكە سەرقال و خەریك بن بەكاری (سوو) خۆری ومامەڵە پێوە

---

١- موسوعة اليهود و اليهودية : عبدالوهاب المسيري .

٢- سفر الاحبار (اللاويين) الاصحاح (١٢) الفقرة (٧).

٣- اليهودية عقيدة و شريعة: د. أسعد السحمراني.

کردنی، قورئانی پیرۆز گەورە ترین شاهیدیەك کەلەسەر جولەکە دابێتی بریتی بووە لەوەسف کردنی ئەم گەلە بەدکارە بەم سیفەتە بەددەوخواردنی مالی خەلکی بەناهەق.

هەروەك دەفەرمونیت: ﴿ وَأَخْذِهِمُ الرِّبَوٰا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَٰطِلِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ النساء: ١٦١. واتە: (سودیان) وەردەگرت، لە کاتێکدا کە قەدەغە کرا بوو لەسەریان، هەروەها مالی خەلکیان بە نارەوا دەخوارد، بێ گومان بۆ بێ باوەران سزایەکەی پر ژانمان ئامادە کردووە.

بەلێ ئایەتەکە زۆر بە ئاشکرا پەردە لەسەر گەندەلّ ترین سیفەتیان لادەدات کە کاری سو خۆریانە، لە کاتێکدا کە حەرام کرابوو بۆیان لەسەر زاری پێغەمبەرانیانەوە کە مامەلّەی پێ نەکەن و ئەنجامی نەدەن، هەر لە وساتەوە قسەی پێغەمبەرانیان پشت گوێ خستووە و دەستبەرداری ئەم سیفەتە خراپە نەبوون.

بێ گومان (سوو) (الربا) بریتیە لەو پارە زیادەیەی کە لە بەرامبەر قەرزێکدا خاوەن پارە وەری دەگرێت لە قەرز کەرەکە، بەو پارە زیادەیە دەوترێت ((الفائدة) ) یاساکان لە شەریعەتی جولەکەدا (سوویان) لە نێوان جولەکەدا حەرام کردووە، کە ئەگەر جولەکەیەك پارەی بە قەرزدا بە جولەکەیەکی تر نابێت لە بەرامبەردا سووودی لێ وەربگرێت، هەروەك لە (سفر اللاويين) دا دەلّێت:

((ئەگەر برایەکت – واتە جولەکەیەك– دەست کورت بوو هانای بۆ هێنایت کە قەرزی بدەیتێ وە یارمەتی بدەیت، ئەوا رێگەی پشان بدە و یارمەتی بدە و لەبەرامبەربەو قەرزەی کە دەی دەیتێ، (سوو) واتە زیادەی لێ مەسەنە...) )[1] بەلام لە بەرمبەریدا کاری (سوو) خۆری حەلالّ کردووە لە نێوان جولەکەیەك و غەیرە جولەکیەکدا، کە ئەمەش لە (عهد القديم) دا و لە (سفر التثنية) دا بەم جۆرە هاتووە و دەلّێت: ((قەرز مەدە بە براکەت بە (سوو) هەروەکو چۆن قەرز دەدەیتە

---

١– سفر الاحبار (اللاويين) : الاصحاح (٢٥) برگەکانی (٣٥,٣٦).

غەیرە جولەکەیەك بە (سوو)، بەڵکو ئەوەی جولەکەیە بزانە وقەرزی مەدەریێ بە (سوو) زیادە) )[1]

دوانزە: ڕیش(اللحیە) لەلای جولەکە Beard:

هێشتنەوەی ڕیش و بەردانەوەی لە یاسای شارستانیەتە کۆنەکان دا بەڵگە بوو بۆ قۆناغی باڵغ بوون و پیاوەتی لە مرۆڤی نێرینەدا، یەکێك بوو لە مەرجەکانی پیاوەتی.

لەلای جولەکە بەردانەوەی ڕیش یەکێکە لە فەرمانە دینیەیەکان کە دەبێت تاکی جولەکە جێ بە جێ ی بکات، (تەلمود) ڕیش بە یەکێك لە جوانیەکانی ڕوخساری پیاوەتی وەسف دەکات، هەرچەندە سەردەمانێك هێشتنەوەی ڕیش و بەردانەوەی لەلایەن فەرمانڕەواکانیانەوە قەدەغە کرا بەو بیانووەی کە بەردانەوەی ڕیش جۆرێکە لە جۆرەکانی گۆشەگیری و دوور کەوتنەوە لە کۆمەڵگاو، دژی پێش کەوتن و نویێ گەرییە.

جولەکەکانی ڕۆژئاوا ڕیش ناهێڵنەوەو دەی تاشن، بەڵام جولەکە(ئەرسۆزوکییەکان) (الیهود الأرثوذکس) ڕیش دەهێڵنەوەو تاشینی بە حەرام دەزانن) )[2].

---

١- سفر التثنیة: الاصحاح (٢٣) برگەکانی (٢٠،٢١).

٢- موسوعة الیهود و الیهودیة : عبدالوهاب المسیري .

# بەندی پێنجەم

## باسی یەکەم: چیرۆکی پروتوکولات (حکماو الصهیون)

یەکێکی تره لەو لایەنە گرنگانەی کە زۆر پێویستمان بە شارەزا بوون و تێگەیشتنە لە دەربارەیەوە بەتایبەتی لەم سەردەمەدا دەربارەی جولەکەی نەفرین لێ کراو بریتیە لە (چیرۆکی پروتوکولات) کە خوێنەری بەڕێز زیاتر وزۆرتر لەم گەلە بەدکارەو سیفەتو ئامانجە دۆزەخیەکانیان ئاشنا دەکات شارەزای تەواویان پێ دەبەخشێت...

ـ سەرەتا پێویستمان بە ڕاڤەکردنی ئەم چەمکە هەیە و دواتر باس لە ناوەڕۆکەکەی دەکەین بە گشتی.

ووشەی (بروتوکول) چەندین مانی هەیە کە بە واتای (پەیمان) یان (بریار) یان (مەبادء) دێت.

ووشەی(حکماء) بەواتای خاوەن بریار یان ریش سپیان یان دەسەڵاتدارانی دینی جولەکە مانای دێت.

ووشەی(صهیون) دەستەواژەیەکی کەنعانیەو ناوی شاخێکە لە فەلەسطین نزیك ((بیت المقدس)) [1].

((هرتزل)) بەدامەزرێنەری بزوتنەوەی (صەهیونیەن) دادەنرێت ئەم کەسە لەساڵی(١٨٦٠) لە شاری (بودابست) لەدایك دەبێت، و لەساڵی (١٨٩٥) کتێبێك دەنوسێت (الدولە الیهودیـة)، لە ساڵی(١٩٠٤) دەمرێت و لاشەکەی دەبەنەوە بۆ (فەلەسطین) و بەخاکی دەسپێرن [2] !!

---

١- أضواء على بروتوكولات حكماء الصهيون (النصوص الكاملة) رجا عبدالحميد عرابي.

٢- حقيقة اليهود : ص(٢٩)

## باسی دووەم: بیرۆکەی پرۆتوکولات:

((هرتزل) ) لەناو جولەکەکان دا بانگەشەی ئەمەی کرد کە کۆنگرەیەکی صەهیونی جیهانی ببەسترێت لە شاری (میونخ) ی ئەلمانیاندا.

بەلام بانگەشەکەی سەری نەگرتو ولاتی ئەلمانیایان بەجێ هێشت و بەرەو شاری (بال) لە سویسرا کەوتنە ڕێ و لەسالی (١٨٩٧) دا و بە ئامادەبوونی (٢٠٤) ئەندامی گەورەی بزوتنەوەی صەهیونی لە سەرئاستی هەموو جیهان یەکەم کۆنگرەیان سازدا و، لە ئانجامدا (٢٤) بڕیاریان دا سەبارەت بە بوارە جیاوازەکان – کە دواتر باسیان لێوە دەکەین- گرنگترین و لە پێشترینیان بریتی بوو لە دامەزراندنی دەولەتێکی سەربەخۆ بۆ سەرجەم جولەکەکانی جیهان لە خاکی – فەلەسطین-دا.) )[1]

بەلێ کۆنگرە کۆتای هات بە ئەنجامی بڕیاردان لەسەر (٢٤) برگەو ئەم کارە بەنهێنی ئەنجام درا، بەلام ویستی خوای گەورە وەها بوو کە ئەم کارە شەیتانی و دۆزەخیانە هەروا بە نهێنی نەمێنێتەوە و ئاشکرا بێت، ئەویش لەلایەن ئافرەتێکی خەلکی فەرەنساوە لەکاتی کۆبونەوە لەگەل سەرگەورەکانی فەرەنسادا و هەندێك لەو بەلگەنامانە ئاشکرا بکاتو بیگەیەنێتە دەستی (الیکس نیقولا نیفتشی) کە یەکێك بوو لەکەسایەتیە گەورەو پلەدارەکانی ئەو کاتەی ڕوسیا لە سەردەمی قەیسەریدا، دواتر بەلگە نامە ئاشکرابووەکە خرایە بەردەم زانایەکی ڕوسی بەناوی (سرجی نیلوس) بەمەبەستی دراسەکردنی بەشێوەیەکی زۆر ورد و، پاشان بەراوردکردنی خالەکان لەگەل ڕوداو پێشهاتە سیاسیەکاندا کە ڕویان دەدا ئەوانیش بریتی بوون لە:

– کێشانی نەخشەی زۆر ورد لەسەر تێکشاندنی دەولەتی قەیسەر لە ڕوسیادا و بلاوکردنەوەی بێ دینی و پیلان لە ڕێگەی ڕوسیاوە.

---

١- الصهيونية : عبدالقهار العاني-(٥٥).

- نەخشەكێشانیان بۆ لەناو بردنی خەلافەتی عوسمانی لەسەر دەستی جولەكە پێش دامەزراندنی دەوڵەتی جولەكە لە فەلەسطین.

- نەخشەسازی بۆ دروست كردنی و بەرپاكردنی جەنگی یەكەمی جیهانی كە براوەو دۆڕاوە بە قەد یەك خەسارەت مەند بن تیایداو لە نێوانیشیان دا جولەكە سودمەندی یەكەم بێت!!!

- بەڵام لە ساڵی (١٩٠١) ئەم بەڵگە نامانە بەردەستی زانای ڕوسی(سرجی نیلوس) كەوتن و چەند نوسخەیەكی كەمی لێ چاپ كرا بە زمانی ڕوسی لە ساڵی (١٩٠٢) دا، لەم كتێبەدا نوسەری ڕوسی (نیلوس) تەواوی نیەتە گڵاو دۆزەخیەكانی جولەكەی ئاشكرا كرد بۆ جیهان، لە ڕوسیادا جەنگ بەرپاكرا لەدژی جولەكەكانی ئەوێو هەزارانیان لێ كوشتن[1]، دوابەدوای ئەم ڕوداوە سەرگەورە وباوكی (صەهیونیەت) ((تیودور هرتزل) ) هەندێك بڵاوكراوەی بڵاوكردەوە سەبارەت بەوەی كە هەندێك بەڵگە نامەیان لێ دزراوەو بە (پیرۆزی پیرۆزەكان) (قدس الاقداسی) ناوی برد.

دواتر ئەوەی ڕاگەیان بە جولەكەكان كە لە هەموو شوێنك ئەوە بڵاوبكەنەوە كە (بروتوكولات) كاری ئەمان نیە، بەڵكو دروستكراوە و خراوەتە پاڵ جولەكە، بەڵام هەوڵەكانی بێ بەرهەم بوون و جیهان باوەڕی بەم درۆیانە نەكرد، چونكە بەراوردی پێشهات و ڕووداوەكانیان دەكرد لەگەڵ دەقی بڕیارەكانی (بروتوكولات) دا و، زیاتر باوەڕیان لەسەر ئەوە دادەمەزرا كە جولەكە خاوەنی (بروتوكولات) ە و هەوڵی جدی دەدەن لە جێ بە جێ كردنی سەرجەم بڕیارەكان دا.

بۆ جاری دووەم و لە ساڵی (١٩٠٥) دا (نیولوس) بە شێوەیەكی فراوانتر و بە نوسینی پێشەكیەك (بروتوكولاتی) نوسییەوە و بڵاوی كردەوە و زۆر بە خێرایی چوونكە جولەكە هەوڵی زۆریان دا كە بڵاو نەبێتەوە وتەواوی هەوڵی خۆیان خستە گەڕ بۆ كۆكردنەوە وسوتاندنی سەرجەمی ئەو كتێبو بڵاوكراوانەی كە باسی

---

١- الخطر اليهودي : محمد خليفة التونسي: ص (٣٤).

(بروتوكولات) ی دەكرد، جا بە هەرنرخێك بێت، بەڵام جولەكە سەركەوتو ونەبوون لەم هەوڵەیاندا و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نهێنیاكانی ناو(بروتوكولات) وەرگێردرایە سەر زمانی زمانی ئەڵمانی و لە (بەرلین) دا بڵاوبویەوە و بەڵام بە هۆكاری زۆری ژمارەی جولەكە لەو وڵاتەدا ئەم كارە ڕاگیرا، هەرچەندە ژمارەیەكی زۆر لەم كتێبە لە چاپ درا بوو) )[1].

بێ گومان یەكەم كەسیش كە (بروتوكولات) ی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی (محمد خليفه التونسی) بوو لەژێر ناونیشانی (الخطر اليهودي) لەساڵی (١٩٥١).

## باسی سێهەم: ناوەڕۆكی خاڵە بڕیار لەسەردراوەكانی بروتوكولات چیتێدا بووە؟!

هەروەك پێشتر باسمان كرد كە بڕگەو بڕیارەكانی (بروتوكولات) لە (٢٤) بەند پێكهاتبوو، بەشێوەیەكی گشتی تەواوی (بروتوكولات) گوزارشتی لە سێ قۆناغی سەرەكی دەكرد بۆ جولەكەكانی جیهان كە بریتیبوون لەم قۆناغانە.

**قۆناغی یەكەم: پێش دامەزراندن و پێكهێنانی دەوڵەتێكی سەربەخۆ بۆ جولەكەكانی جیهان.**

گەورەترین ئامانجەكانی جولەكە لەم قۆناغەدا بریتی بوو لە ئامادە كردنی گەلی جولەكە بۆ دەستەلاتداریو پتە وكردنی ئەو بیرو باوەڕەی كە جولەكە، گەلی هەڵبژاردەی خوایە (شعب الله المختار) ە لەسەر زەویدا و دەبێتە خاوەنی دەسەڵات و خاك وئاڵاو یاساو دەستوری خۆی لەبەرامبەریشدا نابێت ژێردەستەو چەپۆكی هیچ گەل و دین و، دەستەڵات و ولاتێكی تر بن.

لە روانگەی ئەم بیروباوەڕانەوە جولەكە وایان دەبینی كە تەواویٚ جیهان لەبەر خاتری ئەمان دروست كراوەو دەبێت تەواوی خەڵكی ملكەچ و بەندەی جولەكە بن و

---

١- حقيقة اليهود : ص(٣٦-٣٧).

لە خزمەتیاندا هەڵسورێن، جولەکەکان لەم قۆناغەدا گەورەترین ئامانجیان بریتی بوو لە هەڵوەشاندن و لەت وپەت کردنی نیشتمان وگەلان و دینەکان و ئانەوەی فەسادو بەدکاری لە سیستەمی دەستەلاتداری لەسەرجەمی جێگەو شوێنەکان، ئەویش بە دروست کردنی گەندەڵی و ممارەسەکردنی ستەم لەلایەن فەرمان ڕەواو دەستەلاتدارەکان لەبەرامبەر گەلەکانیاندا.

لەبەرمبەریشدا هەڵنانی گەل و میللەتان لە دژی دەستەلاتدارو فەرمانڕەواکانیان و دژایەتی کردنی یاسا و مل نەدان بۆی.

لەم قۆناغە هەستیارەدا بڕگەو یاساکانی (بروتوکولات) نەخشەی بۆ دروست بوونی بیروباوڕو مەزهەبە جیاوازەکان کێشا، لەلایەک کاریان دەکرد بۆ بڵاوکردنەوەی شیوعیەت و بێ دینی و دروشمی پرولیتاری، لەبەرامبەریشدا هانی سەرمایەدارانیان دەداو بڵاویان دەکردەوە.

بەتایبەتی تر لەم قۆناغەیاندا ئامانجە زۆر سەرەکیەکانیان بریتی بوو لەم خاڵانە، کە لە ڕاستیدا کاری زۆر جدییان لەسەر کردو زۆر باشیان جێ بە جێ کرد، ئەوانیش بریتی بوون لە:

**ئامانجی یەکەم: هەوڵدان بۆ لەناوبردنو کۆتای هێنان بە دەولەتی عثمانی!!!**

گەر زۆر بەخێرای پێناسەیەکی دەولەتی عثمانی بکەین ئەوە دەڵێین: ((نەسەبی عثمان) یەکان دەگەڕێتەوە بۆ تیرەیەکی (تورك) لە سەردەمی (٧) ی کۆچی دا، بەرامبەری (١٣) زاینی.

ئەم تیرە تورکە لە کوردوستان دەژیان و خەریکی کاری شوانکاری بوون، باپیری عثمان ناوی (سلیمان) بوو لە ساڵی (٦١٧) ی کۆچی بەرامبەر، (١٢٢٠) زاینی لە کوردستانەوە کۆچیان کرد بەرەو ئەنادۆڵی تورکیا، لە ساڵی (٦٢٨) ی کۆچی (سلیمان) مردو کوڕێکی لێ بە جێما بە ناوی (آرطغرل)، ئەم پیاوە کەسایەتیەکی خاوەن هەیبەت و مسوڵمان بوو، بەشداری کرد لە شەڕی نێوان مسوڵمانەکان و مەسیحیەکان دا بەشداری (آرطغرل) بووە هۆی سەرکەوتینی مسوڵمان لەساڵی (٦٩٩) ی کۆچی بەرامبەر (١٢٩٩) ی زاینی...

## لەدایك بوونی (عثمانی كوری ارطغرل)

لەساڵی (٦٥٦- ١٢٥٨) لە دایك بوونی (عثمان) هاوكات بوو لەگەڵ هێرشی مەغۆلەكان بۆ بەغداد و كاولكردن ولە ناوبردنی شارستانیەتی ئەو شوێنە -بەغداد- بەسەركردایەتی هۆلاكۆ.

بەڵێ لەم ساڵە دژوارو بڕ كارەساتەدا (عثمان) لەدایك بوو، كە لەدایك بوونی ئەم سەرەتایەك بوو بۆ لەدایك بوونەوەو زیندو بوونەوەی ئومەتی إسلامی دەوڵەتی (عثمان) ی بەناوی (عثمان) ی كوری (آرطغرل) ەوە ناونراو خوای گەورە دەسەڵاتێكی وەهای پێدا كە زۆربەی زۆری وڵاتان كەوتنە ژێر دەستی دەستەڵاتدارێتی خەلافەت و لە هەموو شتێ گرنگ تر فەتح كردن وئازاد كردنی شاری (قسطنطنیه) بوو لەسەردەستی سەركردەی لاوی تەمەن (٢٢) ساڵ (محمد فاتح) لە ساڵی (٨٥٧) ی كۆچی بەرامبەر (١٤٣٥) ی زاینی دوای (٥٤) ڕۆژ ئەم شارە گەورەیە فەتح كرا[1].

بەڵێ خەلافەتی (عثمان) ی بوو بە (إمبراطور) لەسەر زەویداو نوێنەرایەتی تەواوی مسوڵمانان و ئومەتی إسلامی دەكرد و سەرجەم گەل و میللەتان و دینە كەمینەكان لە ژێر چەتری خەلافەتی (عثمان) ی دا بە ئازادیو سەربەخۆی دەژیان و ستەمیان لێ نەدەكرا، خەلافەت قەڵغان بو بۆ پاراستنیان لەدەستی زۆرداران و دوژمنانیان، یەكێك لەو گەل و خاوەن دینانەی تەواوی مافاكانیان دەستەبەر بوو لە ژێر حوكمی (عثمان) یەكان دا (گەلی جولەكە) بوو.

جولەكەكان لە وڵاتانی ئەندەلوس و ڕوسیا دا توشی لێدان و كوشتن و دەركردن و بەسوك توماشاكردنێكی زۆری مەسیحیەكان بوون كە لە (ئەوروپا) ی ئەو سەردەمە قەشەكان دادگاییەكیان دامەزراند بەناوی ((محاكم التفتیش) ) وە زۆرێكیان لە خەڵكی بەگشتی و جولەكە بەتایبەتی پێ لەناو برد، جولەكەكان هیچ مانایەكی ژیان و سەربەخۆی نەمایەوە بۆ مانەوەیان لە ژێر چەتری ستەمی

---

١- الدولة العثمانية عوامل النهوض و السقوط : د. علي محمد الصلابي.

گاورەکاندا، هەر بۆیە پۆل پۆل کۆچیان کرد بۆ ئەو ولاتانەی کە لە ژێر دەستەلاتی خەلافەتدا بوو...

بەڵێ کۆچ دەستی پێکردوو هەندێکیان لە (آزمیر) ی تورکیا مانەوە و جێگیر بوون[1]، دوای جێگیر بوونیان لە ژێر دەستەلاتی خەلافەتدا، حوکمەت یاساکانی شەریعەتی إسامی بەسەردا جێ بە جێ کردن لە پێدانی ماف و ئازادی و پاراستنیان لەدەستی دوژمنانیان وەك (أهل الذمة)، جولەکە بە تەواوی مانا سودمەند بوون لە بەسەر بردنی ژیانیان بە ئازادی و خۆش گوزەرانی و پارێزگاری لێ کردنیان بەپێ ی یاساکانی پاراستنی دەوڵەت و هەستی تەواویان دەکرد بە ئاشتی و ئارامی و ئاسایش و سەربەخۆی و ئازادی لەناو دەوڵەتی (عثمان) یدا ) .

## سلطان عبدالحمیدی دووەم و جولەکە

بۆ مەبەستی باش تێگەیشتنمان لەم باسە پێویستی تەواومان بە ئاشنا بوون و شارەزابوون هەیە لە هەوڵەکانی جولەکە دەربارەی کرینی فەلەسطین لە (سلطان عبدالحمید) و هەوڵە دوژمن کارییەکانی تریان.

سلطان عبدالحمید، دەستەلات داری ژمارە (٣٤) ی نێو خەلافەتی عثمانی بوو لە تەمەنی (٣٤) ساڵیداو لە (١٦ ی شعبان) ی (١٢٥٨) ی کۆچی بەرامبەر(١٨٤٢) ی زاینی دەستەلاتی گرتە دەست[2] .

ئەو سەردەمەی (سلطان عبدالحمید) دەستەلاتی گرتە دەست (خەلافەت) ی توشی قەیرانێکی گەورەی ئابووری بوو بوو، لەم کاتەدا جولەکەکان ئەم ڕووداوەیان بە هەل زانی بۆ گەیشتن بە ئامانجی پیسی خۆیان، ئەویش بەوەی کە سەرکردەی ماسۆنیەت (تیودور هرتزل) قەناعەتی بە هەریەك لە ولاتانی (ئەڵمانیا و بەریطانیا و فەرەنسا) کرد بەوەی کە زۆر فشار بخاتە سەر دەوڵەتی عثمانی و (سلطان عبدالحمید) کە خاکی فەلەسطین بداتە جولەکە.

---

١- تأريخ الدولة العثمانية : د. علي حسون : ص ٢١٤.

٢- اليهود الدولة العثمانية : د. أحمد النعيمي ص(٣٩).

که لەو کاتەدا هەروەك وتمان دەوڵەت توشی دەیان قەیرانی ئابووری جیاواز بوو بوو، تا ئەو پلەیەی کە لە ژێر ئاستی خراپییەوە بوو، پلانی جولەکەو وڵاتە زل هێزەکانی ئەوروپا لەوەدا بوو کە دەستەیەك زانایانی بواری ئابووری ئەوروپا سەردانی تورکیای عثمانی بکەن و لە نزیکەوە ئاگاداری بواری ئابوری تورکیا ببن و ئامادەی بژاردنی قەرزە کەڵەکە بووەکانی خەلافەت بن لە بەرامبەر پێدانی فەلەسطین بە جولەکە لەلایەن سلطان عبدالحمیدەوە!!

بە بۆچونی هرتزل ئەم کارە تاکە ڕێگە بوو بۆ دەستکەوتنی فەلەسطین هەر بۆیە (هرتزل) لە یادەوەریەکانی دا دەڵێت: ((علینا أن ننفق عشرین ملیون لیرة ترکیة لإصلاح الأوضاع المالیة في ترکیا، ملیونان منها ثمنا لفلسطین، و الباقي لتحریر ترکیا العثمانیة بتسدید دیونها تمهیدا للتخلص من البعثة الأوروبیة، ومن ثم تقوم بتمویل السلطان بعد ذلك بأي قروض جدیدة یطلبها) ).

واتە: لەسەرمانە کە (٢٠) ملیون لیرەی تورکی ببەخشین، بۆ مەبەستی چاککردنی باری دارای لە تورکیادا، د(٢) ملیونیان لە نرخی فەلەسطین دا و ئەوەی تریشی بۆ ڕزگارکردنی تورکیای عثمانی لەدانەوەی قەرزەکانیدا پاشان هەڵدەستین بە دەستگرتن و یارمەتیدانی سلطان عبدالحمید دوای ئەمەش هەر قەرزێکی تازە دوا بکات دەیدەینێ!!!

ئەم دواکاریە خرایە بەردەم سلطان عبدالحمید و تەماعی ئەوەیان پێدا کە دەوڵەتەکەی ڕزگار دەکەن لە کێشە ئابورییەکان، کە توشی هاتووە.

(هرتزل) پەیوەندییەکی چڕوپڕی کرد بە دۆستانی ئەڵمانیا و نەمسا وروسیا و ئیطالیا و بەریطانیاوە، بۆ مەبەستی سازدانی گفتوگۆیەك لەگەڵ (سلطان عبدالحمید) دا، لەم کاتەدا (لاندو) کە هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستی (هرتزل) بوو ئەوەی ڕاگەیاند بە (هرتزل) کە تاکە کەسێك لەم نێوەندەدا کە دەتوانێت ئەم کارە بکات و لەگەڵ سلطان دا گفتوگۆ بکات (نیرینسکی) یە، هرتزل دەربارەی ئەم مەسەلەیە وتی: ((إن نحن حصلنا علی فلسطین، سندفع لترکیا کثیرا، أو سنقدم

عطايا كثيرة لمن يتوسط لنا، و مقابل هذا نحن مستعدون أن نسوي أوضاع تركيا المالية....) )

واته: گەر ئێمە فەلەستینمان دەست کەوت، ئەوە زۆر دەدەین بە تورکیا، پاشان بەخشیشمان بۆ ئەو کەسەش زۆر دەبێت کە ئەم کارەمان بۆ ئەنجام دەدا و دەبێتە هۆکار لەم نێوەندەدا، لە بەرانبەر ئەمەشدا ئامادەی خۆمان دەردەبڕین بۆ باش کردنی گوزەرانی ئابوری تورکیا) ).

(هرتزل) هاوڕێ لەگەڵ (نیولینسکی) لە ساڵی(١٨٩٦) دا بەرەو (قسطنطنیه) واتە (ئەستەنبول) کەوتنە ڕێ (نیولینسکی) برادەرایەتیەکی تەواوی لەگەڵ (سلطان) دا هەبوو، دوای دانیشتنو گفتوگویەکی زۆر(نیولینسکی) تەواوی بۆچوونەکانی (هرتزل) ی بە (سلطان) ڕاگەیاند و (سلطان عبدالحمید) بە (نیولینسکی) وت: ((هل بإمكان اليهود يستقر في مقاطعة أخرى غير فلسطين) ) !!؟

واتە: جولەکە دەتوانن لە جێگەیەکی تردا نیشتەجێ بن لە غەیری فەلەسطین) ) ؟!!

ئەویش لە وەڵامدا وتی: ((تعتبرنا فلسطين هي المهد الاول لليهود، فعليه فإن اليهود لهم الرغبة في العودة إليها) )

واتە: فەلەسطین بە یەکەم لانکە دادەنرێت بۆ جولەکە، جولەکەش ئامەزرۆی گەڕانەوەن بۆ ئەوێ!!

سلطان عبدالحميد لە وەڵامدا پێ ی وت: ((إن فلسطين لا تعتبر مهدا لليهود، و إنها تعتبر مهدا لكافه الاديان الاخرى) )

واتە: فەلەسطین بەتەنها بە لانکی جولەکە هەژمار ناکرێت، بەڵکو بەلانکی سەرجەم دینەکانی تریش دادەنرێ.

(نیولینسکی) وەڵامی دایەوە و وتی: ((في حالة عدم إسترجاع فلسطين من قبل اليهود فإنهم سوف يحاولون الذهاب و بكل بساطة إلى الارجنتين) ).

واتـە: لـە حاڵـەتی نەگەڕانـەوەی جولەکـە بـۆ فەلـەسـطین، ئـەوکات بەوپـەڕی ئاسانیەوە هەوڵ دەدەن بۆ ڕۆیشتن بەرەو ئەرجەنتین.

لە کۆتایدا (سلطان عبدالحمید) نامەیـەکی بـۆ (هرتـزل) نوسـی و دایـە دەست (نیولینسکی) کە بیداتـە دەسـتی و دەقـی نامەکـەش بـریتی بـوو لـە: ((ئامۆژگـاری (هرتـزل) ی هاوڕێـت بکـەو پـێ ی بڵـێ: هـەنگاوی نـوێ دەربـارەی ئـەم مەسـەلەیە هەڵنـەگرێ، چـونکە مـن نـاتوانم تەنـەزول بکـەم لـە تـەنها بسـتێکی خـاکی پـیرۆزی فەلەسطین، چـونکە خـاکی فەلـەسـطین ملْك ی مـن نیـە، بـەڵکو ملْکـی گەلەکەمـەو پێشینانی ئێمە لە پێناو ئەم خاکـەداگیانیان بەخشـیوەو شـەهید بـوون و خوێنیـان ڕشتووە، دەکرێت جولەکە بەبێ بەرامبەر فەلەسطین بەدەست بێنێت، بـەڵام پێشـتر دەبێـت لـە هەڵوەشـاندنی لاشـەمانەوە دەسـت پـێ بکـەن، کـە هـەرگیز ڕازی نـابم جەستەم هەڵوەشێنرێ و کەرت و پەرت بکرێت لە کاتێکدا کە من زیندوو)) [1].

(هرتزل) لەم هەوڵەیدا و بەتـەواوی مـان شکسـتی هێنـا و هـیچ دەسـتکەوتێکی نەبوو بەڵام ماندوو نەناسانەو بێ وچان هەوڵ لەدوای هەوڵ دەیـدا تـا خـودی خـۆی لەگەڵ (سلطان) عبدالحمید، دا کۆببێتەوەو گفتوگۆ لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە بکـەن، هەربۆیە دوای دوو سـاڵ بەسـەر ڕووداوی شکسـت خـواردووی پێشـویدا و لـە سـاڵی (١٩٠١) دا توانی بۆ ماوەی دوو سـەعات گفتوگۆ لەگـەڵ (سـلطان) دا بکـات لەسـەر خاکی فەلەسطین.

(هرتـزل) زۆرزانانـە بـەڵێنی ئـەوەی دایـە (سـلطان) کـە بـانکێکی دەوڵەمەنـدی جولەکە لە ئەوروپادا دابمەزرێنێ بۆ یارمەتی دانی دەوڵەتی عثمانی لەبەرامبـەر ڕازی بوونی (سلطان) بە پێ دانی فەلەسطین بە جولەکە!! لەگـەڵ ئەوەشـدا پـەیمانی دا بە سولطان لەسەر سوك کردنی قەرزە کەڵەکە بووەکانی دەوڵەتی عثمانی!!

دوابەدوای ئەم دانیشتنە (هرتزل) و جولەکەکان کە زانیان هەوڵدانیان لە ڕێگەی (دبلۆماسیەوە) لەگەڵ (سلطان عبدالحمید) بـۆ بـە دەسـت خسـتنی خـاکی پـیرۆزی

---

١- اليهود والدولة العثمانية: ص (١٢٠)

فەلەسطین بێ سودە و ئاسنی سار کوتانە، هەربۆیە (هرتزل) ڕێگەیەکی تری بە خەیاڵدا هات کە ئەویش کۆتای هێنان بوو بەو دەستەڵاتەو و گۆڕینی وەزعی سیاسیە هەر بۆیە وتی: ((أنه لایمکن الاستفادة من ترکیا إلا إذا تغیرت حالتها السیاسیه أو عن طریق الزج بها في حروب تهزم فیها، أو عن طریق الزج بها في مشکلات دولیة أو بالطریقتین معا في أنا واحد) ).

واتە: ناتوانین سوود لە تورکیا وەربگرین مەگەر لە کاتێکدا نەبێت کە حاڵەتی سیاسی بگۆڕین یان لە ڕێگەر ئەوەی کە تورکیا هەڵبدەینە ناو جەنگێکەوە کە تیایدا بشکێت یان تورکیا بخەینە ناو کێشەی دەولی یان بە هەردوو ڕێگەکە لە یەك کاتدا.....) ).

لەم پێناوەدا بزوتنەوەی (صەهیۆنی جیهانی) هەوڵەکانی لە دژی خەلافەت چڕکردەوە، ئەویش بە یارمەتی دانی دوژمنەکانی سلطان عبد الحمید کە ئەرمەنە یاخی بووەکان بوون، پاشان نەتەوە پەرستەکانی (بەلقان) و بزوتنەوەی (الأتحادو الترقی) و دواتر کۆمەکی کردنی سەرجەم ئەو لایەن و دەوڵەتانەی کە دژایەتی خەلافەتیان دەکرد ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ !!

## دامەزراندنی کۆمەڵەی (الأتحاد والترقی) لەلایەن جوولەکەوە و دژایەتی پێ کردنی خەلافەت

هەندێك لە گەنجەکانی نێو خەلافەت لە تورکیاداو لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا سەرسام بوون بە بۆچوونەکانی شۆڕشی فەڕەنساوە، کە بە هۆیەوە سیستمێکی دیموکراسی و نەتەوەپەرستی عەلمانی و چەندانی تر هاتنە مەیدان، هەروەها سەرسام بوونیان بە بزوتنەوەی نەتەوەپەرستی (إطالي) بە سەرۆکایەتی (ماتزینی)، لە ساڵی (١٨٦٥) دا (٦) گەنج لە کەسایەتی یە خوێندەوارو ڕۆشنبیرەکانی تورکیا لە یەکێك لە باخچەکانی دەوروبەری شاری (أسطنبول) کە بە (غابة بلغراد) ناسرابوو باسیان لە هەندێ مەسەلەی سیاسی کردوو بڕیاریان لەسەر ئەمەدا کە بزووتنەوەیەکی نهێنی دابمەزرێنن، سەرئەنجام بە پاڵپشت و کۆمەکی

جووله‌كه و (صه‌هیۆنیه‌ت) ی جیهانی ئه‌م كۆمه‌ڵه‌یان له ناو خودی توركیادا دروست كرد بۆ مه‌به‌ستی دژایه‌تی پێكردنی ده‌سه‌ڵات و هاندانی جه‌ماوه‌ر له دژی.

یه‌كه‌م هه‌نگاویان له‌دوای دامه‌زراندنیان بریتی بوو له به‌شداری پێ كردنی ئه‌ندامانیان له ناو یه‌كه سه‌ربازی یه‌كانی ده‌وڵه‌ت و دام و ده‌زگا هه‌ستیاره‌كان و فه‌رمان به‌رانی مه‌ده‌نی، ئه‌میش له پێناو ئاگاداربوونی ته‌واو له كاروباری ده‌وڵه‌ت و ئاماده‌باشیان له‌هه‌ر پێشهاتێك كه ڕوو ده‌دات و قۆستنه‌وه‌ی هه‌له‌كان بۆ كۆتایی هێنان به‌ده‌سه‌ڵاتی خه‌لافه‌ت، یه‌كێك له دیارترین و به‌رچاوترین بنه‌ما فكری یه‌كانی ئه‌م كۆمه‌ڵه‌یه بریتی بوو له وروژاندنی هه‌ستی ڕه‌گه‌زپه‌رستی و نه‌ته‌وه‌په‌رستی توركه‌كان، ئه‌ویش به‌وه‌ی كه تورك كۆنترین و له‌پێشترین گه‌لی سه‌ر ڕووی زه‌وین و ڕه‌گ و ڕیشه‌یان له مێژوودا قوڵ بۆته‌وه.........

ده‌بێت (تورك) سه‌ربه‌خۆبێت و سه‌ر به ده‌سه‌ڵاتی خه‌لافه‌ت نه‌بێت.دروشمی ئه‌م كۆمه‌ڵه‌یه له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی بانگه‌شه‌ی نه‌ته‌وه‌په‌رستی توركیایان ده‌كرد، له‌گه‌ڵیشیدا بانگه‌شه‌ی بێ دینی و پشت گوێ خستنی جامعه‌ی إسلامیان ده‌كردوو فه‌خرو شانازی یان به (جه‌نگیزخانی مه‌غۆل و ته‌یمورله‌نگ و ئه‌تلا و طغرل) ده‌وه ده‌كرد.

جووله‌كه به ته‌واوی مانا یارمه‌تی و كۆمه‌كی بزوتنه‌وه‌ی (الأتحاد و الترقی) یان ده‌كرد له بڵاوبوونه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌په‌رستی توركی بۆ له‌به‌ریه‌ك هه‌ڵوه‌شاندی خه‌لافه‌تی عثمانی....ئه‌م كۆمه‌ڵه‌یه ده‌ستێكی باڵایان هه‌بوو له وروژاندنی هه‌ستی نه‌ته‌وه‌په‌رستی له ناو توركیادا و بانگه‌شه‌ی (نیشتیمانی و ئازادی و ڕه‌گه‌زایه‌تیان) بڵاوكرده‌وه دژی خه‌لافه‌ت.

له‌ساڵی (١٩٠٩) داو له‌سه‌ر ده‌ستی (كمال أتاتورك) ی په‌روه‌رده‌كراوی ده‌ستی جووله‌كه‌و ماسونیه‌تی عاله‌می كۆتایی هێنرا به ده‌سه‌ڵاتی خه‌لافه‌تی عثمانی و خه‌ونی چه‌ند ساڵه‌ی جووله‌كه‌ی پێ هێنرانه دی.

له (٣) ی ئازاری (١٩٢٤) به ته‌واوی و بۆ دوا جار له‌لایه‌ن كمال ئه‌تاتوركی جووله‌كه‌وه ئه‌وه ڕاگه‌یه‌نرا كه خه‌لافه‌تی عثمانی كۆتایی هات و ته‌واوی

دەسەڵاتەکانی لێ سەندرایەوە.دواتر (کمال ئەتاتورك) هەڵسابەجێ بەجێ کردنی ئەو پەیمانانەی کە بە وڵاتانی ڕۆژئاوای دابوو، بە تایبەت جێ بە جێ کردنی پەیمانی (لوزان) کە دانرابوو لەسەر تورکیا لە ساڵی (١٩٢٣) زاین و ناسرابوو بە (شروط کروزون الأربع) ئەوانیش لە چوار بڕیار پێکهاتبوو کە دەبوایە (ئەتاتورك) دوای لە ناوبردنی خەلافەت جێ بەجێیان بکات.

١-پچڕاندنی هەموو جۆرە پەیوەندی یەکی تورکیا بە ئیسلامەوە.

٢-سڕینەوەی تەواوی خەلافەتی عثمانی.

٣-دەرکردنی خەلیفەو شوێن کەوتوانی لەتورکیاو دەست گرتن بەسەر سەرجەم ماڵ و سەروەتیاندا.

٤-دانانی دەستوری مەدەنی -کە علمانیەت -بوو لە جێی دەستوری ئیسلامی.[1]

بەڵێ ئەتاتورك بەو پەڕی دڵسۆزی و لێ بڕانەوە هەڵسا بەجێ بەجێ کردنی ئەم (٤) بڕیارەی کە دابووی ئەویش بەو جۆرەی کە وەزارەتی ئەوقافی لابرد لە ساڵی (١٩٢٤) و لە ساڵی (١٩٢٥) دا دەرگای مزگەوتەکانی داخست و بەو پەڕی زەبرو توندیەوە هەموو ئەو لایەن و کەس و جم وجۆڵە دینیانەی لە ناو دەبرد کە بانگەشەی إسلامی بوونیان دەکردوو لە ساڵی (١٩٣١و١٩٣٢) دا ڕێژەو ژمارەی مزگەوتەکانی دیاری کردوو بڕیاری دەکرد بەوەی کە نابێت هیچ مزگەوتێك لە (٥٠٠) مەتر بێت[2] و لەگەڵ ئەمانەشدا ژمارەی مامۆستایان و ڕێژەی مزگەوتەکان ی کەم کردەوە و گەورەترین مزگەوتی لە تورکیا داخست بە ناوی (آیا صوفیا) و کردی بە (متحف) و دوومیشیان مزگەوتی (الفاتح) بوو.پاشان ساڵنامەی کۆچی گۆڕی بۆ زاین ودەستوری شەریعەتی إسلامی گۆڕی بۆ یاسای سویسری) )[3]

---

١- تأريخ الدولة العثمانية: د.علي حسون ص ١٨٧.

٢- دەبێت لە (٥٠٠) مەتر کەمتر بێت.

٣- الخلافة العثمانية: د. محمد علي الصلابي ص٥١٠.

پاشان لە دەستوری ساڵی (١٩٢٨) دا ئەوەی بەتەواوی ڕاگەیاند کەتورکیا یەکێك نیە لە وڵاتانی ئیسلامی لە ساڵی (١٩٢٥) دا پشووی ڕەسمی کە ڕۆژی هەینی بوو، گۆڕی بەڕۆژی یەك شەممە.

پاشان وەزارەتی پەروەردە بە تەواوی دەرسی دینیان پشت گوێ خست تا لە ئەنجامدا نەیان هێشت.

لە ساڵی (١٩٣٣) دا بە تەواوی زانکۆی شەریعەت (كلية الشريعة) یان لە ئەستەنبوڵ داخست.

لە ساڵی (١٩٢٩) دا وشەی لاتینیان فەرز کرد بۆ نوسین لەبری وشەی عەرەبی، و دوای ئەم بڕیارە کتێب و تەواوی بڵاوکراوەکانی تر لە بەرامبەریشیدا پشت گیری سەماو ڕووت بوونەوەی ئافرەت و کاری دزیوو فەسادیان دەکرد لە تورکیادا.

دواتر هەڵسان بە وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بە زمانی تورکی، ئەویش بەو مەبەستەی کە ڕۆح لە قورئاندا نەهێڵن و بێ گیان بی هێڵنەوە.

پاشان ئەوەیان ڕاگەیاند کە تورکیا سەر بە وڵاتانی ڕۆژئاوایە و هیچ پەیوەندیەکی بە جیهانی إسلامیەوە نیە ! !

تەنانەت لە هەندێ سەرچاوەدا باس لە (ئەتاتورك) ی علمانی و جوولەکە بەوە دەکرێت کە دەی وت: ((ليس لتركيا الجديدة علاقة بالدين) ) واتە: تورکیای نوێ هیچ پەیوەندیەکی بە دینەوە نیە.

پاشان باس لەوە دەکات کە جارێك (ئەتاتورك) قورئانێکی بە دەستەوە دەبێت و فڕێ ی دەدات و دەڵێت: ((إن إرتقاء الشعوب لايصلح أن ينفذ بقوانين و قواعد سنت في العصور الغابرة) ).

واتە: پێش کەوتنی گەلان چاك نابێت ئەگەر یاساو بنەماکانی سەردەمانی کۆن جێ بە جێ بکەن (کە مەبەست پێی قورئانە)

بەڵێ دوای ئەم هەموو کارە دزێوو دوژمنایەتیەی کە ئەتاتورك ئەنجامیدا.

لە تورکیاداو خزمەتی جوولەکەی پێ کرد، سەرەنجام خوای گەورە دوو ساڵ پێش مردنی تووشی گەورەترین نەخۆشی کرد لە گورچیلەو جگەرو ناوسك ی

ئەویش بەهۆی زۆر خواردنەوەی (مەی) (عارەق) و لە سالی (١٩٣٩) ی زایینی دا ڕۆح لە جەستەی پیسی دەرچوو، بەرەو بارەگای دادپەروەری خوای گەورە بەڕێ کەوت !!) )[1].

**دوا وتە لەم باسەدا:**

ئەوەی خوێندمانەوە دەربارە ئەم باسە تەنها دێڕێکە لە سەدان دێڕی باس کردنی ڕووداوەکان و ئەو پلانە دوژمنکاریانەی کە جوولەکەی ناپاک نەخشە سازیان بۆ کرد تا سەرئەنجام خەلافەت لە ناو بەرن و ئاوات و ئامانجە پیسەکانیان بێتە دی، کە ئەویش لابردن و لەناوبردنی هەموو ئەو کۆسپ و بەربەستانە بوو ڕێگری لێ دەکردن کە بگەنە خاکی پیرۆزی فەلەسطین و داگیرکردنی.

کە بێگومان گەورەترین ڕێگریش، بوونی خەلافەتی إسلامی بوو، گەرچی زۆر لاوازو پڕ کەلێن بوو، بەڵام لەڕاستیدا تەعبیر بوو بۆ ئوممەتێتی گەلانی موسڵمان و پارێزگاری کردنی سەرو ماڵ و خاکیان لە دەستی زۆر دارو داگیرکەران هەر لەبەرئەمە بوو کە وڵاتانی ڕۆژئاواو جرولەکە تەواوی هەوڵەکانیان خستە گەڕ بۆ لەناوبردن و سڕینەوەی، تا بە ئامانجەکانیان بگەن.

**ئامانجی دووەم: لەناوبردنی دەسەڵاتی قەیسەر لە ڕوسیاداو..یارمەتی دانی شوعیەت بۆ گرتنە دەستی دەسەڵاتی...**

مەبەست لە (شوعیەت وەك (فکر) بریتی یە لەو جوڵە فکری و ئابوریەی کە لەلایەن (کارل مارکس) ی ئەڵمانی جوولەکەوە داڕێژرا لەسەر بنەمای بێباوڕی) )[2]

سەرەتا و لە ئەڵمانیادا لە سەردەستی (کارل مارکس) و هاوڕێیەکی بە ناوی (أنجلز) بەدەرکەوت لە سەدەکانی (١٨) هەم دا.

مارکسیەت لەسەر چەند بنەمایەك داڕێژرا کە بریتی بوون لەمانە.

---

١- المسألة الشرقية: محمد ثابت الشاذلي: ص٢٤٢.

٢- الموجز في الأديان و المذاهب المعاصرة: ص٩٠.

١- باوەڕ نەبوون بە زاتی خوای گەورە و سەرجەم ئەو شتا نادیارانەی کە بە هەستەوەرەکان هەستیان پێ ناکرێت.

٢- باوەڕبوون بەوەی کە (مادده) بنەماو بناغەی هەموو شتێکە، هەربۆیە یەکێك لە دروشمەکانیان بریتی بوو لەوەی کە دەیان وت:

((نؤمن بثلاثة: مارکس و لینین و ستالین، ونکفر بثلاثة: الله، الدین، الملکیة الخاصة) )[1]

واتە: باوەڕمان بە سێ شتە: (مارکس و لینین و ستالین) وە بێ باوەڕین بە سێ شت (خوا و دین و خاوەندارێتی تایبەت).

٣- ڕاڤەکردنی مێژووی مرۆڤایەتی بە کێشمەکێش و دژایەتی لە نێوان چینی سەرمایە دارو چینی هەژاردا.

٤- دژایەتی کردنی دینەکان، چونکە باوەڕیان وەهابوو کە دین داری ڕێگەیە کە بۆ بەنج کردن و بێ هۆش کردنی گەلان، هەروەك مارکس دەی وت: (الدین أفیون الشعوب) واتە: دین تلیاکی گەلانە!!!

٥- دژایەتی کردنی خاوەندارێتی تایبەتی(ملکیە الخاصە) ئەویش بەو جۆرەی کە کەس خاوەنی هیچ نەبوو لە ژێر دەسەڵاتی حوکمی شوعیەتدا و دەبوو هەموو موڵك و سامانیان هی دەوڵەت بێت !!

*بێگومان لێرەدا ناتوانین باس لە سەرجەم بنەما فکری یەکانی ئەم بیرو باوەڕە هەرەس خواردووە بکەین، بەڵام وەك بەرچاو ڕوونی یەك بۆ تۆی خوێنەر تا زیاتر ئاشنابیت بەم باسە و بزانیت جوولەکە چ مەرام و ئامانجێکی لە پشت ئەم بزوتنەوە فکری یە بێ باوەڕەوە هەبوو.

توێژەرەوان دەربارەی کەسایەتی یەکەمو دامەزرێنەری شوعیەت (کارل مارکس) ی جوولەکە دەڵێن: ((إنە رجل فاشل معقد یحمل کل خصائص الیهود، من الحقد و الکراهیة لجمیع البشر، إضافة إلى أنە کسول فقیر معوز) )[1]

---

١- الموسوعة المیسرة في الأدیان والمذاهب المعاصرة (ص: ٣١٠).

واتـه: پیـاوێکی دڕاو داخـراوو بـوو —مـارکس هـەڵگری سـەرجەم تایبـەت مەندییەکانی جوولەکە بوو لـە ڕق و بەکـەم تەماشـاکردنی تـەواوی خـەڵکی، لەگـەڵ ئەوەشدا کەسێکی تەمبەڵ و هەژاربوو )[1].

جوولەکە ئەم حاڵەتە دژوارە دەرونیە کۆمەڵاتیەی مارکسی قۆستەوەو یارمەتی تەواویان دا تا بەرنامەکەی بەر قەراربێت بۆ بەرژەوەندی خۆی کە دواتر باسی لێوە دەکەین، لە ساڵی (١٨٤٨) دا (مارکس و أنجلز) شـوعیەتیان ڕاگەیاند و ئاشـکرایان کـرد، ئـەویش بەهەڵگیرسـاندنی شۆڕشـێکی کرێکـاری لـە دژی چـینی سـەرمایەدار (الرأسمالية) و کەنیسەو قەشەکانی خۆرئـاوا، کـە لـەو دەمـەدا قەشـەکانی کەنیسـە سـومبلی سـتەم و دواکـەوتووی و دژایـەتی کردنـی زانسـت و سـەرجەم ئـەو ڕەوتـە زانستیانە بوون کە بە دەرکەوتن.

بەڵێ شوعیەت وەك بانگەوازێکی تیۆری (نظري) مایەوە تـا سـاڵی (١٩١٧) لـەو کاتەداو بەڕابەرایەتی لینین و یارمەتی جوولەکە شۆڕش لە ڕوسـیای قەیسـەریدا بـەر پاکراو ئەو سیستەمە قەیسـەری یـە کۆتـایی هـات و شـوعیەکان دەسـەڵاتیان گرتـە دەسـت، ئـەویش بـە ئامـانجی تۆڵـە سـەندنەوەی جوولەکـە بـوو لـە گـەلی ڕووسـی، هەربۆیە لەم پێناوەدا هەزاران خەڵکیان کوشت لە پیرو منـداڵ و ئـافرەت و خـەڵکی بێ دفاع.

شۆڕشی بەلشەفی لە ڕوسیادا بەر پاکراو هەروەك وتمان دەسەڵاتی قەیسەر کە دەسەڵاتێکی مەسیحی بوو کۆتایی پـێ هێنـراوو شـوعیەت بەرقـەرار بـوو، مەکتـەبی سیاسیان تەشـکیل کـردوو لـە (٧) ئەنـدام پێکهـاتبوو کـە(٦) یـان جوولەکـە بـوون ئەوانیش:

١- (لینین) کـە نـاوی ڕاسـتەقینەی (فلادیمـیر ألیـتش بولیـانوف) ەو ڕابـەری گشتی شۆڕشی بەلشەفی بوو لە ڕووسیاوو لـە سـاڵی (١٨٧٠) لـە دایـك بـووەو و لـە

---

١- الموجز في الأديان والمذاهب المعاصرة: ص٩٠.

سالّی (١٩٢٤) بە هۆکاری تووش بوون بە نەخۆشی ئیفلیجی مرد، زۆرێك لە توێژەرەکان باس لەوە دەکەن کە جوولەکە بووە.

٢- ستالین، ناوی ڕاستەقینەی (جوزیف فادیو نوفتش) ە، لەسالّی (١٨٧٩) لە دایك بووە، دوای (لینین) بوو بە سکرتێری حزبی شوعی لە ڕوسیادا، ستالین زۆر بە ناوبانگ بوو لە دلّ ڕەقی و ستەم و دیکتاتۆری و نەخوێندنەوەی بۆچوونی هیچ کەس و سوربوون لەسەر بۆچوونەکانی خۆی، ستالین خێزانەکەی جوولەکە بوو، لە سالّی (١٩٥٤) کۆچی دوایی کرد و دەریایەك تاوانی لە نامەی کردەوەکانیدا تۆمارکرد.

٣- تروتسکی: ناوی ڕاستەقینەی بریتیە لە (بروشتاین) و لە سالّی (١٨٧٩) لە دایك بووەو، کەسایەتی یەکی جوولەکە بوو، لە سالّی (١٩٤٠) کۆچی دوای کرد.

٤- کامینیف: ئەمیش یەکێك بوو لە ئەندامە گەورەکانی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی و کەسایەتی یەکی جوولەکە بوو.

٥- سوکولنکوف: بەهەمان شێوەی ئەوانی پێش خۆی یەکێك بوو لە ئەندامە دیارو چالاکەکانی حزب و ئەمیش جوولەکە بوو.

٦- زینوفیف: کەسێکی جوولەکە بوو.

٧- یبنوف: تەنها ئەم لەناویاندا جوولەکە نەبوو.

**نەخشەکە بەم جۆرەیە:**

لینین.........................پەروەردەکراوی جوولەکە.

ستالین.........................خێزانەکەی جوولەکە بوو.

تروتسکی.........................جوولەکەبوو.

کامینیف.........................جوولەکەبوو.

زینوفیف.........................جوولەکەبوو.

یبنوف.........................ڕووسی بوو.

**دوای تەشکیل کردنی حکومەت لە ڕووسیا دا(٢٢) وەزارەت پێکهێنراو (٢٢) وەزیری بۆ دانراو کە لە کۆی ئەو (٢٢) وەزیرە (٧) کەسیان جوولەکە بوون.**

دەستەی بەڕێوەبردنی جەنگ (إدارة الحرب) لە (٤٣) کەس پێکهاتبوو (٢٤) یان جوولەکە بوون.

لجنەی کاروباری ناوخۆ(لجنة الشؤون الداخلية) لە (٦٤) کەس پێکهاتبوو (٤٥) یان جوولەکە بوون.

لجنەی کاروباری دەرەوە (لجنة الشؤون الخارجية) لە (١٧) کەس پێکهاتبوو (١٣) یان جوولەکە بوون.

لجنەی کاروباری مالی (لجنة الشؤون المالية) لە (٣٠) کەس پێکهاتبوون (٢٦) یان جوولەکە بوون.

دەستەی کاروباری قضائي (لجنة الشؤون القضائية) لە (١٩) کەس پێکهاتبوون (١٨) یان جوولەکە بوون.

لجنەی کاروباری تەندروستی (لجنة الشؤون الصحية) لە (٥) کەس پێکهاتبوون و(٤) یان جوولەکە بوون.

لجنەی ئاڕاستەکردنی گشتی (لجنة التوجيه العام) لە (٥٣) ئەندام پێکهاتبوو و (٤٤) یان جوولەکە بوون.

لجنەی بنیات نانەوەو نوێ کردنەوە، لە دوو کەس پێکهاتبوون هەر دووکیان جوولەکە بوون.

لجنەی کاروباری ڕۆژنامەگەری (لجنة الشؤون الصحافة) لە (٤٢) ئەندام پێکهاتبوو و(٤١) ئەندامیان جوولەکە بوون.

خاچی سوری ڕووسی (الصليب الأحمر الروسي)، لە (٨) ئەندام پێکهاتبوو، هەر هەشتیان جوولەکە بوون.

لجنەی لێکۆڵینەوە لە فەرمان بەران (لجنة التحقيق عن المواظفين) لە (٧) کەس پێکهاتبوون و (٥) یان جوولەکە بوون.

لجنەی لێکۆڵینەوە لە سەربڕینی قەیسەرو خانەوادەکەی (لجنة التحقيق عن ذبح القيصر و أسرته) لە (١٠) ئەندام پێکهاتبوو (٧) یان جوولەکە بوون.

موسیگەی کرێکاران و سەربازانی مۆسکۆ (مكتب العمال والجنود في موسكو) لە (٢٣) ئەندام پێکهاتبوو کە (١٩) یان جوولەکە بوون.

لجنەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی سۆفیەتی چوارەم لە (٢٤) ئەندام پێکهاتبوو کە (٢٣) یان جوولەکە بوون.

لجنەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی پێنجەم لە (٦٢) ئەندام پێکهاتبوو (٣٤) یان جوولەکە بوون.

لیجنەی ناوەندی بۆ حیزبی إشتراکی لە (١٢) ئەندام پێکهاتبوو کە (٩) یان جوولەکە بوون.

لیجنەی بەڕێوەبردنی هەرێمەکان (٢٣) ئەندام پێکهاتبوو کە (٢١) یان جوولەکە بوون.

کۆی گشتی ئەندامان بریتی بوو لە (٥٣٢) ئەندام و (٤٣٥) یان جوولەکە بوون.

لەسەردەمی دەسەڵاتی (ستالین) دا ژمارەی ئەندامانی مەجلیسی شیوعی کە حوکمی ڕووسیایان دەکرد (١٧) کەس بوون و (١٤) یان جوولەکە بوون.

کە بریتی بوو لەمانە:

١-کاجانوفتش -جێگری سەرۆك-..............جوولەکە بوو.

٢-بیریا..............................جوولەکە بوو.

٣-شیفرنیك...........................جوولەکە بوو.

٤-کیرتشینستین.......................جوولەکە بوو.

٥-جورکین............................جوولەکە بوو.

٦-فیرشیلوف.........................خێزانەکەی جوولەکە بوو، لە ڕێگەی دایکیەوە جوولەکە بوو

٧-مولوتوف...........................خێزانەکەی جوولەکە بوو، لە ڕێگەی دایکیەوە جوولەکە بوو.

٨-الیاایرهبرغ........................جوولەکە بوو.

٩–دیفنسکی.......................جووله‌که بوو.

١٠–هیسنبرج.......................جووله‌که بوو.

١١–میخیلیس.......................جووله‌که بوو.

١٢–خرمین.......................جووله‌که بوو.

١٣–جودی.......................جووله‌که بوو.

١٤–لوزوفسکی.......................جووله‌که بوو.

١٥–کافتانوف.......................جووله‌که بوو.

١٦–بیتر لیفتسکی.......................جووله‌که بوو.[١]

١٧–ستالین.......................خێزانه‌که‌ی جووله‌که بووه.

سه‌رنج بده‌و خۆت بڕیاربده!! هاتنه مه‌یدانی شوعیه‌ت و کۆتایی هێنان به حوکمی گاوره قه‌یسه‌ریه‌کان و بڵاوبونه‌وه‌ی شوعیه‌ت و بێباوه‌ڕی له وڵاتاندا، چ ئامانجێکی جووله‌که‌ی له پشته‌وه بوو ؟! ئایا ڕووسیا ده‌وڵه‌تێك بوو بۆ شوعیه‌ت یان ده‌وڵه‌تێکی سه‌ره‌تا بوو بۆ جووله‌که‌کان ؟! ئایا بوونی ئه‌و ژماره زۆره جووله‌که‌یه له دام و ده‌زگاو شوێنه هه‌ستیارو باڵاکانی حزبدا به چ پێناسه ده‌کرێت و چ ئامانجێك له پشتیه‌وه به ده‌رده‌که‌وێت؟ ئایا شوعیه‌ت هه‌وڵی دا (دین) ه ئاسمانیه‌کان بتوێنێته‌وه و شوێنه‌واریان نه‌هێڵێت له فکرو دڵی خه‌ڵکیدا، یان جوله‌که شوعیه‌تی به‌کارهێنا بۆ بێ دین کردنی خه‌ڵکی و له‌ناوبردنی خودی دینه ئاسمانیه‌کان ته‌نها جووله‌که نه‌بێت ؟!

له وه‌ڵامی ئه‌م پرسیارانه‌و چه‌ندین پرسیاری تریشدا ده‌ڵێم: گه‌وره‌ترین ئامانجی جووله‌که له هه‌موو ئه‌م ڕووداوانه‌و بڕیاره‌کانی پروتوکۆلاتدا له پێش دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تی جووله‌که له فه‌له‌سطین بریتی بوو له سوك کردن و له ناوبردنی دینه‌کان – ته‌نها دینی جووله‌که نه‌بێت...........

---

١– النفوذ اليهودية: ص ٩٦.

پاشان بڵاوكردنەوەو كۆمەكی كردنی هەموو ئەو ڕەوت و بزاڤە فكریە بێ دینانەی كە (خوا) یان لە دڵی خەڵكیدا دەردەكرد و بەرەو (الحاد) و كافر بوون دەیان هێنان.

لە هەمووشی گرنگ تر بەد ڕەوشت كردنی خەڵكی یەكێكی تر بوو لە ئامانجە گرنگەكانیان، تا وەكو شتێك نەمێنێتەوە لە هزری خەڵكیدا بە ناوی قەدەغەو شەرم و حەرام و نەكردنی، بەڵكو بۆ گەیشتن بە ئامانج هەموو ڕێگەیەكی دروست و نادروست بگرنە بەر.

جوولەكە باش حاڵی بوو بوو لەوەی گەر شوعیەكان بهێنێتە سەر دەور تەواوی ئامانجەكانی دەستەبەر دەبێت هەر لە:

١- تۆڵە سەندنەوە لە گاورەكان و لە ناوبردنیان.

٢- ڕووسیا كرایە چەقی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی فكری و ئەخلاقی بۆ تەواوی وڵاتانی جیهان، ئەویش بە پاڵپشتی كردن و برەو دان و یارمەتی دان و بڵاوكلادنەوەی بیروبۆچوون و وتەكانی هەریەك لە (ماركس و داروین و فرۆیدو.....).

هەروەك لە یەكێك لە برگەكانی (بروتوكۆلات) دا دەڵێت: ((یجب لنعمل لتنهار الأخلاق في كل مكان فتسهل سیطرتنا، إن فروید منا و سیظل یعرض العلاقات الجنسیة في ضوء الشمس كي لا یتقی في النظر الشباب شيء مقدس، ویصبح همة الأكبر هي إرواء غرائزة الجنسیة و عند ئذ تنهار أخلاقه) )

واتە: پێویستە كار بكەین لە پێناو ڕووخاندنی ڕەوشت لە هەموو شوێنێكدا بۆ ئەوەی بە ئاسانی زاڵ بین، فرۆید لە ئێمەیە، بەردەوام پەیوەندیە جنسیەكان پەخش دەكەین، وەك تیشكی خۆر بۆ ئەوەی شتێك نەمێنێتەوە لە بیری گەنجەكاندا بە ناوی پیرۆزی یەوە، وە بۆ ئەوەی كە گەنجەكان گەورەترین خەونیان بریتی بێت لە تێركردنی غەریزە جنسیەكانیان هەركات ئەمەی ئەنجام دا ڕەوشتیشی دەڕووخێت!!

٣-هەروەك وتمان لە پێشتردا كە ئامانجی سەرەكیان بریتی بوو لە تواندنەوەو نەهێشتنی دینی ئیسلام و مەسیحیەت و هێشتنەوەی تەنها دینی جولەكە.هەروەك لە (بروتوكولات) ی ژمارە(١٠) دا دەڵێت: (لن نسمع بقیام دین غیرنا، یجب تحطیم كل عقائد الأیمان).واتە: ڕێگە نادەین بە، بەرقەرار بوونی هیچ دینێك غەیری دینی خۆمان - واتە - جولەكە پێویستە هەموو بیرو باوەڕو عەقیدەیەك تێك بشكێنین.............

لە ناوبردن و كۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی (عثمانی) و ڕووخاندنی ڕووسیای قەیسەری مەسیحی گەورەترین بەڵگەبوون لەسەر دژایەتی كردنی دیارو ئاشكرای هەردوو دینی (إسلام و مەسیحیەت).

**ئامانجی سێ یەم : دەست گرتن بەسەر ڕاگەیاندندا (السیطرة علی الأعلام).**

كاری ڕاگەیاندن لە دێر زەمانەوە یەكێك بووە لەو هۆكارە گرنگ و سەرەكیانەی كە هەموو دەسەڵات داران و كەسایەتیە ناودارەكان و گروپ و كۆمەڵەكان بۆ مەرام و ئامانجە تایبەتی و گشتی یەكانی خۆیان بەكاریان هێناوەو باشترین ڕێگە بووە بۆ پەخش كردنی ڕاوبۆچوونەكان، و ئاڕاستە كردنی خەڵكی بەو جۆرو شێوەیەی كە ویستویانە، زۆر جار ئامانجی ڕاگەیاندنەكان بریتی بووە لە ئاڕاستە كردنی خەڵكی بە گشتی و هەواداڕانی بە تایبەتی، بۆ ئاوەژووكردنەوەی ڕاستیەكان و چەواشەكردنیان و كەمێك نەبێت لە ڕاگەیاندنەكان بە ڕاستی و دروستی مەسەلەكان دەگەیەننە خەڵك بەڕاستیەكان ئاشنایان دەكەن.

یەكێك لە ئامانجەكانی جولەكە لە قۆناغی یەكەمی جێ بەجێ كردنی بروتوكولاتداو پێش دامەزراندنی دەوڵەتی إسرائیل بریتی بوو لەدەست گرتنی تەواو بەسەر كەناڵەكانی ڕاگەیاندنی جیهانیدا، ئەویش لە پێناوی بەدی هێنانی سەرجەم ئامەنجەكانیان و هەڵگەڕاندنەوەی ڕاستی یەكان لە بەرچاوی خەڵكیدا بە گشتی.

لە هەمووی گرنگ تر لەلای جولەكە بریتی بوو لە گۆڕینی بیرو باوەڕی خەڵكی جیهان بە گشتی دەربارەی مێژووی ڕەش و سیفەتە گەندەڵیەكان، چونكە جولەكە

بێزراوو قێزەون بوون لە جیهاندا و کەس چارەی نەدەویستن، تەنانەت ئەوانەشی کە بە ڕووکەش یارمەتی و کۆمەکیان دەکردن، جوولەکە لە پێناوو گۆڕینی ڕاو بۆچوونی خەڵکی بەگشتی لەسەر مێژووی ڕەش و گەندەڵیەکانی ئێستایان، بڕیاری ئەوەیان دا کە دەست بەسەر کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی جیهانیدا بگرن و، وێنای شێواو وشکست خواردووی کەسێتی جوولەکە لەو نموونە دڕندەو خراپەوە بگۆڕن بۆ نموونەی کەسایەتی یەکی باش و ئازادی خوازوو ستەم لێکراو..........

نموونەی کەسێکی (ئازا، زیرەك، داهێنەر، زانا، بیرمەند، ئازادی خواز...)

بێگومان جوولەکە هەوڵی زۆر جدی و تەواویان دا بۆ بەجێهێنانی ئەم ئامانجەیان و شەوو ڕۆژیان گرێ دا، تا بگەنە ئاوات، لە ئەنجامدا و لە دوای هەوڵی زۆر سەرکەوتنی باشیان لەم بوارەدا تۆمار کرد، ئەوان باش لەم مەسەلەیە تێگەشتبوون کە سەرکەوتووترین ڕێگە بۆ جوان کردنی وێنەی جوولەکە لە دیدی خەڵکیدا بریتی یە لە دەست گرتن بەسەر سەرجەم هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا، هەر لەم پێناوەدا یەکێك لە حاخامەکانی جوولەکە بەناوی (ڕاشورون) لە یەکێك لە وتارەکانی داو لە شاری (براخ) ئەوەی ڕاگەیاند کە وتی:

((إذا كان الذهب هو قوتنا ألاولى للسيطرة على العالم، فاءِن الصحافة ينبغي أن تكون قوتنا الثانية) ).

واتە: ئەگەر ئاڵتون بریتی بێت لە هێزی یەکەممان بۆ دەست گرتن و زاڵ بوونمان بەسەر جیهاندا، ئەوە بێگومان کاری ڕۆژنامەگەری- إعلام- دەبێت هێزی دووەممان بێت! ! ! جوولەکە لەم پێناوەدا هۆکاری زۆریان گرتە بەر تا بەتەواوی زاڵ بین بەسەر سەرجەم هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا، هەر لەبینراوو بیستراوو خوێنراوە کە بریتی بوون لەوانە:

هۆکاری یەکەم: بڵاوکردنەوەی بێ دینی تا خەڵکی پەیوەندو پەیوەست نەبن بە هیچ قیەمێکی دینیەوە، هەروەك لە پرۆتۆکۆلاتی (١٣-١٤) بە ئاشکرا جەخت لەسەر ئەم هۆکارە دەکاتەوە.

ئەویش بێگومان -هەروەك پێشتر- باسمان كرد - لە ڕێگەی بڵاوكردنەوەو یارمەتی دانی سەرجەم ئەو ڕێبازو ڕێچكانەی كەلەسەر بنەمای بێ دینی بنیات نرا بوون.

هۆكاری دووەم: ئاڕاستە كردنی خەڵكی بەرەو شتانی پڕوپوچ و كوشتنی كاتەكانیان بە شتی بێ سوودوو، ئەو یاریانەی كە تەواوی سەیركەران و ئەنجامدەرانی بەنج و سەرخۆش دەكات و بیروهۆشیان داگیردەكات و بواری تێڕامان و سەرنج دانیان ناهێڵێت، وەك سەرقاڵ كردنی گەنجان بە تایبەتی بە كاری جنسی و پوچ گەرایی و خواردنەوەی ماددە هۆشبەرەكان و قومارو...هتد.

هەریەك لە برگەكانی (١٣-١٩) ی پرۆتۆكۆلات جەخت لەسەر ئەم هۆكارە دەكەنەوە.

هۆكاری سێ یەم: بڵاوكردنەوەی دژایەتی و شەڕی ناوخۆ لە نێوان لایەنە جیاوازەكان و خۆش كردنی ئاگری فتنە و دووبەرەكی لە نێوانیاندا.هەروەك (بروتۆكۆلات) ی (١٠) باس لەم هۆكارە دەكات.بەڵێ جوولەكە هۆكاری زۆریان گرتە بەر تا ئاگاداری تەواویان هەبێت لە ڕووداوو پێش هاتە سیاسیەكانی دنیاو لەم پێناوەشدا كۆمەڵێ بڕیاری تریان دا كە ئەمانەن.

((يجب أن لايكون لأعدائنا و سائل صحفية يعبرون فيها عن آرائهم) )

واتە: پێویستە كە دوژمنانمان هۆكاری ڕۆژنامەگەری- إعلام- یان نەبێت كە تەعبیر لە بچوونەكانی خۆیانی تیادا بكەن.

((لن يصل طرف من خبر إلى المجتمع من غير أن يمر علينا) )

واتە: نابێت هیچ هەواڵێك بگاتە نێو كۆمەڵگا، مەگەر لە كاتێكدا نەبێت كە بەلای ئێمەدا بڕوات - واتە لە ژێر چاودێری ئێمە دابێت.

جوولەكە لەم قۆناغەدا تا ڕادەیەكی باش توانیان دەست بگرن بەسەر هۆكارەكانی ڕاگەیاندندا و ئامانجەكانیانی پێ بهێننە دی............

**قۆناغی دووەم: ئامانجەکانی پرۆتۆکۆلات لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە فەلەسطین دا:**

قۆناغی دووەمی جێ بە جێ کردنی برگەو بڕیارەکانی (پروتۆکۆلات) بریتی بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ جوولەکەکانی جیهان لە (فەلەسطین) دا و قودسیش بە پایتەختی !!

ئەم بیرۆکە دۆزەخیە لە مزری دامەزرێنەری صەهیۆنیەتی جیهانی (تیۆدۆر هرتزل) ەوە سەرچاوەی گرت و کرایە گەورەترین بڕیار لە برگەکانی (پرۆتۆکۆلات) دا، ئەویش بەوەی کە (هرتزل) لە ساڵی (١٨٨٩) ی زاینیدا کتێبێکی نوسی بە ناوی (الدولة الصهيونية) و لەم کتێبەدا باسی لەوە دەکرد کە دەبێت لە داهاتوودا دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ تەواوی جوولەکە پەرتەوازەکانی دنیا بنیات بنرێت و یەك پارچەیی جوولەکەی تێدا پارێزراوو بێت و چارەسەرکەری شوناسی تاکی جوولەکە بێت لە جیهاندا.

لەم پێناوەدا (هرتزل) کاری زۆری کردو ڕەنجی زۆردا، هەر لە پەیوەندی کردن بە گەورە بەرپرسانی وڵاتە زل هێزەکانی ڕۆژئاوا و دانوستانی بەردەوام لەگەڵ سلطان عبدالحميد و دەسەلاتدارانی دەوڵەتی عثمانی و، لە کۆتایی سەدەکانی نۆزدەو سەرەتایی سەدەی بیست دا.

بەڵێ دوای ڕەنج و تێکۆشانێکی چڕو بێ وچان، دوای پیلان دانان بۆ لابردنی گەورەترین کۆسپ و لەمپەر لەبەردەم دروست بوونی دەوڵەتی إسرائيل لە فەلەسطین کە دەسەلاتی عثمانی بوو، دوای دروست کردنی ڕق و دژایەتی لە نێوان دەوڵەتە زل هێزەکانی ڕۆژئاوا و نانەوەی شەڕو فتنە لە نێوانیاندا، جەنگی یەکەمی جیهانی دروست بوو لە ساڵی (١٩١٤) و ئەم جەنگە جیهانیە چوار ساڵی خایاندن و ساڵی (١٩١٨) کۆتایی هات، گەورەترین ئامانج و دەست کەوتی جوولەکە لەم جەنگەدا بریتی بوو لە لاوازکردنی دەوڵەتی عثمانی و بەمەش ئەو دەوڵەتە بوو بە میراتی وڵاتە زل هێزە براوەکانی جەنگ و لە یەك پارچەیی و ئومەتێتی یەك گەلەوە

کرانە دەوڵەت و دەوڵەتی بچوك و سنوری جوگرافیان بۆ دانراو هێزو دەسەلات و ڕەنگ و دەنگیان لاوازکرا، ئەمەش ئامانجی جوولەکەی هێنایە دی کە، کۆسپ لەبەردەم جوولەکەدا نەما و ڕێگەی بۆ خۆشکرا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی(إسرائیل) لە خاکی فەلەسطین دا.

یەکێك لە جوولەکەکانی (ڕۆمانیا) یا بە ناوی (مارکۆس راخاج) لەم بارەوە دەڵێت: ((نحن الیهود نقف من وراء جمیع حروبکم، وإن الحرب الأولی قامت لتحقیق سیطرتنا علی العالم) )

واتە: ئێمەی جوولەکە وەستاوین لە دوای هەموو جەنگەکانتانەوە، وە جەنگی یەکەمی جیهانی دروست بوو بۆ بەجێ هێنانی دەسەڵاتمان بەسەر جیهاندا.

ژمارەی قوربانیانی ئەم جەنگەی کە جوولەکە دەستی ڕەشیان لە پشتەوەی بوو بریتی بوو لە (٧٧١، ٩٩٨، ٩) نۆ ملیون و نۆسەدو نەوەو هەشت هەزارو حەوت سەدو حەفتاو یەك کەس، کە کۆی گشتی کوژراو بریندارو کەم ئەندام بوونی بەشێك لە جەستە بریتی بوو لە (٤٦,٢٧٩,٩٢٢) کەس.[1]

بەڵێ بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانی جوولەکە لە قۆناغی یەکەمدا بریتی بوو لەم کارە گرنگانە – بە نسبەت خۆیانەوە بەرهەمی کارەکانی پێشوویان هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ جێ بە جێ کردن و بە مەنزل گەیاندنی ئامانجەکانیان کە لە برۆتۆکولاتدا بڕیاریان لەسەر دابوو، ئەویش دامەزراندنی دەوڵەتی (إسرائیل) بوو لە (فەلەسطین).

هەنگاونان بۆ ئەم ئامانجە گەورەیە جوولەکەی لە خەیاڵ و ئەندێشەوە بەرەو واقع دەبرد، لە ژێر دەستەیی و زەلیلی بۆ سەربەخۆی و لووتکەی دەسەلات و زاڵبوون دەبرد، لە پاشکۆبوون بۆ پێشەوایەتی دەبرد، هەر بۆیە بەو پەڕی جدی بوونەوە هەوڵیان بۆ دەدا تا خەونەکانیان بێتە دی.

---

١- الحرب والشعوب: بدر الدین السباعي: ص ٣.

ئەوەی پێش دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی (إسرائيل) زۆر مەبەستیان بوو کە ببێت بریتی بوو لە هەڵگیرساندنەوەی جەنگێکی نوێ ی جیهانی لە نێوان وڵاتە زل هێزەکانی جیهاندا (ئەویش جەنگی دووەمی جیهانی بوو) جوولەکە ئەوەندەیان بە لاوە مەبەست نەبوو کە لە جەنگی جیهانیدا ڕویدا، بەڵکو نەخشە سازیان ئەنجام دا بۆ هەڵگیرساندنەوەی جەنگێکی تری خوێناوی، سەرەتا لە ڕێگەی ئەو هۆکارە ڕاگەیاندنەوە هەڵسان بە هێرش کردنە سەر ئەڵمانیای نازی.[1] جوولەکە لەم قۆناغەدا بەهۆی ئەو دەسەڵاتە مالیە گەورەی کە هەیان بوو، پاشان بەهۆکاری زاڵ بوونیان بەسەر میدیاکانی ئەوروپاو ئەمەریکادا توانیان کە نازیەت وەك دڕندەیەکی ڕاوکەر وێنا بکەن و نمایشی بکەن، کە مەترسی گەورەیە لەسەر ئەوروپا و ئەمەریکا پاشان جوولەکە بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی کە لە هەریەك لە وڵاتانی بەریطانیاو فرنساو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دا هەیانبوو، بانگەشەی ئەوەیان کرد کە سەرەتا جەنگی ئابوری بەرپا بکەن لەدژی ئەڵمانیا، پاشان یاسای مقاطعەی سەپاند بەسەر ئەوروپای ڕۆژئاواو وڵاتە یەکگرتووەکاندا، کەلە بەرامبەر ئەڵمانیادا ئەنجامی بدەن بە نیەتی خنکاندنی ئەڵمانیا، تا سەرئەنجام لە ڕووی سەربازیشەوە دابڕوخێت!!

بەڵێ میدیاکانی جوولەکە زۆر بە ڕاشکاوانە بانگەشەی جەنگیان لەگەڵ (هتلر) دا ڕاگەیاند بەوەی کە دەسەڵات بە جێ بهێڵێت و دەستبەرداری فەرمان ڕەوایی بێت، لە بەرامبەریشدا جەنگ ئاشکرا بکرێت لە پێناو بەرگری کردن لە بنەماکانی جوولەکە دا.سەرەنجام ئەوەی کە جوولەکە نەخشەیان بۆ کێشا ڕوویدا، کە ئەویش جەنگی جیهانی دووەم بوو لە ساڵی (١٩٣٩) ئەم جەنگە خوێناوی یە بە ملێۆنەها مرۆڤی تێدا بوونە قوربانی و گەورەترین چەکی کۆمەڵ کوژی تێدا بەکارهێنرا کە (ئەتۆم) بوو، لەلایەن ئەمەریکاوە دژبە (یابان) ئەم جەنگە خوێناوی یە (٦) ساڵ

---

1- نازی: بە حزبی إشتراکی ئەڵمانیا دەوترا، کە (أودلف هتلر) لە ساڵی (١٩٣٣) وە سەرکردایەتی دەکرد.

بەردەوامی خایاندو لەساڵی (١٩٤٥) دا بە شکستی ئەڵمانیا کۆتایی پێ هات و زەرەرو زیانەکانی بەم جۆرە بوون.

(٣٢) ملیۆن سەرباز لەبەرەکانی جەنگدا کوژران.

(٢٠) ملیۆن خەڵکی مەدەنی بە هۆکاری قەسفی فرۆکە جەنگیەکانەوە گیانیان لە دەست دا.

(٢٦) ملیون لەسەربازگەکاندا کوژران.

(٢٠) ملیون کەس کەم ئەندام بوون، کە دواتر توانای کاریان نەما.

(١٥) ملیون منداڵ هەتیو کەوتن بە لەدەست دانی دایك و باوك و خانەدانەکانیان.[1]

## تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی و نزیك بوونەوەی دامەزراندنی دەوڵەتی جوولەکە لە فەلەسطین

هەروەك پێشتر باسمان کرد کە جەنگی دووەمی جیهانی ساڵی (١٩٣٩) دەستی پێکرد و (٦) ساڵی خایاند و بە ملیۆنەهای تێدا بوونە قوربانی سیاسەتە دۆزەخی و دوژمن کاری یەکانی جوولەکە، جەنگ لەساڵی (١٩٤٥) دا کۆتایی هات و زۆرێك لە مەرام و ئامانجەکانی جوولەکەی تێدا هاتە دی ئەوەی بەتەنها مایەوە لەم قۆناغەدا کە جێ بەجێ بکرێت بریتی بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتی (إسرائیل) لە فەلەسطین دا.

بەڵێ تەنها (٣) ساڵ دوای تەواو بوونی جەنگ ی دووەمی جیهانی ولە ساڵی (١٩٤٨) دا بۆ یەکەم جار جوولەکە إعلانی دامەزراندنی دەوڵەتی (إسرائیل) ی کرد لە فەلەسطین دا و(قودس) ی شی کردە پایتەخت و ناوی نا (ئۆرشەلیم).دوا بە دوای ئەم إعلان کردنە زۆرێك لە وڵاتانی خۆرئاوا دانیان نابەو دەوڵەتە دا بە تایبەت دەوڵەتە هەمیشەییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، واتە دوای (٥١) ساڵ لە دارشتنی

---

١- الحرب والشعوب: بدر الدين السباعي.

برگەکانی برۆتوکولات، جوولەکە توانیان گەورەترین خەونیان بکەنە ڕاست و دەوڵەتێکی سەربەخۆو خاوەن هێز لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دا بنیادبنێن، کە چەندین ساڵ بوو خەونیان پێوە دەبینی....

لە دائرەی معارفی بەریطانیدا هاتووە و دەڵێت: ((جوولەکەکان کۆدەبنەوە، وەك گەلێك لە فەلەسطین داو دەوڵەتی جوولەکە بۆ جارێکی تر بنیاد دەنێنەوە، پاشان بنیادی هەیکەلی سلیمان دەکەنەوە و فەلەسطین دەکەنە دەوڵەت بۆ خۆیان) ).

## نەخشەی جوولەکەکان لە گەڕانەوەیان بۆ فەلەسطین و داگیرکردنی

جوولەکە پێشتر نەخشە سازی زۆر وردو ژیرانەیان سازدا بۆ ئەم کارە گەورەو چارەنوس سازە کە ئەویش دانانی بەرنامەی تەواو بوو بۆ گەڕانەوەیان بۆ فەلەسطین، کە ئەمانە بوون:

١- پارێزگاری کردن لە ڕەگەزی جوولەکەو عادات و تەقالیدو هەموو ئەوشتە تایبەتیانەی کە پەیوەست بوو بە خۆیانەوە.

٢- دروست کردنی کاریگەری لەسەر جیهان بەگشتی و دەوڵەتە زل هێزە ئابوری و عەسکەری و سیاسی یەکان بە تایبەتی، لە خزمەت خۆیاندا بن واتە: جوولەکە - هەر بۆیە سەرۆك وەزیرانی ئەو دەمەی (إسرائیل) بە ناوی (دین غورین) لەم پێناوەدا دەڵێت: ((إنتصارنا في معركة فلسطين مرده إلى حسن سياستنا وليس إلى قوتنا الحربية) ) واتە: سەرکەوتنمان لە جەنگی فەلەسطین دا، دەگەڕێتەوە بۆ باش مامەڵە کردنی سیاسیمان نەك هێزی جەنگیمان.

٣- مەشق کردنی سەربازی بە جوولەکەکان بۆ ئەو مەبەستەی کە ئامادە باشیان هەبێت لە دروست کردنی هێزی سەربازی إسرائیلیدا......

٤- کڕینی زەوی و مڵکەکان بە چەند هێندەی نرخی خۆی لە دانیشتوانی فەلەسطین، ئەمیش بە ئامانجی وەدەرنانیان لە زەوی باو باپیرانیان.

٥- یارمەتی دانی کۆمەڵگا جوولەکە نشینەکانی فەلەسطین لە ڕێگەی قەرزی پارەدانەوە.

٦- یارمەتی دان و دەست گرتنی دامەزراوە بازرگانیەکانی فەلەسطین و سوریا، ئەویش لە خزمەتی جوولەکەدا.

٧- دامەزراندنی بانك (مصرف) لە تەواوی خاکی فەلەسطین دا، بۆ یارمەتی دانی بواری ماڵی جوولەکە.

٨- لەت کردنی ڕێگەی وشکانی و لێدانی سکەی قیتار.

٩- هاندان و کار بۆ ئاسانکردنی جوولەکەکانی جیهان کە دانیشتووی غەیری فەلەسطین بوون، بگەڕێنەوە بۆ فەلەسطین و تەواوی مافەکانیان دەستەبەردەکرێت و ضەمانی ژیانیان دەکرێت و حکوومەتی إسرائیل دەبێتە دایك و ئامێزیان بۆ دەگرێتەوە، هەر لەم ڕێگەیەوە بوو کە زۆربەی جوولەکەکانی جیهان بە گشتی و کوردستانی خۆمان بە تایبەتی گەڕانەوە بۆ إسرائیل و جێگەو شوێنەکانی خۆیان بە جێهێشت..........

١٠- شوێن ئەو ڕێگە سەرەتاییانە کەوتن کە دان پیانانی دووەڵی یان لە بەرامبەر بە حکومەتی إسرائیل دا تیا دەستەبەر دەکرا و بە حوکومەتێکی شەرعی دەناسێنرا بە جیهان.

١١- بێ گومان ئەمانەو دەیان خاڵی تر بریتی بوون لەو هۆکارو نەخشانەی کە جوولەکە گرتیانە بەر بۆ داگیرکردنی فەلەسطین و دامەزراندنی حکومەتێکی بنکە فراوانی سەربازی و سیاسی و دینی و نەتەوەیی بۆ سەرجەم جوولەکەکانی دنیا......

**دوا وتە لەم باسەدا: -**

ئەوەی پێشتر خوێندتەوە بەشێکی زۆر کەم بوو لە چیرۆکی (بروتوکۆلات) ی جولەکە ، کە هەوڵی تەواویان دا بڕگە بڕگە و خاڵ بە خاڵی جێ بە جێ بکەن بە ئومێدی دەست گرتنی تەواویان بەسەر جیهاندا وبۆ مەبەستی بەرچاو ڕۆشنکردنی

تۆی خوێنەری خۆشەویست ، حەزم کرد هەندێك لە ئامانجی سەرەکی و خاڵەکانی (بروتوکۆلات) باس بکەم ، کە بریتی بوون لەمانە: –

١– لەناوبردنی دینەکانی غەیری –جولەکە– بەتایبەت مەسیحەت و هەردوو ڕێچکەی (کاثولیکی و ئەرسۆزوکیسی) و پاشان إسلام هەروەك پێشتر باسمان کرد ، کە جێ بە جێ کردنی ئەم برگانەی بروتوکۆلات ، لە ژمارە(١٤,١٧) خۆی لە یارمەتی دانی شۆڕشی بەلشەفی ڕوسیادا دەبینیەوە لەلایەن شوعیەکان و لەناوبردنی قەیسەری مەسیحی، پاشان بۆ دژایەتی کردنی(إسلام) یش دەوڵەتی عثمانیان) ڕوخاندو خەونەکانیان هاتە دی.

٢– دەست گرتن بەسەر ئابووری جیهاندا (الأقتصاد العالمي) و کۆکردنەوەی پارەو کەڵەکە کردنی، هەروەك لە بروتوکۆڵی (٦) دا باس لەم مەسەلە گرنگە دەکات.

٣– دەست گرتن بەسەر میدیای جیهاندا ، لە هەرسێ بواری بینراو بیستراوو خوێندراو ، کە ئەمەشیان لە (بروتوکۆلات) ی ژمارە (١٢) دا باس کراوە.

بێگومان جولەکە توانیان دەست بەسەر زۆرێك لە کەناڵە میدیاییەکانی ئەمەریکادا بگرن ، هەر لەبەرئەمەیە کە ئەمەریکا زۆر گوێ ڕیەڵ بۆ جولەکەو بەرژەوەندیەکانی دەپارێزێت.

پاشان دەست گرتنیان بەسەر میدیای ڕۆژئاوا بەگشتی و بەریطانیا بە تایبەتی، ئەویش بەو جۆرەی کە لە میدیەکانی هەریەك لە ئەمەریکا و ئەوروپا وە هیچ شتێك نەوترێت و بڵاونەکرێتەوە لە دژی جوولەکەو بەڵکو بە پێچەوانەوە پەردە پۆش کردن و شاردنەوەی کارە دزێوو چەپەڵەکانیان کە ڕۆژانە ئەنجامی دەدەن، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پۆزش هێنانەوە بۆ کیانی زایۆنی بەوەی کە هەرچی دەکات مافی خۆیەتی بەرگری لە بوونی خۆی دەکات و تەواوی ئەو گروپ و حزب و دەسەڵات و وڵاتانەی کە دژی جوولەکەن، تیرۆرستن و لە لیستی ڕەش دان.

٤- کوشتن و لە ناوبردن و ڕفاندنی هەموو ئەو کەسانەی کە دژایەتی بەرژەوەندیە باڵاکانی جوولەکە دەکەن و دەبنە مەترسی لەسەر کیانی إسرائیل، هەروەك لە بڕگەکانی (١٥،٨،١) ی بروتۆکۆلاتدا باسیان لەم خاڵە کردووە.

٥- پشت بەستن بە کاری جاسوسی و هەواڵ دزین لە هەموو بوارەکاندا، ئەمەش لە بروتوکۆلی (١٧) دا باسی لێوە کراوە، جوولەکە لە کاری جاسوسیدا دوا پلەکانی زیرەکیان بڕیوە بە جۆرێك کە هیچ کەس لە جیهاندا هاوتایان نیە، (موساد) (جیهازی مخابەراتی ئیسرائیلی) بە بەهێزترین و فێڵاوی ترین و سەرکەوتووترین دەزگا دادەنرێت لە جیهاندا کە کاری سەرەکی بریتی یە لە کاری سیخوڕی بۆ جوولەکە.

٦- بڵاوکردنەوەی فەسادو بەدکاری و حەزە جنسیەکان و سەرقاڵ کردنی خەڵکی پێوەی، بەجێ هێنانی ئەم خاڵەیان وەك ڕۆژی ڕووناك دیارە، گەر سەیرێکی نوقم بوونی خەڵکی ئەوروپا بەگشتی و ئەمەریکا بەتایبەتی بکەین، پاشان گەر سەرنجی وڵاتانی بەناو إسلامی خۆشمان بدەین، ئەوە پێویستمان بەهیچ بەڵگەیەك نابێت بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە، کە چۆن گەنجمان لە کوڕو لە کچ سەرقاڵ کراون بە یەکترو بە گۆرانی و ڕەقس و خۆ نمایش کردن بۆ یەکتروو تێکەڵ کردن و ئاسایی کردنەوەی پەیوەندی نادروستی نێوانیان و تەرخان کردنی دەیان و سەدان کەناڵی ئاسمانی و لوکاڵی لە پێناو ئەم نزمیانەدا....هەوڵ دان بۆ بێ ئابڕوکردنی هەردوو ڕەگەزو فڕێ دانی بەرگی شەرم و داوێن پاکی و بەنامۆ پیشاندانی بەها باڵاکان و ئاسایی کردنەوەی گەندەڵیە ئەخلاقیەکان....هەمووی لە کاری پیس و دۆزەخیانەی جوولەکەیە، لە بڕگەکانی برۆتوکولاتدا نەخشەسازیان بۆ کراوە.

٧- برسی کردن و نان گرتنەوە لە گەلان و سزادانیان بە ئابلۆقەی ئابوری (الحصار الأقتصادي) ئەمیش لە پێناو دەیان ئامانج دا کە بریتین لە:

أ- هەرگەلێك برسی کرا بە ئاسانی دوو شتی زۆر گەورە لە دەست دەدات کە ئەوانیش بریتین لە (دین وڕەوشت) کە ئەمەش گەورەترین ئاواتی جوولەکەیە دەرهەق بە گەلان.بەڵگەشمان لەسەر ئەمە، بوونی ئابلۆقەی چەند ساڵەی سەر

عێـراق بـوو لەلایـەن نەتـەوە یـەکگرتووەکان و لـەدوای داگیرکردنـی کوەیـت لەبـەرواری(٢- ٨- ١٩٩٠) لەلایـەن سـوپای عێراقـەوە، بینیمـان گـەلی عێـراق لـە دەرەنجامی ئەو ئابلۆقە سەپێنراوەی سەر عێراق توشـی چ کارەسـاتێکی مرۆیـی و دینی و ئەخلاقی بوو!!.

ب- هەر گەلێك برسی کرا بیرکردنـەوە لـە دەسـت دەدات، چـونکە گـەورەترین ئامانج لە ژیاندا بریتی دەبێت لە پەیداکردنی بژێوی ژیان، بەمەش توشی گەورەترین دواکـەوتوی دەبـن لـەڕوی سیاسـی و فەرهـەنگی و ڕۆشـنبیری و زانسـتیەوە، کـە دیسانەوە ئەمەش گەورەترین ئامانجی جوولەکەیە لەوەی کە گەلان نەزان و بـەنج و نەفام بن و بیرنەکەنەوەو تەنها خـەیاڵیان لای تێرکردنـی (گیرفـان و گـەدەو داوێـن) یان بێت !!!

ج- هەر گەلێك برسـی کـرا ئـازادی لەدەسـت دەدات، چـونکە چـاوەڕێی (نـان) دەبێت لـە کەسـانی غـەیری خـۆی، بەمـەش ئـازادی لـە دەسـت دەدەن و جڵـەویان دەچێتە دەستی (نان دەرانیانەوە)، گومان لەوەشدا نیە کە وتراوە (نانت بە دەست کێ بێت، بڕیاریشت هەر بـە دەسـت ئـەو دەبێـت).هـەموو ئەمانـەی کـە باسـکرا بـە زیادەوە بەسەر خۆمان هاتووەو بەسەریان هێناوین !!

٨- گرتنـە بـەری هـەموو ڕێگەیـەکی دروسـت و نادروسـت بـۆ گەیشـتن بـە ئامانجەکانت، ئەمەش لە پێناو جێ بەجێکردنی (الغاية تبرر الوسيلة)

٩- ئەوکەسەی دەبێتە کەسێکی سیاسی نابێت پابەندبێت بە هـیچ بنەمایـەکی ئەخلاقیـەوە، وە سیاسـی سـەرکەوتوو ئـەو کەسـەیە کـە هـیچ بایـەخێکی بـۆ بـەها باڵاکان دانەنێت.

١٠- بڵاوکردنـەوەی ئاکـارە دزێـوو نەخۆشـەکان لـە نـاو گەلانـدا، کـە ئەمـەش یارمەتی دەرێکی باشە بۆهەڵوەشاندنەوەی یەکەکانی خێزان و لە ناوبردنی هـەروەك لە بروتوکولی (١٢) دا باس لەم خاڵە دەکات.

جوولەکە لەم بوارەدا ئەسپی خۆی چـاك تـاوداو بـە تایبـەت ئافرەتیـان کـردە گەورەترین هۆکار بـۆ جـێ بـەجێ کردنـی ئـەم ئامانجـەگڵاوەیان، ئـەویش بـە نـاوی

ئازادکردنی ئافرەت (تحریر المرأة) و دەست پێ هەلگرتنی لە گەورەترین کاری سەرەکی خۆی، کە خانمێتی ماڵ و دایکایەتی و پەروەردەکردنی نەوەی نوێ بۆ دوا ڕۆژی کۆمەلگا، لە بەرامبەر دا کار پێ کردنی لە دام و دەزگاکان و هەلگرتنی ئەو ئەرك و بارانەی کە لەسەر شانی پیاو بوو، پاشان تێکشکاندنی نەفسیەت و لەناوبردنی ژنایەتی ئافرەت و کردنی بە پیاو لەم نێوەندە باجی هەرە گەورە تەنها ئافرەت دای چونکە لە کاری سەرەکی خۆی لابراو خرایە سەر کاری پیاو، بەمەش ئەوەی کە هەیبو لە دەستی داو کاری پیاویشی پێ ئەنجام نەدرا!!!!!!

١١- نەمانی خێزان لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا ئەنجامی ڕەنج و تێکۆشانی جوولەکەیە لەم بوارەداو گەورەترین بەلگەیە لەسەر ئەم ڕاستیە.

ئەو کەسەی دەکرێتە دەسەلات داروو فەرمان ڕەوا دەبێت مارەسەی کاری فێلّ کردن و دزی و چاو بەست کردنی گەل و خیانەت لەگەلّ کردنیان لە بەرامبەردا ئەنجام بدات، کە لە بروتوکۆلی (١) دا باس لەم خالە دەکات.بە جێ هاتنی ئەم ئامانجەشیان کارێکی بەلگە نەویستە، ئەویش بەوەی گەر سەرنجی دەسەلاتدارانی سەر زەوی ئەمڕۆ بدەین ئەم سیفەتە دزێوەیان زۆر بە ئاشکرا تێدا بەدی دەکەین، لەوەی کە پێش هەلبژاردنیان چ فریشتەیەکن لەگەلّ گەل و میللەت و هەوادارانیاندا و دوای گرتنە دەستی فەرمان ڕەوایشیان چ إبلس و نەگلیسێکن لەگەلّیاندا؟!!

# بەندی شەشەم

## مێژووی جولەکەکانی کوردستان

یەکێکی تر لەو باسە گرنگانەی کە پێویستە هەڵوێستەیەك لەسەری بکەین و کەمێك بنوسین دەربارەی بریتیە لە (مێژووی ئەو جولەکانەی کەلە کوردستاندا ژیان و هۆکاری هاتن و مانەوەو پاشان کۆچکردنیان لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا بەرەو ئیسرائیل).

بێگومان ئەمەش مەسەلەیەکی گرنگەو تەواوکاری باش دەدات بەبابەتی نێو کتێبەکەمان، چونکە ئەم کتێبە بەزمانی شیرینی کوردی نوسراوەو خوێنەری کورد دەیخوێنێتەوە، لەبەرئەوە پێویستە لەدوابابەتەکانی ئەم باسەدا کورتەیەك دەربارەی (کوردو جولەکە) و مێژوویان بنوسرێت، تا تۆی بەڕێز زیاتر ئاشنا بکات لە تەواوی ئەم باسە، ئەوانیش لەچەند باسێك پێك هاتوون کە ئەمانەن:

### باسی یەکەم: مێژووی هۆکاری پەیدابوونی جولەکە لە عێراق بەگشتی و لە کوردستان بەتایبەتی...

هۆزو کۆمەڵەکانی جولەکە لەخاکی عێراقدا بەکۆنترین تاقم هەژمار دەکرێن لە ئاست هۆزو تاقمەکانی تری جولەکەی جیهان، بێگومان هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو حاڵەتی سەرەکی کە لە مێژووی جولەکەدا زۆر دیارە ئەوانیش بریتین لەو داگیرکەریەی کەبەسەریاندا هات لەسەر دەستی هەردوو زلهێزی ئەو سەردەمە کەپادشای (ئاشوری و بابلی)بوو ئەویش بەوەی کە هێرشیان کردە سەر وڵاتی (کەنعان) واتە (فەلەستین).

پادشای ئاشوریەکان ناوی (تجلات بلاصر) بوو، هەڵسا بەداگیرکردنی بەشی باکوری (فەلەستین) لە ساڵی (٧٣٢) ی پێش زاین و بەم هۆیەشەوە دەستی گرت بەسەر خاکی(جلیل) دا کە بەشی باکوری فەلەستینی دەکرد لەگەڵ خۆرهەڵاتی ئەردەندا، دوای تەواوبوونی جەنگ ئاشوریەکان هەڵسان بەڕاگواستنی هۆزی

(نفتالي) که یەکێ بوون لە (١٢) هۆزەکەی بەنی ئیسرائیلو پاشان دانیشتوانی خۆرهەلاتی ئەردەنو بەرەو شاری (ئاشور) کە باکوری عێراق دەکاتو لە ئێستادا بە کوردستان ناودەبرێت هێنایان.

بەهەرحاڵ ئاشوریەکان لە حەملەی یەکەمدا بەشی باکوری فەلەستینیان داگیرکرد کەبە (اسرائیل) ناسرابوو، پاشان بۆ جاری دووەم هەڵسان بە هەرەشەکردن لەو جولەکانەی کە دانیشتووی بەشی باشوری فەلەستین بوون کە پێی دەوترا (مملکة یهودا) و بە تایبەتتر پایتەختەکەیان (أوشلیم) بوو-القدس-دوای دەستگرتنیان بەسەر بەشی باشوری فەلەستیندا، هەروەك جاری یەکەم هەڵسان بەڕاگواستنی ژمارەیەکی زۆری ئەو جولەکە دانیشتوانەی کەلەوێدا نیشتەجێ بوون، بۆ ئەو خاکەی کە ئاشوریەکان خۆیان تیایدا دەسەلاتیان هەبوو، ژمارەی جولەکە ڕاگوازراوەکان بۆ ژێر دەسەلاتی ئاشوریەکان لە عێراق بەگشتیو کوردستانو بەشێك لە تورکیا بەتایبەتی بریتی بوون لە نزیکەی (٢٧٢٩٠) کەسو ژمارەیەك سەربازی زۆر بۆ لێخوڕینی (٥٠) ئەسپو عەرەبانە کەوتنە ڕێ تا ئەم کارە بەڕێوەبچێت.

دەوڵەتی ئاشوری لەساڵی (٦١٢) ی پێش زاینداو لەسەر دەستی هاوپەیمانی (کلدانیەکان) کۆتایی هات، بۆ جارێکی تر دەوڵەتی کلدانی هەڵسان بە شەڕو جەنگو هێرش کردنە سەر بەشی باشوری فەلەستین کە بە (یهودا) ناسراوبوو، بەهۆی کۆمەڵێك هۆکارەوە کە یەکێکیان بریتی بوو لە پابەند نەبوونی جولەکەکان بەو پەیمانانەی کە دابوویان بە دەسەلاتی کلدانیو پاشان کاریۆ ئاسانکردنی میصریەکان کە ولاتیان بۆ بەرن بەڕێوەو لەبری کلدانیەکان، هەر بۆیە بۆدواجار فەلەستینو لەگەڵیشیدا(أوشلیم) ی پایتەخت کۆتاییان بەدەسەلاتداریتی جولەکەی تێدا هێنرا لەسەر دەستی پادشای بابلیەکان بەناوی (نبو خذ نصر) لە ساڵی (٥٨٦) ی پێش زاینیدا.

ئەم پاشایە هەڵسا بەکاولکردنی (مسجد الاقصی) پاشان ڕاگواستنی هەزاران جولەکەی دانیشتووی ئەوێ بەرەو (بابل) لەخوارووی عێراق.بەتایبەتتر هەندێکی لێ

هێنان بۆ ناوچە کوردنشینەکان، کە تا ئێستاش دەنگوباسیان دیار نیەو توێژەران بەم کەسە ونبوانە دەڵێن: (الاسباط المفقودة) واتە: "کۆمەڵە نادیارەکان"( THE LOSI TRIBES) بەڵام ئەوەندەی جێگیرو دیارە دەربارەی (ئەم کۆمەڵە نادیارە) ئەوەیە کەئەمانە لە (١٢) کۆمەڵەکەی جولەکەن.

بەڵێ ئێستا تاڕادەیەك تێگەیشتینو بەرچاو ڕوون بووین لە هۆکارو مێژووی هاتنی جولەکە بۆ (عێراقو کوردستان) کە لەسەر دەستی پادشا دەسەڵاتدارەکانی ئاشور لەساڵی (٧٣٢) ی پێش زاینو بۆ جاری دووەمیش لەسەر دەستی پادشای بابلی (نبو خضر نصر) لە ساڵی (٦١٢) ی پێش زاین ئەم ڕووداوانە ڕوویان داوە.

دوای جێگیربوونو مانەوەیان لە کوردستاندا جولەکەکان پەرەیان سەندوو لەڕووی ژمارەوە زیادیان کردو تێکەڵ بوون لەگەڵ دابو نەریتو زمانو شێوازی ژیانو عورفو عادەتی عێراقیەکان بە گشتیو گەلی کورد بەتایبەتی، بەبێ لەدەستدانی کەلتورو شوناسو دینو تایبەتمەندیەکانی خۆیان[١].

**باسی دووەم: ئیمارەتی (حیدیاب) ی جولەکە لە کوردستاندا.**

دوای زاڵبوونی هێزی (فەریسیەکان) بەسەر جڵەوی فەرمانڕەوایی لە (ئێرانو عێراقو کوردستان) دا لە ساڵی (١٢٦) ی پێش زایندا و ڕماڵینی دەسەڵاتو شوێنەواری (سەلجوقیەکان) کە هاوپەیمانی (ئەسکەندەری مەقدۆنی) بوون، میرنشینێکیان لەو ناوچەیە دامەزراند کە سەردەمی ئاشوریەکانو بابلیەکاندا جولەکەی تێدا نیشتەجێ کرابوو، بەناوی میرنشینی (حیدیاب) کە بەعەرەبی پێی دەوترا (حزة).

ئەم میرنشینە لە لایەن جولەکەکانەوەو لە خاکی کوردستاندا دامەزراو لە سنوری جوگرافیو دەسەڵاتی لەناوچەی ئازەربایجانەوە دەستی پێدەکرد بەرەو

---

١- دراسات في تأريخ اليهودية والمسيحية في كوردستان. د: فرست مرعي.

خۆرهەلاتی ڕووباری (دیجلە) و تا ناوچەی (نصیب) لە سنوری تورکیا درێژ دەبویەوە، بەلام تەمەنی ئەم میرنشینە لە (٧٩) ساڵ زیاتری نەخایاندو کۆتایی هات، دکتۆر (أحمد سوسە) کەسایەتی جولەکەی عێراقی بوو، بەلام لەسەردەمی پاشایەتیدا موسوڵمان بوو، لە کتێبی (العرب والیهود في التأریخ) دا دەڵێت: ((إیمارة حیدیاب تأسس وسط منطقة کردستان، وازدهرت في القرن الاول بعد المیلاد )).واتە: میرنشینی حیدیاب لە ناوەڕاستی کوردستاندا دامەزراو لەسەدەی یەکەمی دوای زاین کۆتایی پێ هات.پادشای ئەم میرنشینە ناوی (مونو بازوس) بوو، ئافرەتێکی کردە هاوسەری خۆی بەناوی (هیلانة) لە ساڵی (٥٠) ی زاینیدا کۆچی دوایی کرد.منداڵێکی کوڕی لە (هیلانة) بوو بەناوی (إیزاتیس) و لە ساڵی (٣٦) ی زاینیدا جڵەوی فەرمانڕەوایی گرتە دەستو بەردەوام بوو تا ساڵی (٦٠) ی زاینیو دواتر ئەویش کۆچی دوایی کرد، بەڵێ ئەم میرنشینە پایتەختەکەیان بریتی بوو لە (أربیل)و ماوەی (٧٩) ساڵ بەردەوام بوو، بەلام دواتر لەسەر دەستی (إجرا گوری رومانی) بەناوی (تراجان) کۆتایی هات لە ساڵی (١١٦) ی زاینی[١].

## باسی سێیەم: جولەکەکانی ڕۆژهەلاتو کوردستان.

کاتێك سەرنج لە هەڵسو کەوتو شێوازی ژیانی جولەکەکان دەدەین، دەبینین کە جولەکەکانی ڕۆژهەلات زیاتر جیاوازییان هەیە لەوانی تر، بەتایبەت جولەکە دانیشتووەکانی ولاتانی عەرەبیو بەشێك لە ئێرانو کوردستان بەتایبەتی بە زمانی ئارامی نوێ قسەیان دەکرد، سەرەڕای ئەمەش دەبێت ئەوە بزانرێ جولەکەکانی ولاتی کوردستان (سەرەڕای زمانی تایبەتی خۆیان کە زمانی (عبریە) زۆر بەباشی زمانی کوردیشیان زانیوە) و لەگەڵ ئەوەشدا جولەکەکانی ولاتی عێراقو کوردستان تێکەڵ بە دانیشتوانی سەرجەم گەلانی عێراق بوو بوونو لە هەموو شوێنو جێگەیەکدا بەدی دەکران، بەردەوام بەدوای پیشەو کاروباری خۆیاندا سەرگەرم

---

١- أبحاث في الیهودیة والصهیونیة : أحمد سوسة : ص ١١٢، ١١٣.

بوون، ئەنانەت لە سالانی حوکمڕانی دەوڵەتی ئیسلامیداو لە ڕۆژگاری (عەباسیەکان) دا (١٣٢-٦٥٦) ی کۆچی‌و دواتریش لەسەردەمی عوسمانیەکاندا لە نێوان ساڵەکانی (١٢٩٩-١٩٢٢) ی زایینی لە عێراقدا هەموو داب‌و نەریتێکی تایبەت بەخۆیان هەبووەو ئازادو سەربەست بوون لە ژێر چەتری دەسەلاتی ئیسلامیداو تەواوی ماف‌و ئازادیەکانیان بۆ فەراهەم هاتبوو، موسوڵمانان هەم مافی نەتەوەیی‌و هەم مافی بیروباوەڕی ئازادیان پێ ڕەوا دەبینین‌و هیچ دەسەلاتێك لەو دەسەلاتە ئیسلامیە یەك لەدوای یەکانە لەژێر هیچ ناوو بیانویەکدا سەرکوتی جولەکەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیان نەدەکردو جولەکە بەتەواوی مانا ئازادو سەربەست بوون لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بەجۆرێك کەلە ڕۆژگاری دەوڵەتی عوسمانیداو لەساڵی (١٨٧٦) کە دەستوری عوسمانی بلاوکرایەوە، زۆر لە جولەکەکانی ناو ئەم قەڵەم ڕەوە بوون بەئەندام لە ئەنجومەنی پیرانی دەوڵەتی عوسمانیداو یەکەم دەزگای چاپ‌و بلاوکردنەوە ئەو جولەکانە هێنایانە تورکیاوە کەلەسەر دەستی دەسەلاتدارە ستەمکارەکانی ولاتی ئیسپانیاوە ڕاونرابوون‌و ئەوانیش لەژێر چەتری دەسەلاتی عوسمانیدا گیرسابوونەوەو موسوڵمانان باوەشی سۆزو مرۆڤ دۆستانیان بۆ کردبوونەوە[1].

---

1- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی‌و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، بەغداد: ١٩٧٨: لاپەڕە ٤٣، ٤٤.

باسی چوارەم: شوێنە پیرۆزەکانی جولەکە لە کوردستان.

لە عێراقدا بەگشتیو لە کوردستان بەتایبەتی هەندێ شوێنی پیرۆز هەن کە تایبەتن بەجولەکەوە، کە ئەمانەن:

١- گۆڕی پێغەمبەر (ناحوم الاقوشی) لە ناوچەی پێ ڕەش.

٢- گۆڕی حازان دیفیدو حازان یوسف لە ناوچەی (عمادیە).

٣- ئەشکەوتی (إلیا) لە گوندی (بیتنور) ی ناوچەی (بەرواری بالآ).

٤- گۆڕی (دانیاڵ) پێغەمبەرو هاوڕێکانی لە شاری کەرکوك.

٥- گۆڕی (إستیر) و مامی بەناوی (مردخای) لە شاری هەمەدان.

٦- گۆڕی (ناثانیل هالیفی) لە ناوچەی بەرزان.

٧- گۆڕی (شموئیل ناثانیل) لە شاری موصڵ کە پێی دەوترێت (شێرەدین).

پاشان دەربارەی ئەو جێگەو شوێنانەی کە (کەنیسەت) ی جولەکەی تێدا بووە، واتە شوێنی پەرستشەکانیان - لە زۆربەی هەرە زۆری شاروشارۆچکەکانی کوردستاندا بوونیان هەبووەو بە ئازادی پەرستشی تایبەت بە خۆیان تێدا ئەنجام داوە، ئەویش بەم جۆرەی لای خوارەوە:

| ژماره | شوێن | ژمارەی پەرستگاکان |
|---|---|---|
| ١ | اربیل | ٣ |
| ٢ | العمادیة | ٢ |
| ٣ | کرکوك | ٢ |
| ٤ | زاخۆ | ٢ |
| ٥ | دهۆك | ٢ |
| ٦ | سلێمانی | ١ |
| ٧ | هەڵەبجە | ١ |
| ٨ | ئاکرێ | ١ |
| ٩ | شەقلاوە | ١ |
| ١٠ | ڕەواندوز | ١ |
| ١١ | خانەقین | ١ |
| ١٢ | پێنجوێن | ١ |
| ١٣ | هیران | ١ |
| ١٤ | سنە (سنندج) | ١٧ |
| ١٥ | مهاباد | ١ |
| ١٦ | دیاربەکر | ١ |
| ١٧ | ماردین | ١ |
| ١٨ | کفری | ١ |
| ١٩ | کوێسنجاف | ١ |
| ٢٠ | شنۆ | ١ |
| کۆی گشتی پەرستگاکان | | ٤٢ |

- لەگەڵ ئەوەشدا کە لەهەندێ شارو شارۆچکەی تری کوردستاندا قوتابخانەی تایبەت بە خۆیان هەبووەو سەر بە (کەنیست) ی جولەکە بوون، ئەویش بەم جۆرە:

| ژمارە | شوێن | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| ١ | أربیل | قوتابخانەیەك بووە سەر بە (کنیست) ی جولەکەکان. |
| ٢ | کەرکوك | قوتابخانەیەکی ئیسرائیلی بووە لە کەرکوك. |
| ٣ | عمادیة | قوتابخانەیەك بووە سەر بە(کنیست) ی جولەکە. |
| ٤ | سنە | پایتەختی کوردستانی ئێرانە، و دوو قوتابخانەی تێدا بووە. |
| ٥ | خانەقین | قوتابخانەیەك بووە سەر بە (کنیست) ی جولەکە. |
| ٦ | زاخۆ | قوتابخانەیەك بووە سەر بە (کنیست) ی جولەکە. |
| ٧ | شنۆ | شارێکە لە کوردستانی ئێران. |
| ٨ | نیدوە | گوندێکە لە کوردستانی عێراق نزیك سنوری تورکیا. |

- بوونی ئەم ژمارە زۆرو لەبەرچاوەی جێگەو شوێنی پەرستشو قوتابخانە تایبەتانەیان بەڵگەی تەواو دروستە لەسەر ئازادی ڕەهاو نەرمیو مامەڵەی جوانو تێگەشتوانەی موسوڵمانان لەگەڵ جولەکەدا لەسەردەمی زێڕینی ئیسلامیدا، بەڵام لەبەرامبەرداو ئێستا کاتێك جولەکە دەسەڵاتی هەیە، هەموو دەزانین کە ئەوان چۆن مامەڵە لەگەڵ موسوڵمانانداندا دەکەنو بە ئاگروئاسن بەرپەرچیان دەدەنەوە!!!

باسی پێنجەم: هۆکاری کۆچکردنی جولەکەکانی کوردستان بۆ ئیسرائیل لە ناوەڕاستی سەدەی (بیست) دا.

هەروەك پێشتر باسمان کرد ئەو جولەکانەی کەوتبوونە عێراقو کوردستانەوە زۆربەی پاشماوەی ئەو جولەکانە بوون کە بە دوو قۆناغی جیاوازو لە لایەن ئاشوریەکانو پاشان بابلیەکانەوە هێنرابوونە عێراقو کوردستانو جێگیر بوو بوون لە ساڵی (٥٣٩) ی پیش زاینیداو لە لایەن کورشی دووەمی فارسەکانەوە ناوچەی بابلو باشوری عێراقیان داگیرکرد، پاشان (کورش) ساڵێك دوای داگیرکردنی بابل ڕێگای دا بەگەڕانەوەی جولەکەکان بۆ فەلەستینو بەهۆی ئەم ڕێگە پێدانەوە نزیکەی (٤٠) هەزار جولەکە گەڕانەوە بۆ (أوشلیم) دواترو لە دوای ئەم ساتەوە کۆچی جولەکەکان بۆ ئیسرائیل بە شێوەیەکی (سنوردار) بوو، تا ئەوساتەی کە دەوڵەتی جولەکە ڕاگەیەندرا لەساڵی (١٩٤٨) داو دوابەدوای ئەم ڕاگەیاندنە سەرجەم جولەکەکانی جیهان بەگشتیو عێراقو کوردستان بەتایبەتی سەرەتای کۆچیان دەستیان پێ کردوو ژمارەیەکی زۆریان لە ڕێگای (ئێران) ەوە دەستیان دایە کۆچی بەکۆمەڵ، لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٤٩) دا حوکومەتی عێراق ڕێگەی بەو جولەکانەدا کە ئارەزووی کۆچکردنیان هەبوو، بەو مەرجەی دەستهەڵگرن لەو شوناسنامە (جنسیە) عێراقیەی کە هەیان بوو بەم پێیە (٦٣) هەزار جولەکە لە ڕێگەی هێڵی ئاسمانی ئەمەریکاوە کۆچیان بەرەو (ئیسرائیل) دەست پێکرد.

بۆ ساڵی دوایی‌و لە ساڵی (١٩٥٠) دا (صالح جەبری) وەزیری ناوخۆی عێراق پرۆژە یاسایەکی خستە بەردەم پەرلەمانی عێراقی‌و ئەوەی تێدا هاتبوو کە گەڕانەوەی جولەکە لە عێراقەوە بۆ ئیسرائیل ڕێگە پێدراوە بەو مەرجەی دەست لە شوناسنامەکانیان هەڵبگرن، پاشان یەکێك لە قسەکانی تری ئەوە بوو کە دەیووت((بەهیچ جۆرێك لە بەرژەوەندی عێراقدا نیە کە ڕێگربن لەبەردەم کۆچی جولەکەکاندا، تا لەعێراقدا بمێننەوە) ).بێگومان بڕیارێکی ئاوا گرنگو هەستیار گەورەترین فاکتەر بووە بۆ هاندانو ڕێگەی خۆشکردنی گەڕانەوەی جولەکەکانی

عێراق و کوردستان بۆ ئیسرائیل.بەڵێ دوابەدوای ئەم ڕێگە پێدانە جولەکەکان کەوتنە خۆیان و زۆربەیان لەناوچەی قەسری شیرین –خانەقین– پەنایان بۆ ئێران بردوو لەوێوە بەفڕۆکە دەبرانە –قبرص–و دواتر دەگوێزرانەوە بۆ فەلەستین، ئەو جولەکانەی بەم ڕێگەیەدا دەڕۆشتن بریتی بوون لە جولەکە دانیشتووەکانی کوردستان و ناوەڕاستی عێراق...بەڵام جولەکەکانی ناوچەی موسڵ و زاخۆ ئامێدی و بەشێك لە هەولێرو چەند ناوچەیەکی سنوری تر دەچوونە (تورکیا) و لەوێوە بەرەو ئیسرائیل دەگوازرانەوە، هەندێکی تریان لە جولەکەکانی باشوری عێراق لە ڕێگەی (شط العرب) ەوە دەچوونە (ئەبادان) و وڵاتی ئێران و لەوێوە بەرەو ئیسرائیل دەگەڕانەوە.

ژمارەی ئەو جولەکانەی کە لەنێوان ساڵەکانی (١٩١٩–١٩٤٥) گەڕانەوە بۆ ئیسرائیل بریتی بوون لە (٢٥٣٩) کەس.

دوای ساڵی (١٩٥٠) لەلایەن بەریتانیەکانەوە بە کوردە جولەکەکانی کوردستان ڕاگەیەنرا کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ گەڕانەوە بەرەو خاکی فەلەستین.

بێگومان ئەم مژدەو ڕێگە بۆخۆشکردنەی ئینگلیزەکان گەورەترین هاندەر بوو بۆ کۆچی جولەکەکان لە کوردستانەوە بەرەو ئیسرائیل.

**باسی شەشەم: قۆناغەکانی کۆچکردنی جولەکەکانی جیهان لەنێوان ساڵەکانی (١٩٤٨-١٩٧٣).**

**یەکەم: ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٨-١٩٥١).**

ئەم ماوەیە بەدیاردەی کۆچی بەکۆمەڵی جولەکەکان هەژماردەکرێت لە مێژووی کۆچی جولەکە بۆ ئیسرائیل.

ژمارەی کۆچەرانی جولەکە لەم ساڵانەدا بریتی بوون لە (٦٥٨) هەزار جولەکەی کۆچکەر، تەنانەت ئەم شەپۆلە کۆچەی جولەکە لە ساڵی (١٩٤٨) کە جەنگی بەناو (عەرەب–ئیسرائیل) یش هەڵگیرسا، نەوەستاو کۆچ هەر بەردەوام بوو، بەزۆری جولەکە لەم سێ ناوچەیەوە بەرەو فەلەستین بەڕێ کەوتن.

١ –جولەکەکانی ئەوروپای خۆرئاواو قبرص.

٢– جولەکەکانی ئەوروپای خۆرهەلآت.

٣– ئەوانەی کە لەولآتە عەرەبیەکانو کوردستانو هەندێ لە ولآتانی تری ڕۆژهەلآتەوە بەرەو ئیسرائیل بوو بوونەوە.

دووەم: ماوەی نێوان سالآنی (١٩٥٢-١٩٥٤).

لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا کۆچکردنی جولەکە ڕووی لە دابەزین کرد، بەجۆرێك ژمارەی کۆچکەران لە (٥٠) هەزار کەس تێنەدەپەڕی، لە ناویاندا ڕێژەی (٧٨٪) یان بریتی بوون لە جولەکەکانی ڕۆژهەلآت، بێگومان هۆکاری ئەم دابەزینەش لەنێوان ئەو دوو ساڵەدا دەگەڕایەوە بۆ ئەو قەیرانە ئابوریەی کە توشی حوکمەتی ئیسرائیل بوو بوو.

سێیەم: ماوەی نێوان سالآنی (١٩٥٥-١٩٥٧).

لەم قۆناغەدا کۆچکردن لەبەرزبوونەوەیەکی بەرچاودا بوو، ئەویش بەهۆکاری باش بوونی بواری ئابووری حوکمەتی ئیسرائیلەوە.

ژمارەی کۆچکەران لەم دوو ساڵەدا گەیشتە (١٦٠) هەزار کەسو نزیکەی (١٠٠) هەزاریان لە ولآتانی خۆرئاوای عەرەبیەوەو ئەوانی تریشیان لە پۆڵەنداوە هەنگاویان بەرەو خاکی فەلەستین هەلگرتو کۆچیان بەرەو ئەوێ سازدا.

چوارەم: ماوەی نێوان سالآنی (١٩٥٨-١٩٦٠).

لە نێوان ئەم دوو ساڵەدا ڕێژەی کۆچکەرانی جولەکە لە ولآتە جیاوازەکانو جیهانەوە بەرەو ئیسرائیل بۆ جارێکی تر ڕووی لە دابەزین کردو تەنها (٧٥) هەزار کەس بەشداری کۆچیان کرد ، ئەمش لەبەرئەوەی لەم ماوەیەدا ولآتێکی وەك مەغریب سەربەخۆیی خۆی وەرگرتو ڕێگای لە مەسەلەی کۆچ گرت بەرەو ئیسرائیل، سەرەڕای سەرهەلّدانی سستمێکی تازە لەولآتی (تونس) دا کە بڕیاری ڕاگرتنی کۆچیدا لە ولآتەکەیدا، ژمارەی کۆچکەران لەم (٢) ساڵەداو لە ولآتانی عەرەبیو ئەفەریقادا لە (٣٠٪) تێنەدەپەڕی.

پێنجەم: ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٤).

کۆچکردن لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا ڕووی لە زیادبوونی بەرچاوکرد ئەویش بەهۆکاری چاك بوونی بواری ئابوری ئیسرائیلەوە بوو، بەجۆرێ (٥٤٪) ی ڕێژەی کۆچکەران لە وڵاتانی ئاسیاو ئەفەریقاو جیهانی عەرەبیەوە بەرەو ئیسرائیل بەڕێ کەوتن.

شەشەم: ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٥-١٩٧٣).

بەهۆی دروستبوونەوەی قەیرانی ئابووری لەناو حوکمەتی ئیسرائیلدا ڕێژەی کۆچکەران ڕووی لە دابەزین کردەوەو بەجۆرێك لە ماوەی ئەم (٨) ساڵەدا تەنها (٥٤) هەزار جولەکە بەشداری کۆچیان کرد، کە لەناویاندا جولەکەکانی ڕۆژهەڵات لە (٦٩٪) یانی پێك دەهێنا.

## ناوەندە سەرەکیەکانی نیشتەجێبوونی کوردە جولەکەکان لە ئیسرائیل

بێگومان ئەو کوردە کۆچکەرانەی کە لەدوای ساڵی (١٩٤٨) ەوە لەناوچە کوردنشینەکانەوە بەرەو (ئیسرائیل) بەڕێکەوتن، لە چەند جێگەو جێ نشینگە (مستوطن) دا جێگیر کراون کە بریتین لەمانە:

١- (الرآی): لەم ناوەندە لەساڵی (١٩٣٥) ەوە جولەکە کۆچکردووەکانی وڵاتی کوردستان دروستیان کرد، کە ئەویش دەکەوێتە ناوچەی (یزراعیل) ەوە لەناوچەی (شێخ بریك) ژمارەی ئەو کوردە جولەکانەی کە لەم جێگەیەدا نیشتەجێ بوون بە پێی سەرژمێری ساڵی (١٩٦٥) بریتی بوون لە (٥٦١) کەس.

٢- کفار بروحام: ئەم جێ نشینگەیە (مستوطن) ە پێی دەوترێت (قل رحمه) و لە ساڵی (١٩٥١) دا دروست کراوە، لە ساڵی (١٩٦١) دا سەرژمێری دانیشتوانەکەی خۆیدا لە (١٣٠٠) کەس، لە ساڵی (١٩٦٥) دا ئەو ژمارەیە زیادی کردووە گەیشتە (٤٥٠٠) کەس.

٣- ناوەندی (مضطاحم): ئەم شوێنەش لە ساڵی (١٩٥١) ەوە بۆ کۆچکەرە جولەکە کوردەکانی کوردستان دروستکراوە.

ئەم شوێنەش دەکەوێتە ناوچەی (بئر السبع) ەوە لە (نقیب) ی خۆرئاوا، ڕۆژهەڵاتی (ڕەفەح) کە دەکەوێتە نزیکی کەرتی غەزەوە.

٤- ناوەندی نسهاریم: لە ساڵی (١٩٥٠) دا دروستکراو زۆربەی دانیشتوانەکەی لەو جولەکانەن کە لەوڵاتی کوردستانەوە ڕوویان تێکرد، ئەم شوێنەش نزیکە لەشارۆچکەی (دیر الهوا) لە ناوچەی (قدس) ی پایتەخدا.

٥- نعوز زیوت کاستەل: ناوەندێکی نزیکە لە شاری (قدس) ەوە ئەمەش یەکێکە لەو جێگە سەرەکیانەی کە کوردەکانی تێدا جێگیر بوون، لەگەڵ ئەمەشدا زۆرێك لە کوردەکان لەچەند شوێنێکی تری خاکی فەلەستیندا جێگیر بوون وەك ناوچەکانی (کاتامۆنیمو کاستیل).بەڵێ بەم جۆرەو لە (١١٥) وڵاتی جۆراوجۆری جیهانەوە جولەکە بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کردوو بە(٨٥) زمانی جیاواز قسەدەکەن[١].

---

١- جولەکەکانی کوردستان: أحمد باوەڕ.

# بەندی حەوتەم

## تیشکێك لەسەر ژیانی جولەکە لەسەردەمی خۆشەویست ﷺ و شاری مەدینەدا

یەکێکی تر لەو گۆشە نیگایانەی کە زۆر پێویستە تیشکی بخەینە سەر و، هەڵوێستەی لەسەر بکەین، بریتیە لە: ((بوونی جولەکە لەسەردەمی خۆشەویست)) بەتایبەت لەدوای کۆچی پێغەمبەر و هاوەڵانەوە بۆ مەدینە..

بێگومان ئەم باسەش هەروا کارێکی سادە و سانانیە، هەتا بە خێرایی گوزەری کردبێت و شوێن دەستی لەو مێژووەدا و لەناو شاری مەدینەدا بەجێ نەهێشتبێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە، باسکردن لەژیانی واقعی و فەرهەنگی و سیاسی و دینی و تەواوی بوارەکانی تری (جولەکە) لەشاری مەدینە، پانتاییەکی فراوانی لەمێژوو و پاشان قورئانی پیرۆز و ژیانی خۆشەویست و باوەڕداراندا گرتۆتەوە و، ناکرێت فەرامۆشی بکەین، ئەویش بە تیشك خستنە سەر ئەم پۆلە باسە:

### باسی یەکەم/ (واقعی دینی و سیاسی و دەستەڵات و هێز و ئایدیا بەرچاوەکانی مەدینە لەساتی گەیشتنی خۆشەویست و هاوەڵان بۆ شاری مەدینە)

((کاتێك پێغەمبەر و هاوەڵان تەشریفیان گەیشتە شاری مەدینە ڕووبەڕووی سێ جۆر لە خەڵك بوونەوە، کە بێگومان هەریەکەیان جیاوازی گەورەیان هەبوو لەگەڵ ئەوی تریاندا، ئەوانیش بریتیبوون لە :

١) مرۆڤە دیندار و خواناسەکان، کە پێشتر و لەڕێگەی بانگ خوازەکانەوە باوەڕیان هێنابوو، هەروەك ئەوەی کەدەوترا : پێش کۆچی پێغەمبەر و هاوەڵان ماڵێك نەمابوو کە باوەڕدارێکی تیدا نەبێت و ئاشنا نەبووبێت بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

٢) ئەو موشریکانەی کە هێشتا باوەڕیان نەهێنابوو، بێگومان ئەمانە تیرە و هۆزەکانی ناو شاری مەدینە بوون.

٣) جولەکەکان، بەشێکی تر و پێکهاتەیەکی تری بەرچاوی ناوشاری مەدینەبوون، کە ئەوەی ئێمە مەبەستمانە قسەی لەسەر بکەین ئەم بەشەیانە بەتایبەتی ئەویش بەم شێوەیە:

((جولەکەکان: لەسەردەمانی دەستەڵاتی ئاشوری و ڕۆمانیەکاندا، جۆرێك لە زەلیلبوون و ئاوارە بوون و پەرتەوازەییان تێکەوت، هەندێکیان بەرەو وولاتانی حیجاز بەڕێکەوتن و، پاش مانەوە ڕەگ داکوتانیان تێکەڵ بە دابونەریت و عاداتی عەرەب بوون و، ژن و ژن خوازی و مامەڵەی ئابوریش هێندەی تر کاریگەری لەسەر ڕەگ داکوتانیان هەبوو لە مەدینە و جەزیرەی عەرەبی بەشێوەیەکی گشتی..

جولەکەکان وەك عادەتی بەردەوام و هەمیشەیی خۆیان، لەگەڵ ئەو تێکەڵ بوونە زۆرەیاندا، بەڵام بەرگریان لە دین و ڕەگەزی جولەکە بونی خۆیان دەکردوو دەرمارگیرانە مامەڵەیان لەگەڵ بەرامبەرەکانیاندا دەکرد و، شانازیان بە ئیسرائیلی بوونی خۆیانەوە دەکرد.

جولەکەکان بەچاوی سوکەوە تەماشای غەیری خۆیان دەکرد و، عەرەبەکان بەتایبەتی، تا ئەو ئەندازەیەی کە بە (أمي) نەخوێندەوار ناو زەندیان دەکردن! کە ئەم دەستەواژەیە لە فەرهەنگ و مەبەستی ئەوانی جولەکەدا بەمانای (گەمژەیی و وەحشیگەری و دواکەوتوویی) دەهات.

قورئان شاهیدی لەسەر ئەم سیفەتە گلاوەیان دەدات و دەفەرموێت:

﴿قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ﴾ آل عمران: ٧٥. واتە: جولەکە دەیانوت: ئێمە بە نیسبەت نەخوێندەوارەکانەوە (موسڵمان) هیچ پابەندبونێکمان نیە و، هەرچیەکمان بوێت ئەنجامی دەدەین لەبەرامبەریاندا.

جولەکەکان لەشێوازی کاسپی و پارەپەیدا کردن و هۆکارەکانی دەوڵەمەندبوندا، زۆر شارەزاو لێزان بوون. بازرگانی دانەوێڵە و خورما و شەراب و

کالاّیان بەدەستەوەبوو، جگە لەمانەش کاری تریشیان دەکرد، قازانجی دوو ئەوەندەیان لە بەشێکی زۆری عەرەب وەردەگرت و بەوەشەوە نەدەوەستان بەڵکو سوخۆریشیان دەکرد و پارەیان بەقەرز دەدا بە خەڵك و لەئەنجامدا زیادەیان لێ دەسەندەوە.. ئەو دووکان و بازاڕانەی کە جلوبەرگ و قەڵغانی سەربازیان دروست دەکرد زۆربەیان بەدەستی ئەمانەوەبوون، بەشێکی تریان خەریکی زەرەنگەری بوون و لەم بوارەشدا پارەی زۆریان دەهاتە دەستەوە.

جولەکەکان وەك سیفەتی هەمیشەییان، هەر خەریکی کاری ژێر بەژێری و پیلان و هەڵگیرساندنی فیتنە و شەڕ و ئاشوب بوون، لەنێوان تیرە و خێڵ و عەشرەتە عەرەبەکاندا. هانی هەندێکیان دەدا لە دژی ئەویتریان و سەرەنجام دەیاندان بەیەکتردا و، خوێنی بەناهەقی سەدانیان لەنێوانەدا بەفیڕۆ دەڕژا و، خۆشیان لەدورەوە سەیریان دەکردن و پێکەنینان بەحاڵیان دەهات!!.

جولەکەکان بۆ مەبەستی بەدەست کەوتنی تەواوی بەرژەوەندیەکانی خۆیان، پارەی (سو) (الربا) یان دەدا بە هەر خێڵێك لە خێڵە عەرەبەکان، کە بەردەوامی بە جەنگی نێوانیان بدایە، ئەمەش لەبەر بەهێزکردنی لایەنی ماددی خۆیان و، پاشان پارێزگاری کردن لە قەوارەی جولەکەبونی خۆیان.

لەناو شاری (یثرب) (مدینة) دا سێ هۆزی جولەکەی بەناوبانگ هەبوون، ئەوانیش بریتیبوون لە :

١. هۆزی بەنو قەینوقاع: ئەم هۆزە هاوپەیمانی (خەزرەج)یەکان بوون و نیشتەجێی ناو شاری مەدینە بوون.

٢. هۆزی بەنو نضیر.

٣. هۆزی بەنو قریظة.

ئەم دوو هۆزەی تریان هاوپەیمانێتیان لەگەڵ (ئەوس)یەکاندا هەبوو، ماڵ و جێگە و شوێنی نیشتەجێبونیان دەکەوتنە قەراغ شاری مەدینەوە. هەرئەمان بوون کە لە دێر زەمانەوە شەڕی خوێناوی نێوان (ئەوس و خەزرەجیان) هەڵدەگیرساند و بەنزینیان پێدادەکرد.

هاتنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان بۆشاری مەدینە، لەڕوانگەی بیری گەندەڵ و دوژمنکارانەی جولەکەوە، یەکێك بوو لە کارەساتە جەرگ بڕەکانیان چونکە:

١) پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەتەوەی (عەرەب) بوو، لەنەوەی (إسرائیل) نەبوو، کە بێگومان ئەمە بەلای جولەکەوە هەرگیز جێگەی قبوڵ نەبوو، چونکە ئەوان لە زۆربەی کاتەکاندا و لەسەردەمانی خۆیاندا زۆرترین پێغەمبەریان شەهیدکرد، کە لە خودی خۆیان (بەنی إسرائیلی)بوو، ئێستە و لەم کاتەدا چۆن دژایەتی و دوژمنایەتی پێغەمبەرێك ناکەن کە (پێغەمبەرە و پاشان لە نەتەوەی عەرەبە و بەنی إسرائیلی نیە؟!!.

٢) هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆناو شاری مەدینە، جڵەوی دەستەڵاتەکان و پێگە گرنگەکانی شاری مەدینە لە دەست (جولەکە و مشریك و بێ باوەڕەکان) بەشێوەیەکی گشتی دەرکردن و، بەشێوەیەکی واقعی و بەبێ ڕکابەر کەوتنە دەستی موسڵمانانەوە.. کە بێگومان ئەمەش لەڕووی واقعی سیاسی و پێگەی جەماوەریەوە لەبەرژەوەندی جولەکەکاندا نەبوو، هەر لەبەر ئەمەبوو کە ئەم واقیعەیان پێ قبوڵ نەکرا و، هەموو کات لە سەرنگەردابوون بۆ وەشاندنی خەنجەری ژەهراوی لە پشتی باوەڕداران و، لەباربردنی ئەو دەوڵەتە مەدەنیەی کە مافی هەموو دین و کەمایەتیەکانی تێدا بەرقەرار کرابوو لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٣) یەکێك لە کارە گرنگ و هەنگاوە سەرەتاییەکانی خۆشەویست، بە گەیشتنی بۆناو شاری مەدینە بریتیبوو لە: کوژاندنەوەی شەڕی سەد ساڵەی ئەوس و خەزرەج و پاشان بە براکردنی یاریدەدەران و کۆچکەران (الأنصار و المهاجرين).

جولەکەکان ئەم حاڵەتەیان بەزیانی گەورە زانی لەسەر پێگەی دەستەڵاتی خۆیان، چونکە پێشتر جولەکەکان سودمەندی هەرە گەورەی مەدینە بوون، لەڕووی پارەدان بەسوو پاشان بازرگانی کردن لەنێوان هۆزە عەرەبەکاندا، ئێستا و لەم کاتەدا هەموو ئەم بەرژەوەندیانەیان لەدەست دەچێت و تەنها دەمێننەوە. کەئەمەش بێگومان لەسەرەنجامدا لەزیانی ئەوانە.

جولەکەکان هەموو لەم لێکدانانەوەیان بۆ خۆیان کردبوو، هەر لەو کاتەوە دەیانزانی کە ئیسلام دەیەوێت ئارامی لەناو شاری (یثرب) دا بەرقەرار بکات، لەبەر ئەوە دژایەتی و ڕق و کینەیەکی زۆر و بێ ئەندازەیان لەدڵدا هەڵگرتبوو بۆ ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ.

پێشەوا (بخاري) فەرموودەیەك باسدەکات، سەبارەت بە موسڵمان بوونی یەکێك لە پیاوە ناودار و زاناکانی جولەکە بەناوی (عبدالله ی کوڕی سلام) و دەڵێت:

ئەم پیاوە یەکێك بوو لە زانا و بلیمەتەکانی جولەکە، کاتێك کەلە (بەنی نجار) بیستبوی بە تەشریف هێنانی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، بەخێرایی خۆی گەیاندە لای خۆشەویست و چەند پرسیارێکی لێکرد، کە جگە لە پێغەمبەر هیچ کەس تواناى وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی نەبوو.

کاتێك (عبدالله ی کوڕی سلام) وەڵامی پرسیارەکانی بیست، دەست بەجێ باوەڕی بە پێغەمبەر ﷺ هێنا.

دواتر (عبدالله) بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جولەکە گەلێکی بوختان کەرن، ئەگەر بزانن موسڵمان بووم پێش ئەوەی تۆ پرسیاریان لێبکەیت، ئەوا لای جەنابت بوختانم بەدەمەوە هەڵدەبەستن، هەر لەبەر ئەمەبوو کە پێغەمبەر ﷺ ناردی بەشوێن جولەکەکاندا و هاتن. ئەوجا (عبدالله ی کوڕی سلام) هاتە ژوورەوە و، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی کردە جولەکەکان و پرسیاری (عبدالله)ی لێکردن کە لەناویاندا پیاوێکی چۆنە؟!!

جولەکەکان وتیان: زاناترین کەسی ئێمەیە و کوڕی زاناترینمانە، باشترینمانە و کوڕی باشترینمانە، گەورەمانە و کوڕی گەورەمانە، ڕێزدارترینمانە و کوڕی ڕێزدارترینمانە!!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەگەر زانیتان کە موسڵمان بووە؟!!

وتیان: پەنا دەگرین بەخوا لەشتی وەها (دووجار تا سێ جار ئەمەیان وتەوە) پاشان (عبدالله ی کوڕی سلام) هاتەدەرەوە و وتی: (أشهدُ ألا إله إلّا الله و أشهد

انَّ محمَّداً رسول الله) هەموویان وتیان: خراپترینمانە و کوڕی خراپترینمانە، دەستیان کرد بە جوێن پێدانی..

ئەوجا (عبدالله) پێ وتن: ئەی خێڵی جولەکە لەخوا بترسن، سوێند بەو خودایەی کە جگە لەو کەسی تر خودا نیە، ئێوە دەزانن کە ئەو پیاوە پێغەمبەری خودایە، بەڕاستی هاتووە، بەڵام جولەکەکان لەوەڵامدا پێیان وت: تۆ درۆ دەکەیت؟!))[1]

بێگومان ئەمە یەکەم ئەزمون بوو، کەلەیەکەم ڕۆژی چونە مەدینەوە پێغەمبەر ﷺ لەجولەکەی وەرگرت)).[2]

## باسی دووەم/ بەستنی پەیمان نامە لەگەڵ جولەکەکاندا (معاهده مع اليهود)

دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەدا کارە گرنگ و گەورەکانی ئەنجام دا و، دەوڵەتی چەسپاند و بناغەکانی کۆمەڵگای نوێی بنیاد نا، کەبریتیبوو لە دامەزراندنی یەکێتیەکی عەقیدەیی و سیاسی و نیزامی، لەنێوان موسڵمانەکاندا و کوژاندنەوەی شەڕی ناوخۆی هۆزە عەرەبە نەیارەکان. پێی وابوو کە دەبێت هەڵبسێت بە ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ نا موسڵمانەکانیشدا، لەو بوارەشدا خەمێکی هەبوو، کە بریتیبوو لە دابینکردنی ئاسایش و ئاشتی و ئاسودەی و خێر و چاکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی..

لەگەڵ یەکخستنی ناوچەکە لەیەك پەیمان نامەدا، نزیکترین کەسانێك لەو جۆرە کە دراوسێی مەدینە بوون لەناموسڵمانەکان، بریتی بوون لە جولەکە، ـ هەروەك لەسەرەتادا باسمان کرد ـ ئەمانە هەرچەندە کەلەناخ و دڵەوە دژایەتی

---

[1] صحيح البخاري/ ج(١) /٤٩٥.

[2] الرحيق المختوم (صفى الرحمن المبارك فورى).

موسلمانانیان دەکرد، بەلام بیانویەکیان نەبوو بۆ دەرخستنی ناخ و دژایەتیەکانیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن و پەیماننامەیەکی لەگەلدا مۆرکردن، کە تەواوی ماف و ئازادییەکانی پێدان لەڕووی ژیان و دینداری و مامەلە و ... هتد. لەبەرامبەردا پێغەمبەر ﷺ، بەهیچ جۆرێك پەنای نەبردە بەر سیاسەتی: دورخستنەوە و دژایەتی کردن و وەلانان و دەست بەسەردا گرتن و سڕینەوەیان لەواقعدا. ئەم پەیمان نامەیە وەك بەشێك لەوە پەیمان نامەیە هاتە گۆڕێ کە لەنێوان موسلمانانیدا بەسترا، ئەمەش گرنگترین بەندەکانی ئەو پەیمان نامەیە بوو.

**بەندەکانی پەیمان نامەکە، ئەمانە بوون:**

**١) (إن اليهود بني عوف امة مع المؤمنين، لليهود دينهم و للمسلمين دينهم مواليهم و انفسهم، كذلك لغير بني عوف من اليهود)**

واتە: جولەکەکانی بەنی عەوف ئومەتێکن لەگەلّ باوەڕداراندا، جولەکە ئاینی خۆیان هەیە و موسلمانەکانیش ئاینی خۆیان، غەیری خێلّی بەنی عەوفیش هەمان حالەتیان هەیە.

**١- (اليهود يتفقون مع اليهود ماداموا محاربين)**[1]

واتە: جولەکە بۆیان هەیە خۆیان یارمەتی یەکتر بدەن گەر لەجەنگدا بوون.

**٢- (وان النصر للمظلوم)**[2]

واتە: سەرخستن و یارمەتیدان بۆ ستەم لێکراوە و سەردەخرێت.

**٣- (إن على اليهود نفقتهم و على المسلمين نفقتهم و إن بينهم النصر على من حارب اهل هذه الصحيفة).**

---

[1] فقه السيرة/ محمد سعيد رمضان البوطي/ و: شيخ محمد سميع/ لا (٢٢٦) .

[2] روضة الأنوار في سيرة النبي المختار (حقي الرحمن المبارك فوري) ص(١٥٦)

واته: جولەکە خەرجی خۆیان لەسەر خۆیانە و، موسڵمانانیش خەرجی خۆیان لەسەر خۆیانە. وە لەنێوان هەردوولادا یارمەتی هەبێت، لەدژی هەر کەسێ کە بجەنگێ لەگەڵ ئەوانەی کەوان لەم پەیمان نامەیەدا.

٤- (وإن بينهم النصح و النصيحة و البر دون الأثم).

واتە: لەنێوان یەکتریدا ئامۆژگاری و چاکەکردن هەیە، بەبێ هیچ جۆرە خراپەیەك.

٥- (وإن اليهود يتفقون مع المؤمنين ماداموا محاربين)

٦- واتە: جولەکە لەگەڵ باوەڕداراندا یەکدەنگ و هەماهەنگ دەبن، چەندە جەنگیان لەگەڵ بکرێت.

٧- (وإنه لا يحول هذا الكتاب دون ظالم أو اثم)[1]

واتە: ئەم پەیمان نامەیە چاوپۆشی ناکات لەزاڵم و تاوانبار.

٨- (وإنه من كان بين أهل هذه الصحيفة من حدث أو استجار يخاف فساده فإنه مرده إلى الله عزوجل وإلى رسول الله ﷺ)

واتە: هەرچیەك ڕوبدات لەنێوان مۆرکەرانی ئەم پەیمان نامەیەدا لەشەڕ و دەمەقاڵێ، کە ترسی لێکەوتنەوە و پەیدابونی خراپەی لێبکرێت، ئەوا ڕووبەڕووی پەراوی خوای گەورە و پێغەمبەری خوا دەکرێتەوە بۆ چارەسەرکردنی.

٩- (وإنه لا تجارُ قريش ولا من نصرها)

واتە: هیچ قورەیشیەك و هاوپەیمانەکانیان نابێت لە مەدینە پەنا بدرێن و سەربخرێن.

١٠- (من خرج من المدينة أمن و من قعد أمن، إلا من ظلم أو آثم)

---

[1] إبن هشام ج (١) ص، (٥٠٣، ٥٠٤).

واتە: هەرکەس لە ئەهلی ئەم پەڕاوی پەیمان نامەیە لەمەدینە دەردەچێت، یان لەمەدینە دادەنیشێت، ئەوە لەئەماندایە مەگەر کەسێك ستەم یان تاوان ئەنجام بدات.

١١-(إن الله على أصدق ما في الصحيفة و أبره، و إن الله جار لمن بر و اتقى)

واتە: خوای گەورە لەگەڵ ڕاستگۆترین کەسانی ناو ئەم پەیمان نامەیە و چاکترینیانە، خودا پشت و پەنای کەسێکە چاکەکار و خۆپارێز بێت.

بە بەستنی ئەم پەیمان نامەیە لەگەڵ جولەکەکاندا، مەدینە بووە دەوڵەتێکی فرە ڕەنگ و یەکگرتوو و، تەواوی ماف و ئازادیەکانی مرۆڤەکانی تێدا بەپێی دەستور و پەیمان نامە و نوسراو تێدا دەستە بەرکراو، پێغەمبەریش ﷺ بوو بەسەرۆك و سەرکردەی یەکەم و بێ ڕکابەر. بڕیاری یەکلایی و دەستەلاتی بالادەست تیایدا کەوتە دەست موسڵمانەکان و بەو شێوەیە مەدینە بووە پایتەختی ڕاستەقینەی ئیسلام.

## باسی سێیەم/ دەست پێکردنی یەکەم خیانەتی جولەکە لەشاری مەدینە دەرهەق بەموسڵمانان:

پێشتر باسی ناوەڕۆکی ئەو پەیمان نامەیەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ بەستی لەگەڵ جولەکەکاندا، پێغەمبەر و موسڵمانان زۆر سوربوون لەسەر جێبەجێکردنی برگە بە برگەی پەیمان نامەکە. هەر لەبەر ئەمەبوو، کە بەهیچ جۆرێك لەلایەنی ئەمانەوە تەنها خاڵێکیشی لێ پێشێل نەکرا، بەلاّم لایەنی بەرامبەر کە جولەکەکان بوون، خاوەنی مێژوویەکی دوورودرێژ بوون لەپەیمان شکێنی و خوێن ڕێژی و خیانەت و ناپاکی، زۆری پێنەچوو چونەوە سەر حاڵەتە کۆنەکەی خۆیان، کە ئەمە ئەصل و ڕووی ڕاستەقینەیان بوو، دەستیان کرد بە پیلان و فیتنە و شەڕفرۆشتن و

ئاژاوە گێڕی و، تێکدانی ئاسایشی شاری مەدینە و شڵەقاندنی ڕیزەکانی موسڵمانان، ئەویش بەم شێوەیە:

(إبن اسحاق) دەڵێت: (شاس ی کوڕی قەیس) جولەکەیەکی بەتەمەنی شاری مەدینە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بێ باوەڕ و ڕق ئەستور بوو بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان و، حەسودی پێ دەبردن.

جارێکیان بەلای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی خۆشەویستدا تێپەڕی کە لەهەردوو هۆزی (ئەوس) و (خەزرەج) پێکهاتبوون، کاتێك بینی کەوەك برا پێکەوەن و شەڕی ڕابردوویان لەبیرکردووە لەژێر سێبەری ئیسلامدا کۆبونەتەوە، زۆر نارەحەت بوو وتی: ئەوە خێڵی (قیلە) لەم شارەدا پێکەوە دانیشتوون؟!

وەڵڵاهی ئەگەر ئاوابن ئێمە هیچ بڕیارێکمان بۆ جێبەجێ ناکرێت؟!

گەنجێکی بانگ کرد کە جولەکەبوو و پێی وت: بڕۆ بۆلایان و لەگەڵیاندا دابنیشە و باسی ئەو شەڕ و جەنگە ناوخۆییەیان وە بیربهێنەرەوە، کە لەسەردەمی جاهلی پێش موسڵمان بونیاندا دەرهەق بەیەکتر کردویانە. پاشان هەندێك لەو شیعرانەی کە لەو سەردەمەدا وتوویانە لەدژی یەکتری بیخوێنەرەوە!!

گەنجە جولەکەکە چی پێی وترا ئەنجامی دا!! سەرەنجام کاری تێکردن و هەریەك لە (ئەوس) و (خەزرەج) کەوتنە قسە وتن بەیەکتر و شانازی بەخۆوە کردن! تاکار گەیشتە ئەوەی دوو پیاویان دەستە و یەخەی یەکتربوون و، دەستیان کرد بەشەڕە قسە!! پاشان یەکێکیان وتی بەوەی تریان:

ئەگەر حەزتان لێیە شەڕی ئەهلی وەك جاران بەرپا دەکەینەوە لەنێوانماندا، هەردوولا لەیەکتر توڕەبوون و، هەڵسانەوە و بەگژیەکدا چوون و چوونەوە دەرەوە بۆ شەڕ و، خەریك بوو شەڕ هەڵبگیرسێتەوە!!!

ئەم هەواڵە ناخۆشە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ و،لەگەڵ (کۆچکەراندا) چوو بۆلایان و پێی وتن:

((يا معشر المسلمين، الله الله، ابدعوى الجاهلية، و انا بين اظهركم، بعد أن هداكم الله للأسلام و اكرمكم به، وقطع به عنكم امر الجاهلية و استنفذكم به في الكفر و الف بين قلوبكم)؟!..

واته: ئەی گرۆهی موسڵمانان، بۆ خاتری خوا، تازە دەست دەکەنەوە بەقسە و باسی سەردەمی جاهلیەت؟! لەکاتێکدا کە هێشتا من لەناوتاندام؟! دوای ئەوەی کە خوای گەورە ڕێنمایی کردن بۆ ئیسلام و، ڕێزی لێناون و بەئاینی إسلام پەیوەندی جاهیلیە تی بڕی و، لەکوفر ڕزگاری کردن و دڵی هەموتانی کرد بەیەك؟!

دواتر خەڵکەکە بەهۆش خۆیاندا هاتنەوە و، زانیان کە ئەمە دەستی فتنەی شەیتان ڕەفتارەکانی جولەکەیە و چاڵێکە کە بۆیان هەڵکەنراوە.

سەرەنجام دەستیان کردە ملی یەکتر و، بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە پەشیمان بونەوە لەوەی کە پێشتر کردیان لەگەڵ یەکتردا و، ملکەچی فەرمانی پێغەمبەر بوون).[1]

## باسی چوارەم/ (بەنو قەینوقاع) پەیمان دەشکێنن

لەساڵی دووەمی کۆچیدا جەنگی بەدر لەنێوان موسڵمانان و بێ باوەڕانی قورەیشدا بەرپا بوو، کۆتایی جەنگەکە بەسەر کەوتنی موسڵمانان و سەرشۆڕبوونی بێ باوەڕانی قورەیش و، لەناوبردنی ئەبو جهل و سەرانی قورەیش کۆتایی هات.

کاتێك جولەکەکانی (بەنو قەینوقاع) بینینان کە خوای گەورە سەرکەوتنی گەورەی دا بە موسڵمانان لە شەڕی بەدردا و، دەستەڵاتیان پەیداکردوو سام و هەیبەتیان چووە ناو دڵی گەورە و بچوکەوە، ئاستی ڕق و کینەیان زیاتربوو، بەئاشکرا دوژمنایەتی خۆیان بۆ پێغەمبەر و هاوەڵان دەرخست.

---

[1] ابن هشام ج(١) ص (٥٥٥ – ٥٥٦)

لەم پێناوەدا جولەکەکان دەستیان کرد بە زیاتر شەڕ فرۆشتن و ڕق هەڵساندنی هاوەڵان، ئاژاوەیان دروست دەکرد، گاڵتەیان پێدەکردن، تائەو ئەندازەیەی کە شەڕیان بە ژنە موسڵمانەکان لەناو شار و بازاڕی مەدینەدا دەفرۆشت.

دوژمنایەتی و ناخی پڕ لەقین و ڕقیان سات لەدوای سات ئاشکرا دەبوو، هەر لەبەر ئەمەبوو کە پێغەمبەر ﷺ، لەبازاڕی بەنوقەینوقاع کۆی کردنەوە هەروەك (أبوداود) ئەم بەسەرهاتەمان لە (إبن إسحاق)ەوە بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

کە پێغەمبەری خوا لە شەڕی بەدردا سەرکەوت بەسەر قورەیشدا، گەڕایەوە بۆ مەدینە، جولەکەکانی لەبازاڕی (بنوقینوقاع)دا کۆکردەوە و پێی فەرموون:

**(یامعشر الیهود، أسلموا قبل أن یصیبکم مثل ما اصاب قریشاً)**

واتە: ئەی گرۆهی جولەکە: ملکەچ بن و موسڵمان بن، بێ ئەوەی ڕووداوێکی وەك ئەوەی قورەیشتان بەسەردا بێت...

جولەکەکانی (بەنو قەینوقاع) کە گوێبیستی وتەکانی خۆشەویست بوون بە لوت بەرزیەوە وتیان:

(ئەی محمد!! لەخۆت بایی مەبە کەچەند پیاوێکت لە قورەیش کوشتووە، ئەوانە هەرزە و بێ تەجروبە بوون و شەڕیان نەدەزانی، ئەگەر شەڕمان لەگەڵدا بکەیت، ئەوجا دەزانیت کە خەڵکی شەڕکەر ئێمەین، خۆ هەتاوەکو ئێستا شەڕت لەگەڵ خەڵکی وەکو ئێمەدا نەکردووە، دوابەدوای ئەمە خوای مەزن ئایەتی لەسەر قسە پوچەکانیان ناردە خوارەوە و پێی فەرموون:

﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ ۚ وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاءُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُولِي الْأَبْصَارِ ﴿١٣﴾﴾ آل عمران.

واتە: ئەی (محمد) بڵێ بە بێ باوەڕان، کە ژێر دەکەون و حەشر دەکرێن و بەرەو دۆزەخ و خراپترین شوێن دەبرێن، لەو دوو کۆمەڵەدا کە بەیەکتر گەشتن بەڵگە و پەندێکی تەواوی تێدابوو بۆ ئێوە، کۆمەڵێکیان لەپێناوی خودا جەنگی دەکردوو، کۆمەڵێکیشیان کافربوون، بەو ئەندازەیە کۆمەڵێکی تریان بەچاوی خۆیان دەبینی، خوای گەورە ویستی لەسەر بێت پشتیوانی هەر کەسێك دەکات کە بیەوێت، بێگومان ئەمە پەند و ئامۆژگاری تێدایە بۆ بینایان و خاوەن ژیریەکان.

سەرەنجام وەڵامی جولەکەکانی (بەنو قەینوقاع) بۆ ئەم ئایەتانە و ئامۆژگاریەکانی خۆشەویست بریتیبوو لە ڕاگەیاندنی جەنگ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕقی خۆی لەبەرامبەریاندا خواردەوە و، موسڵمانانیش دانیان بەخۆیاندا گرت..

نۆری پێ نەچوو لەناو بازاڕی مەدینەدا جولەکەکانی (بەنوقەینوقاع) ئاژاوە و نائارامیان دروست کردو بەدەستی خۆیان چاڵی مەرگ و ڕیسوا بوونی خۆیان هەڵکەند، ئەویش بەم شێوەیە:

(إبن هشام) لە (ئەبی عەون)ەوە دەگێڕێتەوە کە:

(جارێکیان ژنە عەرەبێك شمەکی هێنا لەبازاڕی (بەنوقەینوقاع) فرۆشتی، لای کابرایەکی زەرەنگەر دانیشت. چەند جولەکەیەکی بەدکار داوای ئەوەیان لێ کرد کە دەم و چاو و ڕوخساری خۆیان نیشان بدات، ئەویش ڕازی نەبوو.. کابرای زەرەنگەر بەشێوەیەکی نهێنی کە ئافرەتەکە ئاگای لێ نەبوو، چمکی کراسەکەی بەستەوە بەپشتیەوە!!

کاتێك ئافرەتەکە هەڵسایە سەرپێ ڕوخسار و عەورەتی بەدەرکەوت بۆ ئەو جولەکە بەدڕەوشتانەی کە لەوێدابوون، جولەکەکان کەوتنە گاڵتە و پێکەنین پێی!!

ژنەکەش لەتاو نارەحەت بوون و سوکایەتی پێ کردنی هاواری لێ هەڵسا... لەم کاتەدا پیاوێکی موسڵمان ئاگاداری ئەم هاوارەی ژنەکەبوو، هاتە مەیدان بۆ کابرای زەرەنگەر و سەرەنجام کوشتی..

جولەکەکانی تر کە لەوێدا بوون هەڵیان کوتایە سەر پیاوە موسڵمانەکە و لەئەنجامدا شەهیدیان کرد، دوای بڵاوبونەوەی ئەم هەواڵ و پەیمان شکێنیە کەس و کاری پیاوە موسڵمانەکە هانایان بۆ موسڵمانان هێنا و، شەڕ دەستی پێکرد لەنێوان ئەمان و جولەکە ناپاکە خیانەتکارەکانی (بەنی قەینوقاعدا):[1]

ئەمە بووە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی پەیمان نامەی نێوان موسڵمانان و جولەکەکانی بەنو قەینوقاع، بێگومان ئەم ڕووداوە لەنیوەی شەوالی ساڵی دووەمی کۆچیدا ڕوویدا).[2]

## باسی پێنجەم/ ئابلۆقەدان و خۆبەدەستەوەدان و سەرشۆڕبوون و دەرکردن

پێغەمبەری خوا ﷺ بە بیستنی ئەم هەواڵ و ناپاکیەی جولەکەکان، بەتەواوی بێ تاقەت بوو و ئارامی لێبڕا. کەسێکی بەناوی (لیابە)ی کوڕی (عبد المنذر)ی بەسەر مەدینەوە دانا و، ئاڵای موسڵمانانی دا بەدەست (حمز)ەی مامیەوە و، سەربازان ڕێکخران و بەرەو تەمێ کردنی جولەکە ناپاکەکانی (بەنوقەینوقاع) بەڕێکەوتن. کاتێك کە بینیان سوپای موسڵمانان بەرەو ئەوان هەنگاو دەنێت، ترسان و ڕایان کردە ناو قەڵاکانیانەوە، موسڵمانان زۆر بە توندی ئابلۆقەی قەڵاکانیان دان، ئابلۆقەکە ماوەی (١٥) ڕۆژی خایاند، تا شەوی یەکەمی مانگی (ذي القعدة) ترسێکی زۆر کەوتە دڵیانەوە...

سەرەنجام بەمل شۆڕی و زەلیلی ملکەچی فەرمانی پێغەمبەر بوون و لە قەڵاکانیان هاتنە خوارەوە و فەرمان درا بەباڵبەستکردنیان... لەم کاتە هەستیارەدا گەورەی دووڕووان (عبدالله ی کوڕی سەلول) هەڵسا بەدەوری دوڕووانە و زەرەرمەندانەی خۆی، بەوەی کە: زۆر لالآیەوە لە پێغەمبەر ﷺ کەچاوپۆشیان

---

[1] سیره إبن هشام / ج(٢) ص(٤٧ – ٤٨).

[2] تأريخ الگبری/ ج(٢) ص(٤٨٠).

لێبکات و وتی: ئەی (محمد) داوات لێدەکەم کە چاك بە لەگەڵ هاوپەیمانەکانم (بەنوقەینوقاع)!! پێغەمبەر ﷺ لەگەڵی گەرم و گوڕ نەبوو ڕووی نەدایە و (عبدالله)ی سەرۆکی دووڕوان زۆر جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕووی تێبکات و داواکاریەککەی جێبەجێ بکات، لەدوا جاردا (عبدالله) دەستی گرت بەئەڵقەی قەڵغانەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ پێغەمبەری خوا فەرمووی: بەرم بدە، توڕەبوو تا ئەو ئەندازەیەی کە ڕوخساری پیرۆزی ڕەش هەڵگەڕا پاشان فەرمووی:

دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات بەرم بدە، بەڵام (عبدالله ی کوڕی ئەبویەی کوڕی سەلول) هەر سور بوو...

هەر بۆیە وتی: وەڵلا بەرت نادەم هەتا چاك نەبیت لەگەڵ دۆستەکانمدا!! ئەمانە (واتە جولەکەکانی بەنو قەینوقاع) بەهەموو توانایانەوە منیان پاراستوە لە جەنگی سور و ڕەش، تۆش ئەتەوێت لەبەرە بەیانێکدا دروێنەیان بکەیت؟! سوێند بەخوا من دەترسم کەتۆ ئەی (محمد) شتێکت بەسەربێت!!.

ئەم پیاوە دووڕووە هێشتا مانگێك بەسەر موسڵمان بونی بەڕوکەشیدا تێنەپەڕی بوو، پێغەمبەر ﷺ دڵی ڕاگیر کرد و پێی فەرموو:

ئەوان بۆ تۆ، پاشان فەرمانی کرد بەوەی کە شاری مەدینە بەجێبهێڵن و لەنزیکی مەدینەش نیشتەجێ نەبن..

ئەوجا بەسەر شۆڕی بنەو بارگەیان پێچایەوە و بەرێکەوتن بۆ (ئەزروعاتی)شام، زۆربەیان لەوێ فەوتان و لەناوچوون...

ئەمەش سەرەنجامی فێڵ و بەدکاری و لوت بەرزی و وابەستە نەبوونیان بوو بەو پەیمانەی کە لەگەڵ پێغەمبەر و موسڵمانان‌اندا بەستیان...

## باسی شەشەم/ خیانەت و پەیمان شکێنی جولەکەکانی (بەنی نضیر)

جولەکەکان داخ و قینی زۆریان لەدڵدا بوو بەرامبەر بەپێغەمبەر و موسڵمانان بەتایبەت دوای دەکردن و ڕیسوا کردنی هۆزی (بەنوقەینوقاع) جولەکەی هاودینیان، جولەکەکان لە فرسەتێك دەگەڕان ڕقی پەنگ خواردۆوەی ناخی نەخۆش و پیسی خۆیان بەموسڵمانان بڕژن، بەڵام نەیاندەوێرا و زاتی ئەم دوژمنکاریەیان نەدەکرد، هەتا شەڕی (ئوحد) ڕوویدا لەسێی کۆچیدا..

دوای ئەوەی بێ باوەڕان لەو جەنگەدا زەبری کوشندەیان لە موسڵمانان دا و پۆلێك هاوەڵی ئازا و بەجەرگ و ناوداری وەك حەمزە و نمونەی ئەویان شەهید کرد، جولەکەکان زۆر خۆشحاڵ بوون بەم ئەنجامە و ئاهێکیان بەبەرداهات و دەرگایەکیان بۆ خرایە سەرپشت هەتاوەکو لێوەی دژایەتی موسڵمانانی لێوە بکەن، لەمانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچیدا، واتە تەنها یەك ساڵ دوای ڕووداوی جەنگی ئوحد ڕوداوێکی پڕ لە خیانەت و ترسنۆکانە و پەیمان شکاندن لەلایەن جولەکەکانی (بەنی نەضیرەوە) ڕوویدا دەرهەق بەزاتی مەزنی پێغەمبەر ﷺ ئەویش بەم شێوەیە:

کەسێك بەناوی (عەمری کوڕی ئومەیەی ضومەیری) دووکەس بەهەڵە دەکوژێت، لەکاتێکدا کە لەنێوان تیرەی ئەو دوو کەسە کوژراوە و جولەکەکانی بەنی نەضیردا پەیمان هەبوو...

دوای ئەم ڕووداوە پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی شەممەدا لەماڵ دەرچوو و پاشان لەمزگەوتی (قوبا) نوێژی کرد، چەند کەسێکی لە هاوەڵان لەگەڵدا بوو، پاشان چونە لای جولەکەکانی بەنو نەضیر و داوای ئەوەی لێکردن کە یارمەتی بدەن بۆ خوێنی ئەو دوو پیاوەی کە (عەمری کوڕی ئومەیە) بەهەڵە کوشتونی، بێگومان ئەمەش دەبوو بە ئەرك لەسەر جولەکەکانی بەنو نەضیر کەلەبەرامبەر خوێنی ئەو دوو کەسەدا دەبوو پارە بدەن، بەپێی بەندەکانی ڕێکەوتن نامەکە، جولەکەکان وتیان:

باشه (أبو القاسم) کەمەبەست پێی پێغەمبەری خودا بوو ﷺ، لێرەدا دابنیشە تا ئەم کارەت بۆ جێبەجێ دەکەین..

لەم کاتەدا کە پێغەمبەر بۆ کوژاندنەوەی شەڕ و نەڕشتنی خوێنی کەسی تر چووەتە لایان تا ئاگری فتنە بکوژێنێتەوە، ئەوان سەریان کرد بەیەکتردا و دەستیان کرد بەدانانی پیلان و هەوڵی نامەردانەی خۆیان و گەڕانەوە بۆ سەر ئەصڵ و بناغەی ڕاستەقینەی خۆیان کە بریتی بوو لە تاوان کاری و پەیمان شکێنی و پێغەمبەر کوشتن!! (عەمری کوڕی جەحاشی نەضەری) کە جولەکەیەکی قین لەدڵ و ئامادەی ئەو شوێنە بوو، بە جولەکەکانی وت: (من دەچمە ئەو سەربانە کە (محمد) لە ژێر سێبەرەکەیدا دانیشتووە و لەوێوە بەردێکی گەورە هەڵدەگرم و دەیخەمە خوارەوە بەسەریدا..

لەم کاتە هەستیارەدا خوای مەزن لەڕێگەی جوبرەئیلەوە خۆشەویستەکەی خۆی ئاگادار کردەوە لە فێڵ و تەڵەکەی جولەکەکانی بەنو نەضیر، دوا بەدوای ئەمە پێغەمبەر ﷺ لەجێگەکەی خۆی هەڵسا و ئەوانی بەجێهێشت و بەرەو مەدینە گەڕایەوە لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانیدا..

لەڕێگەدا هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا هۆکاری ئەم گەڕانەوە و بەجێهێشتنە چی بوو؟! ئەویش لە وەڵامدا هەواڵی نیازە خراپەکەی جولەکەی بەنی نەضیری پێدان.

زۆری پێنەچوو پێغەمبەری خوا کەسێکی بەناوی (محمد)ی کوڕی (مسلمە) نارد بۆ لای بەنی نەضیر و پێی وتن: لە مەدینە بڕۆنە دەرەوە و دراوسێیەتیم مەکەن، بۆئەم مەبەستە تەنها (١٠) ڕۆژ مۆڵەتتان هەیە و دوای ئەو ماوە دیاری کراوە هەر کەستان بەدیبکرێت لەگەردنی دەدرێت..

جولەکە خائن و پەیمان شکێنەکانی بەنو نەضیر بەگوێبیستی ئەم پەیامە ئاشکرایەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەیەکیان بۆ نەمایەوە لە غەیری دەچوون و بارکردن، خۆیان ئامادە کرد بۆ ڕۆیشتن بەڵام جارێکی تر دوژمنی خوا و پێغەمبەر و

موسڵمانان سەرۆکی دوو ڕووان (عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) ژەهری خۆی ڕشتەوە و هەواڵی نارد بۆ جولەکەکانی بەنی نەضیر و پێی وتن:

لەماڵی خۆتان بمێننەوە و لەناو قەڵاکانتاندا خۆتان توند بکەن، خۆم و تەواوی کەس و کار و بەدەر لەمانەش دوو هەزار کەسم لەگەڵدایە دێین بۆ یارمەتیدانتان و پشتگیریتان لێ دەکەین و لەپێناو ئێوەدا خۆمان بەخت دەکەین.

﴿لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١١﴾﴾ الحشر.

واتە: ئەگەر ئێوە دەربەدەرکران ئێمەش لەگەڵتان دەردەچین و هەرگیز بەقسەی کەس ناکەین، خۆئەگەر جەنگتان لەدژ بکرێت ئێمە پشتیوانیتان لێدەکەین، لەکاتێکدا کە خوای گەورە خۆی شاهیدە لەسەر ئەوەی کە ئەوانە ڕاست ناکەن و درۆ دەکەن...).

جولەکەکان ئاهێکیان هاتەوە بەردا و بڕیاریاندا لەسەر ئەوەی کە دوژمنایەتی پێغەمبەر ﷺ و باوەڕداران بکەن.

سەرکردەی ئەو کاتەی جولەکەکانی بەنی نەضیر کەسێك بوو بەناوی (حي کوڕی ئەخطەب) چاوی لەدەم و بەڵێنە درۆینەکانی (عبدالله ی کوڕی سەلول) بوو، تابە تەواوی چووە ژێر کاریگەری قسەکانی بڕیاری ئەوەیدا کە تەسلیم نەبن و لەناو قەڵاکانیاندا بمێننەوە، هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئەمەی پێ ڕاگەیاند کە تەسلیم نابین و تۆش ئەی (محمد) چیت لەدەست دێت درێغی مەکە...).

بێگومان ئەم حاڵەتە سەبارەت بە موسڵمانان زۆر سەخت و ناخۆش بوو، چونکە بەگژدا چوونەوەی جولەکەکان لەو کاتە هەستیارەدا کەتەنها یەك ساڵ تێپەڕی بوو بەسەر کارەساتەکانی جەنگی (ئوحد)دا کارێکی هەروا سانا و ئاسان نەبوو، بەڵام پێغەمبەر و هاوەڵان بەپشتیوانی خوای بەزەبر و باڵادەست بەڕێکەوتن و (الله اکبر) یان کردوو (عبدالله ی کوڕی ام مکتوم)ی لەسەر مەدینە دانا و ئاڵای

موسڵمانانی دایە دەستی (علی کوڕی ئەبو طالب) و بەرەو قەڵاکانی جولەکە ترسنۆکەکانی بەنو نەضیر بەڕێکەوتن...

جولەکەکان لەناو قەڵاکانیاندا خۆیان ساز و ئامادەکردبوو بەتیر و بەردی زۆرەوە، لەم لاشەوە (عبدالله ی کوڕی سەلول)ی گەورەی دووڕوان کە جولەکەکانی هەڵنابوو بۆ جەنگ لەدژی موسڵمانان و بەڵێنی دوو هەزار کەسی دابونی کەبەرگریان لێدەکات و لەدژی موسڵمانان دەجەنگن، بەڵێنەکانی نەبردە سەر و بەپشتا هەموویانی خستە چاڵەوە!!!

﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾﴾الحشر.

پێغەمبەر ﷺ چواردەوری گرتن و فەرمانیدا بە بڕینی دارخورماکانیان و خەسارەت لێدانیان))[1]

جولەکەکان کاتێك ئەمەیان بینی بانگیان کرد ئەی (محمد): خۆتۆ لەمەوبەر قەدەغەت کردبوو بڕینی دارخورما و وێران کردنی باخ و هەرکەس ئەمەی بکردایە لۆمەت دەکرد؟ بۆچی وا ئێستا خورماکانمان دەبڕی و باخەکانمان دەسوتێنی؟!

خوای مەزن بەناردنە خوارەوەی ئایەتەکانی سورەتی (الحشر) وەڵامی دانەوە و فەرمووی:

﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ﴿٥﴾﴾الحشر.

واتە: ئەی (محمد ﷺ) هەرچی دارتان بڕیوە و هەچیشتان نەبڕیوە و بەپێوە ماوەتەوە، ئەوە خودای گەورە ڕێگەی پێداون بۆئەوەی کە ئەو جولەکە فاسقانە سەرشۆڕ و ڕیسوا بن.

---

[1] موسلیم و بوخاری ڕیوایەتیان کردووە.

سەرەنجام جولەکەکان زانیان کە جەنگیان لەگەڵ پێغەمبەر و موسڵمانان پێناکرێت ناچاربوون و داوایان لە پێغەمبەر کرد کە ڕازیبوون بە فڕێدانی چەکەکانیان و دەرچوونیان لە مەدینە، پێغەمبەریش ﷺ ڕازی بوو بە مەرجێك تەنها خۆیان و ژن و منداڵەکانیان دەربکەن، پاشان هەرچیەکیش ووشتر هەڵیبگرێت بیبەن لەگەڵ خۆیاندا جگە لەچەك، بەمە ڕازیبوون و بەدەستی خۆیان ماڵەکانی خۆیان ڕوخاند ﴿يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ۝٢﴾الحشر.

لە قەڵاکانیان هاتنە خوارەوە و بەباری (٩٠٠) وشترەوە مەدینەیان بەجێهێشت و ژن و منداڵەکانیان برد.

سەرگەورەکانیان وەك (حي کوڕی ئەخطەب) و (سلامی کوڕی ئەبی الحقیق) بەرەو خەیبەر ڕۆشتن، هەندێکیشان چوون بۆ شام.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرت بەسەر چەك و تفاقی جەنگی بەنی نەضیردا و زەوی و موڵك و ماڵی لێ سەندن و دواتر بەشی کرد بەسەر هاوەڵە کۆچکەرەکاندا (المهاجرین) و بەشی یاریدەدەرانی خەڵکی مەدینەی لێنەدا، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە کۆچکەران زۆر هەژار و کەم دەست و نەبووبوون، لەناو یاریدەدەراندا (الأنصار) تەنها دوو کەس لەو ماڵە بەجێمابوەی درایە ئەوەش لەبەر هەژاریان بوو.

بەڵێ هەروەك پێشتر باسمان کرد کە ئەم ڕووداوە لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچی بەرامبەر بە (٦٢٥)ی لەدایك بووندا ڕویدا و خوای مەزن (سورەتی) (الحشر)ی بەتەواوی لەسەر ناردە خوارەوە و إبن عباس دەربارەی سورەتی (الحشر) دەیوت: (قل: سورة النضیر). واتە: بڵێ سورەتی (النضیر) چونکە لە سەرشۆڕی و خیانەتی جولەکەکانی بەنو نەضیر دەکات))[1]

---

[1] إبن هشام ج(٢) ص(١٩٠ – ١٩٢)، زاد المعاد/ ج(٢) ص(٧١) صحيح البخاري ج(٢) ص(٥٧٤ – ٥٧٥)ن الرحيق المختوم / ص(٢٨٢).

## باسی حەوتەم/ خیانەت و پەیمان شکێنی جولەکەکانی بەنو قریظة

دوای ئەو سەرشۆڕی و دەرکردن و ڕیسواییەی کە بەهۆکاری ستەم و پەیمان شکێنی خۆیانەوە دووچاری بوون هەردوو هۆزی (بەنو قەینوقاع) و هۆزی (بەنو نەضیر) لەشاری مەدینەی پیرۆز وەدەرنران و دورخرانەوە بۆ وڵاتی شام و دەوروبەری، لەم کاتەدا تەنها تیرە و هۆزێك کە لەناو شاری مەدینەدا مابێتەوە بریتیە لە جولەکەکانی (بەنو قریظة) داخ و ڕق و کینەیەکی هێجگار گەورە و ئەستوریان لە موسڵمانان لەناخی پیسی خۆیاندا هەڵگرتبوو، بۆ فرسەت و بوارێك دەگەڕان کە زەهری کوشندەی خۆیان بکەنە جەستەی موسڵمانانەوە.

هەر لەبەر ئەمەبوو کە بیست پیاو لەسەر کردەوە و دەم ڕاستەکانی هۆزی بەنی قریظة کەوتنە ڕێ بۆلای قورەیش و سەرانی مەککە، بەمەبەستی هاندانیان لەسەر شەڕکردن و هێرشکردنە سەر پێغەمبەر و موسڵمانان لەشاری مەدینە، قورەیش لە هەلێکی ئاوا دەگەڕا و بەبیستنی ئەم پێشنیارەی جولەکەکانی بەنی قریظة دەرفەتێکی گونجاوی دەست کەوت بۆ کڕینەوەی ناوبانگ و شکۆی لەدەستچوو و ونبوی خۆی لەناوچەکەدا...

پاشان شاندە بیست کەسیەکەی جولەکە چوون بۆ لای هۆزی (غەطەفان) و چیان بە قورەیش وت، هەمان شتیشیان بەوان وت، غەطەفانیش ڕازی بوون بەداواکاری و پێشنیارەکەیان و ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ جەنگ لەگەڵ موسڵماناندا، دواتر شاندەکەی جولەکە بەناو تەواوی خێڵ و هۆز و تیرە عەرەبەکانی ئەو ناوچانەدا گەڕان و ژمارەیەکی تریشیان ڕازی کرد کەلەگەڵیاندابن بۆ ئەم جەنگە، بەم شێوەیە سەرکردەکانی جولەکە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لەجۆشدانی عەرەبەکان و بێ باوەڕاندا دژ بە بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە.

بێ باوەڕانی مەککە بەسەرکردایەتی ئەبو سفیان لە باشورەوە لەگەڵ هۆزی (کنانە) و هاوپەیمانەکانیان بەچوار هەزار سەربازی شەڕکەرەوە بەرەو مەدینە هەنگاویان هەلگرت، لەڕوکاری ڕۆژهەلاتیشەوە خێڵەکانی (غەطەفان) و (بنی مرە) و (بنی شجع) و (بنی اسد) و چەند خێڵێکی تریش لەگەڵیاندا دەرچوون بەرەو مەدینە..

پاش چەند ڕۆژێك بەچواردەوری مەدینەدا سوپایەکی داگیرکەری زەبەلاحی دەهەزار کەسی کۆبونەوە، ژمارەی ئەم سوپایە لەژمارەی دانیشتوانی مەدینە بە ژن و منداڵ و پیاوەوەزیاتر بوو.. سەرکردایەتی شاری مەدینەی زۆر زانا و هۆشیار بوو، چاوەڕوانی بارودۆخەکەیان دەکرد، هەواڵ هات بۆ پێغەمبەر ﷺ دەبارەی ئەو سوپایە، دەست بەجێ پێغەمبەر ﷺ ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری پێکهێنا بۆ مەبەستی چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم شەڕە نەخوازراوە...

سەرەنجام سەلمانی فارسی پێشنیاری هەلکەندنی چاڵی گەورەی کرد (خندق) بەچواردەوری مەدینەدا، ئەویش بەوەی کە بە پێغەمبەری وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەووڵاتی فارسدا کە گەمارۆ بدرابنایە لەلایەن دوژمنەکانمانەوە چاڵی گەورەمان بەچواردەوری خۆماندا هەڵدەکەند، با ئەم کارە بکەین چونکە هەلکەندی چاڵی گەورە بەلای عەرەبەکانەوە کارێکی نامۆیە..

دەستبەجێ پێغەمبەر فەرمانی کرد بەجێبەجێ کردنی نەخشەکە و ڕایسپارد کە هەر دەپیاو دەبێت چل گەز لەو خەنەکە هەڵبکەنن.[1]

دەستکرا بە هەلکەندنی خەنەکەکە و تەواوی موسڵمانان بەشداربوون لەم کارە گرنگەدا و هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەری خودا کاریان کرد تا لەسەرەنجامدا بەپشتیوانی خوای مەزن خەنەکەکە تەواوبوو...

---

[1] گولاوی سەرمۆر/ و: بکر حمە صدیق لا: (٣٦٠)

قورەیشی بە چوار هەزار کەس و تیرە و هۆزەکانی تریش بەشەش هەزار کەسەوە ڕووبەڕووی مەدینە وەستان، کاتێك موسڵمانان ئەم لەشکرە زەبەلاحەیان بەدیکرد وتیان:

﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَـٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَـٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾﴾الأحزاب.

واتە: کاتێك ئیمانداران ئەو گرۆهانەیان بینی وتیان: ئەمە ئەو بەڵێنەبوو کە خودا و پێغەمبەرەکەی فەرموویان، بەڕاستی خودا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو، ئەمەش جگە لە باوەڕ زیادبوون و ملکەچبوون بۆ خوا هیچ کاریگەری لێ نەکردن.

لەبەرامبەردا دووڕووان و دڵ نەخۆشان بەبینینی ئەم سەربازگە زەبەلاحەی کە وەك گەلە گورگ ئامادەی هێرش بوون بۆ سەر موسڵمانانی مەدینە وتیان:

ئەوەی کە خودا و پێغەمبەرەکەی بەئێمەیان وت لە پەیمان و بەڵێن و سەرکەوتن و بازنەکانی کیسرای ولاتی ئێران و سەرکەوتنی ئەم دینە جگە لەخۆبایی بوون و خەیاڵات هیچی تر نەبوو.

﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾﴾الأحزاب.

سەرنج/ بێگومان باسەکەی ئێمە بەشێوەیەکی دیاریکراو باسکردن نیە لە وردەکاریەکانی جەنگی (خەندەق) کە (أحزاب)یشی پێدەوترێت، چونکە ئەمە باسێکی سەربەخۆیە و باس و خواسی زۆر هەڵدەگرێت، ئێمەش لەبەرئەوە باسی ئەم سەرەتایەمان کرد لە جەنگی (ئەحزاب) یان (خندق) بۆئەوەی لە پێشەکیەکان و سەرەتای هەنگاوەکانی پەیمان شکێنی و ناپاکی و خراپەکاریەکانی جولەکەکانی بەنی قریظة تێبگەین و ئەندازەی ئەو ناپاکیەیان بزانین کە چۆن و هەموو کات لەخەونی تێکشکاندنی موسڵماناندا بوون و هەر کاتێکیش پەیمانێکیان دابێت ئەوە

له تەواوی بێ دەستەلاتیان بووە و بواری تریان لەبەردەمدا نەبووە، گەرنا ئەصل و ڕووی بێ پەردە و ڕاستەقینەیان ئەوەبوو کە (دزێن، خیانەت کارین، خەنجەر وەشێنین لە پشتەوە؛ درۆزن و گەندەڵین لەگەڵ هەموو بەرامبەرەکانیاندا.

## باسی هەشتەم/ تەواوبوونی جەنگی خەندەق و گەمارۆدان و دەرکردن و تەمێ کردنی جولەکە ناپاکەکانی بەنی قریظة

ئەم جەنگە لەمانگی شەوالی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا دەستی پێکردوو ژمارەی دوژمنان هەروەك باسمان کرد بریتی بوو لە (١٠) هەزار کەس، لەبەرامبەریشدا ژمارەی موسڵمانان تەنها (٣) هەزار کەس بوو، کۆتای جەنگەکە بەبێ شەڕ و کوشتار هات و خوای مەزن بە (با)ی بەهێز و ترس و دووبەرەکی خستنە ناو تیرە و هۆزەکان هەموویانی سەرشۆڕ و دۆڕاو کردوو هەروا و بەبێ هیچ دەستکەوتێك و بەمل شۆڕی گەڕانەوە بۆ جێگەکانی خۆیان، لەبەرامبەریشدا موسڵمانانی سەرخست و سەرکەوتنی گەورەی بەنسیب کردن، ئەوەی لەم نێوانەدا ماوەتەوە کە دەبێت باجی خیانەت و پەیمان شکێنیەکانی خۆی بدات، بریتین لە جولەکە ناپاکەکانی (بەنی قریظة) ئەویش بەم شێوەیە:

(کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە لە خەندەق و چەکی دانا و خۆی شۆرد، جوبرەئیلی ئەمین هاتە خزمەتی و پێی وت (**أو قد وضعت السلاح!؟ فإن الملائكة لم تضع أسلحتهم**) بەمانای ئەوەی (دەڵێی چەکت داناوە؟ خۆ هێشتا فریشتەکان چەکیان دانەناوە.

ئەوجا جوبرەئیل پێی فەرموو: ئەوامنیش لەسەر داوای ئەوان هاتمەوە لات، خۆت و هەر کەسێکت لەگەڵدایە هەر ئێستە بکەونەڕێ بەرەو (بەنو قریظة) ئەوامنیش (جوبرەئیل) لەپێشتەوە دەڕۆم و قەلاَکانیان لەژێر پێدا دەلەرزێنم و ترس و بیم دەخەمە دڵەکانیانەوە، جوبرەئیل لە کەژاوەیەکی فریشتەیدا بەڕێکەوت بەرەو قەلاَکانی بەنی قریظة...

پێغەمبەریش ﷺ فەرمانیدا، کە بانگ کەرێك لەناو شاری مەدینەدا بانگ بدات بە گوێچکەی هەر کەسێکدا کە گوێ بیست دەبێت و توانای جەنگی هەیە و بەرێبکەوێت بەرەو قەڵاکانی بەنی قریظة و ئەوەندە پەلە بکەن، لە (بەنی قریظة) نەبێت نوێژی عەسر نەکەن (عبدالله ی کوڕی ئوم مەکتومی) بەسەر مەدینەوە بەجێ هێشت و ئاڵای دایە دەستی (علی کوڕی ئەبو طالب) و بەرەو بەنی ظریظة کەوتنە ڕێ، نزیك بوونەوە لە قەڵاکانیان و (علی)یش لە پێش هەموویانەوە گوێ بیستی ئەوە بوو کە قسەی ناشرینیان بە پێغەمبەر ﷺ دەوت.. هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا بوون و هەندێکیان لە ڕێگە نوێژی عەسریان کرد و هەندێکی تریشیان ڕوکەشی فەرمانەکەی پێغەمبەریان ﷺ وەرگرت و نوێژی عەسریان نەکردوو وتیان: لەبەنی قریظة نەبێت نوێژی عەسر ناکەین چونکە پێغەمبەر فەرمانی بەمە کردووە..

پێغەمبەری خوا سەرزەنشتی هیچ کام لەو هاوەڵانەی نەکردووە بەبێ دەنگی هەڵوێستی هەر کامیانی بەلاوە پەسەند بوو.

پێغەمبەر و هاوەڵان بەسێ هەزار چەکدار و (٣٠) ئەسپ سواریشیان لەگەڵدابوو، لە قەڵاکانی بەنی قریظة نزیك بونەوە و گەمارۆیان دا.

کاتێك ئابڵوقەکەیان لەسەر توندبوو (کەعب ی کوڕی ئەسەد)ی سەرکردەیان سێ پێشنیاری خستە بەردەم جولەکەکان کە یەکێکیان هەڵبژێرن ئەوانیش:

١) یان موسڵمان بوون و باوەڕهێنان بەدینەکەی (محمد ﷺ) ئەوجا خوێن و ماڵ و منداڵ و سەروەتیان سەلامەت دەبێت، پێشی وتن کە (محمد) پێغەمبەری خوایە و ئەو کەسەیە لەتەوراتەکەتاندا ناو و باسی هاتووە.

٢) یان بەدەستی خۆیان ژن و منداڵەکانیان بکوژن و ئەوجا وەرنە دەرەوە و شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر و هاوەڵانیدا بکەن.

٣) یان ئەوەیە کە لەڕۆژی شەممەدا هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر و هاوەڵان و زەبریان لێبدەن، چونکە ئەوان دڵنیان کە ئێمە لەڕۆژی شەممەندا شەڕناکەین.

دوای تەواوبوونی (کەعب) لەپێشنیارەکانی، جولەکەکان بەرپەرچیان دایەوە و بەدەم هیچ یەکێك لە پێشنیارەکانی یەوە نەهاتن...

جولەکەکانی بەنو قریظة لە غەیری دابەزین لە قەلاَکانیان و تەسلیم بوون و بەپێغەمبەر و هاوەلاَن بژاردەیەکی تریان لەبەردەمدا نەما...

بەلاَم پێش ئەم کارەیان ویستیان پەیوەندی بکەن بە هەندێك لە هاوپەیمانە موسلَمانەکانیانەوە بە ئومێدی ئەوەی کە: گەر دابەزن بۆ حکومی پێغەمبەر ﷺ چیان لیَ بەسەر دێت و چارەنوسیان چی لێدێت؟!

داوایان کرد لە پێغەمبەر کە (أبو لباب)ەیان بۆ بنێرێت و قسەی لەگەلَدا بکەن و ڕاوێژی پیَ بکەن، ئەبو لبابە بەحوکمی ئەوەی کەمالَ و مندالَەکەی کەوتبوە ناوچەی ئەوانەوە هاوپەیمانیان بوو...

کاتێك (أبو لباب)ە چووە ناو قەلاَکانیانەوە و بینی کە ژن و مندالَەکانیان دەگرین دلَی نەرم بوو بۆیان، ئەوجا پێیان وت: ئەبولبابە پێت وایە ملکەچ بین بۆ حوکمی (محمد)؟ وتی: بەلَیَ بەدەستی ئامازەی بۆ گەردنی مەبەستی ئەوەبوو کە دەدات لە گەردنی هەموتان...

ئەبولبابە بەدرکاندنی ئەم نهێنیە هەستی کرد کە کارێکی باشی نەکردووە و خیانەتی لە خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە، هەر لەبەر ئەمەبوو کە ئەوێی بەجێهێشت و نەگەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر و چووە مزگەوتی مەدینە، خۆی بەیەکێك لە کۆلَەکەکان بەستەوە و سوێندی خوارد کە خۆی نەکاتەوە هەتا خودی پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی دەیکاتەوە دوای نزیکەی (٢٥) ڕۆژ گەمارۆدان جولەکەکان ناچاری هەر حوکمێك بوون کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەیان بڕیاری لێبدات، بەنی قریظة کاتی خۆی هاوپەیمانی تیرەی ئەوس بوون، پێغەمبەر ﷺ وای پیَ باشبوو کە حوکمەکەیان بداتە دەستی سەرکردەیەکی ئەوسیەکان، حوکمەکەی دایە دەستی (سەعدی کوڕی معاذ) کە لەجەنگی خەندەقدا بریندابوو بوو.

کاتێك بڕیاردرا بەوەی (سەعد) دیاری کراوە بۆئەم بڕیاردانە ناردی بەشوێنیدا و بەسواری گوێدرێژێك هێنایان، کاتێك (سەعد) نزیك بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە هاوەلاَنی یاریدەدەران: هەلسن لەبەرگەورەکەتان یان پیاوچاکەکەتان، دواتر پێغەمبەر ﷺ بە (سەعد)ی فەرموو: بە حوکمی تۆ ڕازین!!

(سەعد) حوکمەکەی بەمە دەرکرد کە وتی: تەواوی پیاوەکانیان بکوژرێت و ژن و منداڵەکانیشیان بکەن بە بەندە و جاریە...

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی سەعد حوکمەکەت ڕێکە لەگەڵ حوکمی خوادا.

سەرەنجام لەبازاڕی مەدینەدا چاڵی گەورەیان بۆ هەڵکەندرا و پۆل پۆل نێردران بۆناو چاڵەکان و لەوێدا لەگەردنیان درا کە ژمارەی پیاوەکانیان لەنێوان (٦٠٠ – ٧٠٠) پیاودا بوو!! دواتر دەستگیرا بەسەر ماڵ و قەلاّ و شمەکە جەنگیەکانیاندا و پاشان دابەشکرا بەسەر موسڵماناندا.

بەم شێوەیە جەنگەکە کۆتایی هات و لە غەزای خندق و (بەنو قریظة)دا چەندین ئایەت لە سورەتی ئەحزاب هاتە خوارەوە و تیایدا باسی گرنگترین لایەنی حاڵەتی ئیمانداران و دووڕووان و سەرشۆڕی بێ باوەڕان و جولەکە و هاوپەیمانەکانی تێدا کرا.

## چەند سەرنج و ڕونکردنەوەیەکی گرنگ دەربارەی هۆزی خیانەتکاری بەنوو قریظة و ژمارەی کوژراوەکانیان !!

زۆر بە پێویستم زانی لە دوا باسەکانی ئەم بەند و بەسەرهاتانەدا لەسەر مەسەلەیەکی تەماوی پڕ لە گومان ڕاوەستین و هەڵوێستە بکەین، ئەویش چارەنوسی پیاوانی هۆزی بەنی قریظة لە دوای گەمارۆدان و خۆبەدەست دانەوەیان بە پێغەمبەرو هاوەڵان، لەدوای جەنگی (أحزاب) یان (خندق) لەساڵی پێنجەمی کۆچیدا!! ئەم باسە لە زۆربەی کتێبەکانی سیرەو مێژوی ئیسلامیدا بەو شێوەیە نوسراوە کە پێشتر لە پانۆرامای ڕوداوەکاندا باسمان لێوە کرد ..

دوژمنانی ئیسلام هەر وەك ئاشکرایە بەشوێن خاڵێکی لاوازدا دەگەڕێن هەتا وەکوو گەورەی بکەن هەزاران جار زیاتر لەئەندازەی خۆیۆ لەوێوە دوژمنایەتی پەیامی خوایی لێبکەن و دەرگایەك والاّبکەن بۆ مەبەستی هەڵڕشتنی ڕقی پەنگخواردویان لە اسلام و مسوڵمانان.

ئەم دژایەتی کردنەیان کەئەنجامی دەدەن تا ئێرا گەر لەروانگەی قورئان و پاشان واقع و مێژوشیانەوە سەیری بکەین کارێکی ئاساییەو هیچ پەیامێکی خوای نەبوە بەبێ دوژمن(**وكذلك جعلنا لكل عدو من اعجر مين وكفي بربك هاربا و نصيرا**)

هەتا وەکوو ئێرە کارەکە زیادەیە ئاساییە هەروەك باسمان کرد بەڵام ئەوەی نائاساییەو جێگەی خەم و تێرامانە، بریتیە لەوەی خۆمان بەدەستی خۆمان و ئارەزوو مەندانەوە دور لەهەموو فشارێکی دوژمنان، دەرگا داخراوەکان لەسەر دوژمنان بکەینەوەو بەڵگەو بیانووی گەورە گەورەیان بدەینێ لەسەر دین و مێژوی هەزار ساڵەی مسوڵمانان و ژیان و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر و هاوەڵان و چەندین بابەت و کایەی تر !!

بەراستی ئەمە کارێکی هێجگار خراپەو هەزاران جار زیاتر زیان بەخشە بە مسوڵمانان و دینەکەیان، لەوەی کەکەسێك لەدورەوەو نەفامانەو قین لەدڵانە دوژمنایەتیان بکات.

مێژوی مسوڵمانان لەسەردەمی خۆشەویست و دواتر خەلیفەکانی راشدین و دوای ئەوانیش ئەمەویەکان و عەباسیەکان و دواتریش عوسمانیەکان پێویستی زۆریان بە چاکسازی و نوسینەوەی نوێ هەیە، ئەویش بەمەبەستی فرێدانی ئەو بوختان و زیادەرەویانەی کە نراون بەمێژوی مسوڵمانانەوەو خزێنراونەتە ناو روداو بەسەرهاتەکان و لە دواجارداو بەزۆر کراون بەدەسکەوت و موڵکی مسوڵمان، لەکاتێکدا کەبەو جۆرە نین و لە زۆربەی روداو گێڕاوەکاندا مسوڵمانان بێئاگاو گەردن پاکن لەو درۆو بوختانانەی کەلە مێژوەکەیاندا بە پێنوسی زاناو مێژو نوسە مسوڵمانەکان نوسراونەتەوە. دەبێت لەسەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا زاناکان و مێژو نوسەکان و تەواوی خەم خۆران زۆر بە جورئەتەوە مێژوی مسوڵمانا شەن و

ئەو بکەن و ڕاست لە ناڕاست جیا بکەنەوەو لەهەمان کاتیشدا دان بە شکست و هەڵەکانیشیاندا بنێن کەلە مێژوی مسوڵمانانندا رویان داوە [1]

بەڵێ یەکێك لەو مەسەلانەی کە زۆرترین قسەو باس هەڵدەگرن لە کتێبی زانایان و مێژوو نوسان و مێژووی ئێمەدا تۆمار کراوەو لەهەمان کاتیشداو لەلایەن دوژمنانەوە زۆرترین دوژمنایەتی مسوڵمانانی پێدەکرێت، بریتیە لە مەسەلەی جولەکەکانی بەنی قورەیزەو ئەو ژمارە خەیاڵیەی کەلە گەردنیان دران بەدەستی پێغەمبەر و هاوەڵان و پاشان دەست گرتن بەسەر ماڵ و سامان و ژن و منداڵەکانیان و لەناو بردنی هەر پیاوێکیان کە موی لێهاتبێت کە ژمارەیان(٦٠٠_٩٠٠) کەسدا بوون، پاشان هەڵکەندنی چەند چاڵێکی قوڵ بۆیان لەناو بازاری مەدینەدا دوای سەر پەڕاندنیان فرێدرانە ناو ئەو چاڵانەوەو پرۆسەکە بەدەستی (علی) و (زوبیر) ئەنجام دران لەماوەی ٢ بۆ ٣ ڕۆژ ئەو ژمارە زۆرەیان لێ کوژراوەو سەریان لەلاشەیان کرایەوە ! ! ؟

بەداخەوە ئەم خرافان و ژمارە خەیاڵیانەی کە لە سیرەی پێغەمبەر و ژیانی ئەو مەزنەدا تۆمار کراوە هەر ئەمەندەش نا بەڵکو وەك شانازیەك بۆ مسوڵمانان لەو سەردەمەدا و لەزۆربەی ریوایەتە مێژوییەکان و کتێبەکانی سیرەدا تۆمار کراون، بەتایبەت زانای پایە بەرز و یەکەم نوسەری ژیانی پێغەمبەر ی مەزن (ابن اسحاق) ئەم باس و روداوانەی لە ژیانی پێغەمبەردا تۆمار کردووە و دوای ئەمیش زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی کە نوسەری ژیانی پێغەمبەر بوون (سیرة) چ لە کۆن وە چ لە ئێستاشدا هەمان هەواڵ و بەسەرهاتیان وەك گێڕانەوەکەی (إبن إسحاق) و (إبن هشام) کۆپی کردۆتەوە بەبێ شەن و کەوکردن و لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و دروستی ئەم بەسەرهاتە هەستیارە ! ! !

---

[1] لەسەر ئەم بوارە (مێژووی ئیسلامی) بگەڕێرەوە بۆ بەندی هەشتەم لە کتێبمان (إسلام – عەقیدە و شەریعەت و مێژووی)..

بەڕاستی من کاتێك گەیشتمە سەر باسی کوژرانی ئەو ژمارە خەیاڵیەی جولەکەکانی بەنی قورەیزە و سەرنج دانم بۆ زۆربەی کتێبەکانی (سیرە) کە هاوڕابوون لەسەر باسکردنی ئەم حاڵەتە...

توشی شۆك بووم و لەناخی خۆمدا نەم دەتوانی باوەڕ بەوە بکەم کە پێغەمبەری (رحمة للعالمين) و پاشان هاوەڵانی **(كنتم خير أمة أخرجت للناس)** و **(خير القرون قرني)** و **عليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي)** قەسابخانەیەکی ترسناکی خوێناوی ئابەو شێوەیان لەناو بازاڕی مەدینەدا و بەبەرچاوی ژن و منداڵ و دانیشتوانی ئەو شارەوە، دامەزراندبێت و لەماوەی (٢ – ٣) ڕۆژدا (٦٠٠ تا ٩٠٠) کەسیان مل قرتاو کرد بێت ! !

هەر ئەم باوەڕنەکردنەم بەم خرافاتە کە لە مێژووی ئێمەدا تۆمارکراوە پاڵنەری بەهێزم بوو بۆ گەڕان و لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم بەسەرهاتە کەڕاستیەکەی چی بووە.. سوپاس بۆ خوای مەزن بەدەست بەتاڵی نەگەڕامەوە و دوایی گەڕان و ماندووبونێکی زۆر ئەصلی ئەم بابەتە مێژوویەم دەستکەوت و بەڕاستی زۆر دڵخۆش بووم پێی، چونکە ئەمەیان لەگەڵ إسلام و قورئان و مەزنی مامەڵە و ڕەوشتی پێغەمبەر و پاشان هاوەڵاندا دەگونجێت و یەکانگیرە و زۆرتر نزیکە لەو إسلامەی کە من لە خزمەتیدا بووم و لێی تێگەیشتووم.

بۆمەبەستی ئاڵۆز نەکردنی ئەم بابەتە و باشتر لێ تێگەیشتنی دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە:

**خاڵی یەکەم:** سەرەتا پێویستمان بە گەڕانەوەیەك هەیە بۆ سەرەتای تەشریف هێنانی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە، ئەویش بە باسکردنی ئەو گرێبەست و پەیمان نامەیەی کە لەگەڵ جولەکەکاندا مۆریان کرد و لەسەری سازان.

لەدیارترین بڕگە هەتسار و بنەڕەتیەکانی ئەو پەیمان نامەیە بریتی بوو لە ((جولەکەکان لەگەڵ ئیمانداراندا یەکدەنگ دەبن لەسەر ئەوەی کە هەر کەسێك

جەنگیان لەگەڵدا بکات، لەو کاتەدا هاوکار و پشتیوانی یەکتر دەبن لەدژی دوژمنە هاوبەشەکەیان).

یان((ئەم پەیمان نامەیە چاو پۆشی ناکات لەوانەی کە ستەمکار و تاوانبارن و هەوڵی نانەوەی ئاشوب و گەندەڵی دەدەن).

یان ((هەموومان (موسڵمان و جولەکە) دەبێت یەکدەنگ و پشتیوانی لە یەکتری بکەین دژی ئەوانەی کە هەڵدەکوتنە سەر شاری (یەثرب) (مەدینە) بەپێ بوون و توانا و دەستەلاتی خۆمان).

ئەمانە لە دیارترین ئەو بڕگانەبوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی لێوە کردن لەگەڵ جولەکەکاندا و دواتریش ئەوان ڕێکەوتن لەسەری و مۆریان کرد... پێنج ساڵ بەسەر ئەم پەیمان نامەیەدا تێپەڕی و جولەکەکانی بەنی قورەیزە بەوپەڕی شەرەف مەندانە و بێ خەم لەناو شاری مەدینەدا ژیانێکی ئارامیان دەبردە سەر و، هیچ کەس لەگوڵێك جوانتری پێ نەدەوتن. بەڵام لەلای ئەو ناپاکانەدا (**هل جزاء الإحسان إلا الإحسان**) نەبوو، بەڵکو پاداشتی چاکی و ماف پێدانیان لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بریتی بوو لە کاری ژێر بەژێری و گرێدانی کلك لەگەڵ سەرسەخت ترین دوژمنی موسڵمانان و پێغەمبەر کە موشریکەکانی قورەیش بوون و، ئەنجامدانی خیانەت و فرۆشتنی خاك و دەست گرتنی دوژمن و جاشایەتی و، وەشاندنی خەنجەری ژەهراوی بوو لە پشتی موسڵمانان.. چونکە ئەوان بە سروشتی حاڵی خۆیان گەلێکی ترسنۆك و ناخ بەرزبوون و بوێری ئەوەیان تێدا نەبوو کە بە ئاشکرا و ڕووبەڕوو (وجهاً لوجه) لەگەڵ موسڵماناندا شەڕ بکەن و ڕقی ژەهراوی خۆیانیان پێ برێژن.

گەر بە خێرایی بەڕووداوەکاندا بچینەوە و بە (إنصاف)وە، دوور لە هەموو دەمارگیریەك، دەبینین کە هەرسێ تاقمەکەی جولەکە دەست پێش خەربوون لە شکاندنی برگەکانی ئەو پەیمان نامەیەی، کە بەبێ زۆر لێکردن ڕێکەوتبون لەسەری، بەتایبەت جولەکەکانی (بەنی قریظة) نەك هەر بەندەکانی ڕێکەوتن نامەکەیان ژێر پێ خست و سوکایەتیان پێکرد، بەڵکو گەورەترین تاوانیان ئەنجامدا کە لەزاراوەی

ئەمڕۆدا پێی دەوترێت (الخيانة العظمى)، ئەویش بە هێنانی دوژمن بۆ سەر وولاَتەکە و هەموو کار بۆ ئاسانکردنێك!!

لەم سەردەمەدا کە سەردەمی پێشکەوتن و زانست و دیموکراتی و مافی مرۆڤ و ئازادیەکانە ـ هەروەك دەوترێت و بانگەشەی بۆ دەکرێت ـ گەر کۆمەڵێك خەڵك لە پێشکەوتوترین و ئازادی خوازترین و دیموکراتی ترین وولاَتی جیهاندا هەڵبسن بەم کارە و، دەستی دوژمنەکانیان بگرن و کار ئاسانیان بۆ بکەن و، بە هەزاران سەربازەوە بیانهێننە سەر ئەو وولاَتە!! ئایا ئەمانە ناویان دەنرێت چی؟! ئایا دوای ئاشکرابونیان و تەواوبوونی جەنگ چارەنوسی ئەمانە لەلایەن دەستەڵاتداری ئەو وولاَتەوە بەچی دەگات؟!!

لەمانگی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠١) کۆمەڵێك تیرۆرستی سەر بە ڕێکخراوەکانی (القاعدة) هەروەك دەوترێت، لە ڕێگەی چەند فرۆکەیەکی نەفەر هەڵگرەوە، هەڵسان بە تەقاندنەوەی هەردوو باڵەخانەی بازرگانی جیهانی لە ئەمریکا و، بەهۆیەوە (٣ تا ٥) هەزار کەس بوونە قوربانی، بەڵام ئەمریکا لە پاداشتی ئەم کارەدا چی ئەنجامدا؟! وولاَتێکی زەبەلاحی وەك ئەفغانستانی کاول نەکرد؟! هەزاران کەسی لەو وولاَتەدا نەکردە قوربانی!!؟!

با نوکی قەڵەمەکانمان بخەینە سەر دەوڵەتی پڕ لە ستەمی ئیسرائیل لە فەلەسطین ی هەزار جار شەهیدا!!

ئایا جولەکەکانی ئەو وولاَتە، لەبەرامبەر کوشتنی یەك سەربازیاندا لەلایەن بزوتنەوە بەرهەڵستکارەکانی نێو فەلەسطین و، بەتایبەت (بزوتنەوەی حەماس) چەند کەس دەکەنە قوربانی؟! لەبەرامبەر موشەکێکی (حەماسدا) چەندین جار زۆربەی خاکی غەزەیان بەدانیشتوانەکەشیەوە تەختی زەوی نەکرد و، هەزارانیان لێ شەهید نەکردن؟!! خۆ ئەمانە کە وایان لێکرا وەك جولەکەکانی بەنی (قريظة)ش ناپاك و تابوری پێنج نەبوون، بگرە خاوەنی ڕاستەقینەی خاکەکەبوون؟!

باشه گەر ئێستا لە دەوڵەتی ئیسرائیلدا کۆمەڵێك لە دانیشتوانی شارەکانی ژێر دەستەلاتی ئیسرائیلی، ژێر بە ژێر پەیوەندی بە بزوتنەوەی حەماسەوە بکەن و، کار ئاسانیان بۆ بکەن لە ئازادکردنی ئەو شارانەی کە قەوارەی زایۆنی بەستەم داگیری کردوون. ئایا گەر دەوڵەتی إسرائیلی ئاشکرایان بکات کە کارێکی وەهایان ئەنجامداوە چارەنوسیان چی دەبێت؟!!

ئایا گەر ژمارەی ئەوانە (٦٠٠ بۆ ٩٠٠) کەس نا، بەڵکو (٦٠٠٠ بۆ ٩٠٠٠) کەیش بن، لە گەردنیان نادرێت و، بەناپاك و خاك فرۆش و بە کرێ گیراوی بێگانە لەقەڵەم نادرێت و، سەرەنجام ملیان ناکرێت بەپەتدا؟؟! زۆربەمان دەزانین لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا و لە (عێراق)دا کەسێك دەستگیرکرا بەناوی (بازۆفت)، کە سیخوڕی یەکێك بوو لە دەوڵەتە زلهێزە هاوپەیمان و دۆستەکانی (صدام حسین)، ئەوەی لەسەر ساغ بۆوە کە سیخوڕی دەکات بۆ ئەو دەوڵەتە لە عێراقدا، دوای تکاکردنێکی زۆری دەوڵەتەکەی، سەرەنجام (بازۆفت) ملی کرا بەپەتا و بە مردووی ڕەوانەی وڵاتەکەی کرایەوە، چونکە بە پێی یاسای تەواوی دەوڵەتەکەیان بەدرێژایی مێژوو بە ئێستاشەوە، ئەو کەسانەی کە (تاوانی جەنگ (جریمة الحرب) یان (ناپاکی گەورە) (الخیانه العظمی)، یان سیخوڕی ئەنجام دەدەن (جا ژمارەیان) هەر چەند بێت، ئەوە بەپێی یاسای هەر یەك لەو دەوڵەتانە دەبێت لە سێدارە بدرێن و لەناو ببرێن و هیچ لێبوردنێکی گشتی و تایبەتیش نایان گرێتەوە.

بەڵێ تەنانەت لە (تەورات)ی جولەکەکانیشدا هەمان سزای لەناوبردن هاتووە بۆ ئەوانەی کە (سیخوڕی دەکەن یان ناپاکی دەرهەق بەخاك و نیشتمان دەکەن، کاتێك (سعدی کوڕی معاذ) فەرمانی بە کوشتنی تاوانبارە دیاری کراوەکانی جولەکەکانی بەنی قورەیزە کرد، بەپێی دەقەکانی تەورات و یاسا چەسپاوەکانی ئەم بڕیارەی بۆدان و مەحکومی کردن.

خاڵی دووەم: گەر ئەوەی سەرانی جولەکەکانی هۆزی بەنی قورەیزە نەخشەیان بۆ کێشابوو، لەگەڵ عەرەبە موشریکەکانی قورەیش و غەطەفان و تەواوی ئەو هۆز و شرەخۆرانەی دەوروبەری مەدینە، سەری بگرتایە و ڕووداوەکان و پێشهاتەکان بەو ئاقارەدا بچونایە کە بەرنامە سازیان بۆ کردبوو.. ئایا ئەوان (جولەکە و عەرەبەکان) چیان بە موسڵمانان و کەسایەتی مەزنی پێغەمبەر ﷺ دەکرد، لەدوای سەرکەوتنیان لەو جەنگە پڕ لە خیانەت و نابەرامبەرەدا؟ گومانی تێدا نیە کە کۆمەڵکوژی و لافاوی خوێنیان لەناو شاری مەدینەدا بەرپا دەکردوو کەسیان نەدەهێشت کە بڵێت: (لا إله إلا الله محمد رسول الله)!!

بۆ ئەم مەبەستە دەچنە لای وتەی مێژوونوسێکی (سکوتلندی)، بەناوی (مۆن گمری وات) لە کتێبی (محمد في المدينه)دا، کەباس لە ڕووداوەکانی مەدینە و بەتایبەت ناپاکی و پەیمان شکێنی جولەکەکانی بەنی قورەیزە دەکات و، دەڵێت:

**(لو أن خطت يهود بني قريظة نجحت و تيسر لهم أن يدهم المدينة من جهة الجنوب لقظوا على محمد و امته قضاءً مبرماً)**[1]

واتە: خۆ ئەگەر ئەو نەخشە و پیلانەی کە جولەکەکانی بەنی قورەیزە سەری بگرتایە و کارئاسانیان بۆ مشرکەکان بکردایە لەڕووکاری باشورەوە، ئەوە بێگومان (محمد) ﷺ یان لەناو دەبرد و، پاشان کۆتایشیان بە ئومەتەکەی دەهێنا بەکۆتایی هێنانێك کە هەرگیز دروست نەبنەوە.

بێگومان ئەمە شاهیدی مێژوو نوس و لێکۆلەرەوەیەکی بێگانەیە و نەعەرەبە و نە موسڵمانیش، بەلاَم بە ئینصافەوە ئەم شاهیدیە دەدات و، دان بەو ڕاستیەدا دەنێت گەر جولەکەکان کە قەلاَکانیان لەباشوری مەدینەدابوون، پیلانەکەیان سەرکەوتوو بوایە بێگومان لافاوی خوێنیان لەناوشاری مەدینەدا دروست دەکرد و، پێغەمبەر و تەواوی موسڵمانانیان لەناودەبرد.

---

[1] من كلام د. عدنان إبراهيم.

بەڵام خوای مەزن پیلانەکانی پوچەڵ کردنەوە و، پێغەمبەرەکەی ﷺ و باوەڕدارانی سەرخست و لەبەرامبەریشدا بێ باوەڕان و خائینەکانی سەرشۆڕ و مایەپوچ کردوو، بەسەرشۆڕی ناردنیەوە جێگەی خۆیان.

خاڵی سێهەم: گەر بە باسی ڕوودا و گێڕانەوەکەدا بڕۆینەوە و، کەمێك بە وردی سەرنجی بدەین، زۆربە ئاشکرا بێ ناوەڕۆکی و هەڵبەستراوی ئەم کوشتارگەیەمان بۆ دەردەکەوێت ئەویش بەم شێوەیە:

أ) لە گێڕانەوەکاندا ئەوە باسکراوە کە تەواوی جولەکەکانی بەنی قورەیزە لەدوای هاتنە خوارەوەیان لە قەڵاکانیاندا، بران بۆ ماڵی ئافرەتێك بەناوی (بنت الحارث) کە لە هۆزی بەنی نجار بوو! خوێنەری خۆشەویست سەرنج بدە!! لەو زەمەنەدا گەورەترین ماڵ و جێگەیەك کە لە هەموو ماڵەکان فراوانتر و گەورەتربوو بریتیبووە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەویش پێوانەی زەویەکەی لەو کاتەدا تەنها تێنەدەپەڕی لە (٣٠) مەتر بە (٣٥) مەتر!!

هەزار مەترێك دەبوو، گەر مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بوبێت، ئاخۆ دەبێت ماڵەکانی چواردەوری کە بەقوڕ و دار و حەسیر دروستکرابوون چەندە بوبێتن؟! بەئەقڵی کێدا دەچێت لەو زەمەنەدا ماڵی ئافرەتێك ئەوەندە گەورەبوبێت کە جولەکەی قەڵایەکی بە ئاسانی تێدا جێبوبێتەوە و وەك بەندی خانەیەك بەکارهێنرابێت؟!.

ب) لە گێڕانەوەکاندا ئەوە باسکراوە و تا ڕادەیەك زۆربەی نوسەری کتێبە مێژوویەکان و سیرە نوسەکان یەکدەنگ و هاوڕان - إلا مارحم ربي - لەسەر ئەوەی کە : لەناو بازاڕی مەدینەدا چەند چاڵێکی گەورە هەڵکەندرا و دواتر ئەو ژمارە زۆرەی جولەکەی تێدا کوژرا و هەر لەناو ئەو بازاڕەدا کران بە ژێر گڵەوە!!!

بەڕێزان سەرنجی ئەم خرافات و قسەبێ ناوەڕۆك و دوور لە ڕاستیانە بدەن و ئەو جا خۆتان بە ئەقڵ و إنصافەوە بڕیار بدەن.

ژمارەیەکی زۆری ئاوەها کە لەنێوان (٦٠٠ – ٩٠٠) کەسدابوون هەروەك وتراوە، چۆن لەناو شوێنێکی زیندوی نیشتەجێبوون و جێگەی پۆیشتن و مامەڵەکردن و سەرە ڕێگەی ژن و منداڵ و کاسپی کردنی وەك بازاڕی مەدینەدا ئەم ڕەشەکوژیو کۆمەڵ کوژەیە ئەنجام درا؟!

ئایا بۆ لەناو قەڵاکانی خۆیاندا ئەو ناپاکانە لەگەردنیان نەدرا؟! چۆن لەبەر چاوی خەڵکی بە گشتی و ژن و منداڵەکانیان ئەم لافاوی خوێنە بەرپاکرا؟!

بۆچی ئەو ژمارە زۆرەیان نەبرد بۆ لای ئەو چاڵانەی کە بە چواردەوری مەدینەدا هەڵیانکەند لەکاتی هێرشی دوژمنەکاندا بۆسەر مەدینە؟! کە ئەمەیان زۆر ئاسانتر بوو بۆ موسڵمانان چونکە چاڵەکان (خندق) ئامادەبوون، لەکاتێکدا کە ئاشکرایە هاوەڵان نزیکەی یەك مانگی تەواو سەرقاڵی هەڵکەندنی ئەو چاڵەبوون بەچواردەوری مەدینەدا، دواتریش پشویان نەدا و خێرا بانگ کرانەوەی بۆ جەنگی بەنی قورەیزە؟!

ئایا دووبارە هەڵکەندنەوەی ئەو چاڵە زۆرانە لەناو بازاڕی مەدینەدا لەسەر هاوەڵان کارێکی هێجگار سەخت و دژوار نەبووە؟!.

ت) گەر ئەم کارە کرابێت کە پێشتر باسمان کرد و لەبازاڕی مەدینەدا ئەم گۆڕە بە کۆمەڵە سازێنرابێت، ئایا لە ئێستادا کوا شوێنەواری ئەو گۆڕە بە کۆمەڵەی کە (٦٠٠ – ٩٠٠) جولەکەی ناپاکی بەنی قورەیزەی تێداکران بە ژێر خاکەوە؟؟

لەکاتێکدا کە ئەو کەسەی سەردانی مەدینەی کردبێت هیچ جێگە و شوێنەوارێك نیە کەدەستکاری کرابێت و سڕابێتەوە، بەڵکو (مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ چاڵەکانی شەڕی (خندق)، گۆڕستانی بەقیع - مزگەوتی قباو دوو قبلە (قبلتین) و گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود و دەیان جێگەی تر لە جێگەی خۆیانن و ڕۆژانە عومرەکاران و خەڵکانی تریش سەردانیان دەکەن!!

بەڵام هەتاوەکو ئێستا کێ باسی لەبونی گۆڕێکی بەکۆمەڵی وەها گەورە کردووە لەناوی شاری مەدینەدا کە (٦٠٠ – ٩٠٠) کەسی لەخۆ گرتبێت؟!!

بۆچی جولەکەکان یان شوێنەوار ناسەکان بە درێژایی سەدان ساڵ هەوڵی هەڵدانەوەی ئەو گۆڕانەیان نەداو ڕوفاتە سەر قرتاوەکانیان دەرنەهێنایەوە لەشوێنێکی تایبەتی و شایستەدا بەخاکیان نەسپاردن؟!!

بۆ جولەکەکان باس لە ڕووداوی هەڵبەستراوی (هولوکوست) دەکەن و گوێچکەی دنیای پێ پڕ دەکەن لە کاتێکدا کە بنەمایەکی ڕاستەقینە و دروستی نیە؟! ئەی بۆچی باسی ئەم کۆمەڵ کوژیە ناکەن لە شاری مەدینە و سەردەمی خۆشەویستدا؟!

پ) گەر لە گۆشەنیگایەکی ترەوە سەرنجی ئەم کارە بدەین کە لەناو بازاڕی مەدینەدا ئەنجام دراوە، دووبارە دەیان پرسیاری بێ وەڵامی ترمان بۆ دروست دەبێت، لەوانە:

ئایا لە شوێنێکی وەهادا کە جێگەی کاسپی کردن و نیشتەجێ بوونی خەڵکیە (المنطقة السكنية) بوونی گۆڕی بە کۆمەڵ لەڕووی (تەندروستی - دەروونی - ئارامی ناوشار چەندە کاریگەری سلبی و خراپ لەسەر ئەو کۆمەڵگایە دروست دەکات و خەون و خەیاڵی نادروست لەناخیاندا بەرهەم دێنێت؟!

لەڕووی تەندروستیشەوە بەهەمان شێوەیە کە زیاتر لە شەوانی تاریکدا دڕەندەکان دەگەڕێن بۆ خواردن، ئایا بونی گۆڕی بە کۆمەڵ لەناو بازاڕێکی ئاوادا هۆکاری کۆبونەوەی دڕندەکان نەبووە بۆ هەڵدانەوەی ئەو گۆڕانە و دەرهێنانی لاشەی ئەو مردوانە و بەمەش ڤایرۆسی نەخۆشی و دەرد و میکرۆب لەو شارەدا هەڕەشەی گەورە دەبوون لەسەر دانیشتوانەکەی و بڵاوبونەوەی پیسی و نەخۆشی بێ چارەسەر؟!

هـ) هەندێك لە سەرچاوە مێژوویەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە هەردوو هاوەڵی بەڕێز (علی کوڕی أبو طالب) و (زوبەیری کوڕی عەوام) هەڵساون بەم کاری مل قرتاندنە، ئەویش لەماوەی (٢ - ٣) ڕۆژدا (٦٠٠ - ٩٠٠) نەفەر سەر قرتاو بکەن و بیانکوژن، لە کاتێکدا کە هۆکاری کوشتنی مرۆڤ لەو سەردەمەدا وەك ئێستا نەبووە و تەنها شمشێر بووە؟!

چۆن ئەو دوو هاوەڵە خۆشەویستە بە کوشتنی ئەم ژمارە زۆرە کاریگەری سلبی لەسەر دەروونیان دروست نەبوو، لەکاتێکدا کە سروشتی مرۆڤەکان ناگونجێت لەگەڵ ڕشتنی ئەو ڕووبارە خوێنەدا؟

لێرەدا پێویستە ئەو جیاوازی و پاڵنەرانە بزانین کە لەنێوان کوشتنی مرۆڤەکاندا هەیە لەکاتی جەنگ و لەدوای جەنگ، لەکاتی جەنگدا هۆکاری گەورە و پاڵنەری بەهێز لە کوشتنی دوژمنەکاندا بریتیە لە بەرگری کردن لە خۆت، چونکە گەر تۆ ئەو لەناو نەبەیت ئەوە بێگومان ئەو لەناوت دەبات، بەڵام لەکاتی جێبەجێ کردنی کوشتنی کەسێکدا یان ژمارەیەکی زۆردا، ئەو هۆکار و پاڵنەرانەی کە لەشەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەکاندا هەیە، نامێنێ و کۆتاییان پێ دێت!!!

خاڵی چوارەم: با بچینە سەر بڕگە بڕگەی ڕووداوەکان و ئەوجا پرسیاری لۆژیکی و واقعیان لەبەرامبەردا بکەین، یەکێك لەو بڕگانە بریتیە لە بەڵگە هێنانەوە بەڕیوایەتەکانی (بخاری و مسلم) لەسەر ئەم کوشتارگەیە!!! بەڵام ئایا ڕاستی هەواڵەکان و ژمارەی کوژراوەکان و چۆنیەتی کوشتنیان بەو شێوەیەی کە لە گێڕانەوە مێژوویەکان و چۆنیەتی کوشتیان بەو شێوەیە کە لە گێڕانەوە مێژوویەکان و کتێبەکانی سیرەدا هاتووە، بە هەمان شێوە لە ڕیوایەتەکانی هەردوو پێشەوا (بخاری و مسلم) یشدا هاتوون و باسکراون؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بێگومان نەخێر ئەویش بەم بەڵگانە:

١) بەهیچ جۆرێك ژمارەی کوژراوەکانی بەنی قورەیزە لە هیچ کام (بخاری ومسلم)دا باسیان لێوە نەکراوە بەتەنها زانای پایەبەرز (إبن إسحاق) لە نوسینەوەی سیرەدا باسی کردووە ئەویش بەبێ سەنەدێکی نەپچڕاو کە بگاتەوە پێغەمبەر ﷺ.

بەڵگەش بۆ ئەمە ساغ نەبوونەوەی ئەو ژمارەیە کە فرە بۆچونن لەسەری، هەروەك دەوترێت (٦٠٠ یان ٧٠٠ یان ٨٠٠ یان ٩٠٠) کەس بووبن!!! لێرەدا سەرنج دەدەیت نازانیت باوەڕ بەکام ژمارەیان بێنیت و بە بەڵگە باسی لێوە بکەیت.

تەنها ڕیوایەتێك كە ڕاست بێت لەسەر ئەم ژمارەیە و لەهەمان كاتیشدا سەنەدەكەی نەپچڕاو بێت و تەواو بێت بریتیە لە لێكۆڵینەوەی (حمید بن زنجوی) لە كتێبی (الاموال) كە لە (إبن شهاب)ەوە بەسەنەدێكی ڕاست ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: (فقتل منهم أربعون رجلاً)[1] واتە: لەو ڕۆژەدا تەنها (٤٠) كەسی لە جولەكەكانی بەنی قورەیزە كوژران بێگومان ئەوانەش بریتیبوون لەسەر گەورەكانیان كە خیانەتیان كرد)

٢) گەر سەرنجی گێڕانەوەكەی (بخاری و مسلم) بدەین، لە كاتێكدا كە باس لەو حوكمە دەكەن كە (سعدی كوڕی معاذ) (رضي الله عنه) دەربارەیان دای زۆر بە ئاشكرا دیارە كە دەڵێت: (فاءني أحكم فيهم أن تقتل المقاتلة..) واتە: فەرمانی من دەربارەیان بریتیە لە كوشتنی ئەوانەیان كە شەڕیان كردووە و تاوانباری سەرەكی بوون و دەستیان هەبووە لە شكاندنی پەیمانەكان و پەلی قورەیش و عەرەبەكانی تریان گرت و كۆیانكردنەوە بۆ سەر مەدینە و لەناو بردنی موسڵمانان!!!

سەرنج بدە!!! ئایا لێرەدا هیچ باسێكی ژمارەی كەسەكانی تێدایە كە دەبێت بكوژرێن؟!.

ئایا لە حوكمەكەی (سعد) باس لەمە كراوە كە هەر چیەك موی لێ هاتبێت لەنێرینەكان دەبێت بكوژرێت و لە گەردنی بدرێت هەروەك لە ڕیوایەتە مێژوویەكان و كتێبی سیرەكاندا یان بە ئاشكرا و بەبێ هیچ تەم و مژێك لە فەرموودەكەدا باس كراوە كە (سعد) وتوویەتی: (فاءِني أحكم فيهم أن تقتل المقاتلة)!!

خاڵی پێنجەم: كاتێك بەسەرهاتەكان و نوسینەوە مێژووییەكان دەخوێنیتەوە لەسەر جولەكاكانی بەنی قورەیزە ئەو هەستەت تێدا دروست دەبێت، كە دەستی جولەكە لەنوسینەوەی ئەو مێژوە ترسناكەدا هەبێت. ئەویش بەمەبەستی ئەوەی كەبەتەواوی خەڵكی بڵێن لەهەموو سەردەم و كاتەكاندا (ئێمە گەلێكی وەلانراو و ماف خوراو و خوێن ڕژاو بوین و بەردەوام قوربانی دەستی ستەم كاران بوین

---

[1] الاموال لابن زنجويه، باب الحكم في رقاب أهل الزمه ٤٦١.

بەدرێژایی مێژوو، کەوابێ بونی دەوڵەت و قەوارەی سەربەخۆو سنوری جوغرافی و ئاڵا و ..) گەر بۆ کەس ڕەوا نەبێت ئەوا بو ئێمە ڕەوایە و مافی خۆمانە، بۆ ئەوەی جارێکی تر و لەسەر دەستی هیچ کەس و دەوڵەتێکی تر دوچاری رەشە کوژی و هۆلۆکۆست نەبینەوە.

خاڵی شەشەم: جولەکەکان لەنوسینەوەی مێژووی خۆیاندا زۆریان کارەسات و ڕوداوی دڵتەزێن نوسیوەتەوە کەبەسەریان هاتوە لەسەر دەستی دەسەڵاتداران، بەڵام هیچ مێژوو نوسێکی جولەکە ئەم ڕوداوەی نەنوسیوەتەوە و باسیان لێوە نەکردوە، خۆ ئەگەر جولەکەکانی ئەم سەردەمە باس لە ڕوداوێکی ئا لەم شێوەیە بکەن لەڕۆژگاری ئێستادا، ئەمە بێگومان پشت بەڕیوایەتەکانی (إبن إسحاق) دەبەستن، نەك کتێب وسەرچاوە مێژوویەکانی خۆیان.

خاڵی حەوتەم: ئایا بۆچی پێغەمبەر ﷺ، جولەکەکانی (بەنو قەینوقاع) و (بەنو نظیر )ی نەکوشت لەسەر ناپاکی و پەیمان شکاندنەکانیان؟ بەڵام ئەو ژمارە زۆرەی لە جولەکەکانی بەنی قریظە کوشت؟! خۆئەگەر پێغەمبەر ﷺ، ئاکاری کوشتن و لەناوبردنی هەبوایە دەبوو ئەو دوهۆزەی تریشی بەدەردی جولەکەکانی بەنی قریظە ببردایە!! بەڵام ئاشکرایە کەچۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردن..

خاڵی هەشتەم: گەر جولەکەکانی بەنی قریظە دەستی دووەم و نادیار بوون لەدژایەتی کردنی پێغەمبەر و مسوڵمانانداا لەشاری مەدینەدا، بەڵام خۆبە ئاشکرا عەرەبەکانی قورەیش و أبو سوفیان و هاوپەیمانەکان دەستی یەکەم و دوژمنی ئاشکرای پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان بوون بەدرێژای (٢٣) ساڵ بەبەردەوامی دژی موسڵمانان لەشەڕدابوون..

پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا بۆچی پێغەمبەر ﷺ لەدوای ڕزگارکردنی مەککە (فتح المكة) بەتەواوی دانیشتوانی مەککە فەرموو: ((إذهبوا فأنتم الطلقاء)) بەمانای

ئەوەی: بڕۆن هەموتان ئازادن و لێبوردنی گشتیتان بۆ دەرچوو!! بەڵام لەبەرامبەر بە جولەکەکاندا ئەم کارەی نەکرد؟!

ئەم گێڕانەوە ناڕاستەی کەپێشتر باسمانکرد کاتێك بەراوردی دەکەین بەڕەوتی ڕوداوەکان ئەوەمان پێ دەڵێت کە:

پێغەمبەر ﷺ بەسروشتی عەرەب بونی لەتەواوی عەرەبەکانی مەککە و چواردەوری خۆش بوو؟ بەڵام لەبەر ئەوەی کە جولەکەکان لەنەتەوەی عەرەب نەبوون ئەم کارەی لەگەڵدا ئەنجام نەدان و سزای دان!!

بێگومان ئەمە هەستی دەمارگیری و ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەپشتەوەیە کاریگەریان لەسەر تەنانەت نوسینەوەی مێژووی ئیسلامیش کردوە..

هەر ئەم هەستەناسیۆنالیزمە دەمارگیریە بوو کە (صدام) کاری پێدەکرد ئەویش بەوەی: کاتێك بەناوی ئەنفالەوە جینۆسایدی کوردی کرد ئافرەتەکانی بەتایبەت بردن و لەوڵاتان فرۆشتنی چونکە کورد بوون و عەرەب نەبوون!!

بەڵام کاتێك لەبەرواری ١٩٩٠/٨/٢ وولاتی کوەیتی داگیر کرد تەنها یەك ئافرەتی عەرەبی کوەیتی نەهێنا، هەتاوەکو دەستدرێژی بکرێتە سەریان و دواتر فرۆشتنیان پێوە بکرێت!!

ئەمەش لەبەر ئەوەی کوەیت لەنەتەوەی عەرەب بوون!!

بەهەمان شێوە گەر سەرنجی ئاکارە دزێوەکانی (داعش)یش بدەین لەم بوارەدا، هەمان ئاکاری بەدی (صدام)یان ئەنجامدا لەدوای ڕوداوەکانی حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤)ەوە. ئەویش بەم شێوەیە:

کاتێك ڕێکخراوی توندڕەوی (داعش) دەستیان بەسەر (موصل)و ناوچە عەرەب نشینەکانی ناوەڕاست و خواروی عێراقدا گرت، ئافرەتیان نەکردە غەنیمەی ئەو جەنگە و کڕین و فرۆشتنیان پێوە نەکردن، ئەمەش لەبەر ئەوەی عەرەب بوون. بەڵام کاتێك چونە ناوچەی شەنگال و دواجار دەستیان بەسەردا گرت (هەموو دەزانین) کە ئافرەتەکانیان بردنە بازاڕی شاری موصلّ و دەستیان کرد

بەفرۆشتنیان بە ﴿وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخۡسٍ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٍ﴾! ئەمەش بێگومان لەبەر ئەوەی کە کچانی یەزیدی کورد بوون و عەرەب نەبوون!!

لێرەوەیە کەتێدەگەین یەکێك لەئاکارەکانی عەرەبی ناسیۆنالیزم (دەمارگیر) ئەوە بووکە: لەهاو زمانی خۆیان ئافرەتیان نەدەبرد لەکاتی جەنگەکاندا، بەڵام بەپێچەوانەوە لەغەیری خۆیان یان دەبرد وکڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرد..)[1]

هەر لەبەر ئەمەیە کاتێك بەڕوداوە مێژوویەکاندا دەچینەوە سەبارەت بەم بەسەرهاتەو لێبوردنی عەرەبەکانی مەکەو سزادان و کوشتنی (٦٠٠-٩٠٠) پیاوی جولەکەی بەنو قریظه. دەبینین کەکاریگەری دەمارگیری عەرەبی چەندە؟ ڕەنگدانەوەی بە نوسینەوەی مێژووی ئیسلامی و ڕەوتی ڕوداوەکانەوە هەبوو..

لەکاتێکدا کەپێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك لەهەرە کارە گرنگ و سەرەکیەکانی بریتی بوولە دەرهێنانی ڕەگو فکرەی دەمارگیری لەناخی مرۆڤەکاندا بە:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ **(إنما انا رحمة مهداة)** ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾ ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ﴾ **(لافضل لعربي على عجمي ولا لعجمي على عربي ولا لأسود على ابيض ولا لأبيض على أسود إلا بالتقوى)** و دواتریش دەربارەی دەمارگیری فەرمووی **(دعوها فإنهاممتنة)** واتە: دەستبەرداری بن چونکە بەوێنەی لاکە مردارەوەبوو وەهایە و، لێی دوور بکەونەوە لەبەرئەوەی لەلای خوای مەزن سەنگ و بەهایەکی نیە..

**خاڵی نۆهەم:** یەکێکی تر لەو خاڵ و سەرنجانەی کەزۆر پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەین لەم ڕووداوەدا بریتیە لە:

---

[1] ئەم خاڵە یەکێکە لە قسە و تێگەیشتنە کانی بەڕێز: مامۆستا عبدالرحمن صديق(نوسەر و لێکۆڵەر) دەربارەی ئەم باسە.

خۆبەدەستەوەدان (التسلیم) ی جولەکەکانی بەنی قریضە و فڕێدانی چەکی دەستیان و، دابەزینیان لەقەڵاکانیان و، ڕازی بوون بەو حوکمەی کە گەورەی ئەوسیەکان (سعدی کوڕی معاذ) دەربارەیان دەیکرد. وە قورئانی پیرۆز وێنای ئەم حاڵەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمۡ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ فَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ وَتَأۡسِرُونَ فَرِيقٗا ﴿٢٦﴾ وَأَوۡرَثَكُمۡ أَرۡضَهُمۡ وَدِيَٰرَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُمۡ وَأَرۡضٗا لَّمۡ تَطَـُٔوهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا ﴿٢٧﴾﴾ الأحزاب: ٢٦-٢٧.

واتە: هەر ئەو زاتە بەدەستی قودرەتی خۆی جولەکەکانی دابەزاند (لەخاوەن کتێبەکان، کە جولەکەکانی بەنی قریضة) بوون لەقەڵاکانی خۆیان، پاشان ترس و بیمی فڕێدایە ناو دڵیانەوە، هەتا سەرەنجام دەستەیەکیان بەدەستی ئێوە کوژران (کەسەرگەورەکانیان بوون). هەروەها دەستەیەکیشیان بەدیل گیران، سەرەئەنجام تەواوی ئەو زەوی و زار و سامانەی کەهەیانبوو خوای مەزن بەخشی بەئێوە، هەروەها جێگەو شوێنی تریشی کەهێشتا ئێوە نەگەیشتبونە سەری، بێگومان هەمیشەو بەردەوام خوا دەستی بەسەر هەموو شتێکدا دەڕوات.

گەر سەرنجی ئەم دوو ئایەتە بدەین لەسورەتی(أحزاب)دا، زۆر بەئاشکرا گوزارشت لەوبەسەرهاتە دەکات لە (دابەزینی جولەکەکانی بەنی قریضة لە قەڵاکانان بەهۆری ئەو ترسە زۆرەی کە خوای مەزن فڕێی دایە دڵەکانیانەوە و دواتر لەسەرەنجامدا کۆمەڵێکیان بەسزای دادپەروەرانە گەیەنران و کوژران، (کەبریتی بوون لە سەرانی هۆزەکە) و ئەوانەشی کەمانەوە و تەسلیم بوون، قورئانبەدیل(أسیر) ناویان دەبات، هروەك دەفەرموێت: ﴿فَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ وَتَأۡسِرُونَ فَرِيقٗا ﴿٢٦﴾﴾.

(لەسەر مەسەلەی کوژراوەکان و ڕاسترین لێکۆڵینەوەی زانایان قسەمانکرد..)

ئەوەی کەمابێتەوە لەئایەتەکەشدا بەئاشکرا ئاماژەی پێکرابێ، بریتیە لەدیلەکان(الأسارى). بابچینە خزمەتی قورئانی پیرۆز و یاساکانی (دیل )، هەتاوەکو بۆمان ئاشکرا ببێت کە ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی چۆن مامەڵەی لەگەڵ دیلدا کردوە و، پاشان پێغەمبەریش لەگەڵ ئەو (دیلانەی) بەنی قورەیزەدا چۆن مامەڵەی کرد؟.

ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی بە (٥) شێوە مامەڵە لەگەڵ دیلدا دەکات کەئەوانیش بریتیە لە:

١) یەکێك لەو ڕێگایانەی کەئیسلام دەیگرێتە بەر دەربارەی دیلەکانی جەنگ، بریتیە لە مامەڵکردن لەگەڵیاندا.. ئەویش لەژێر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە قورئانیەی کەدەفەرموێت:

﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ۝ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ۝﴾ الإنسان :٨-٩.

واتە: (بەندە باشەکانی خوا) خواردنێك کەحەزیان لێیەتی دەیبەخشن بەنەدار و هەتیو و دیل، (لەدڵی خۆیاندا پێیان دەڵێن) بێگومان تەنها لەبەر خاتری خوا، خواردنتان دەدەینێ نەپاداشت و نەسوپاسگوزاریمان ناوێت..

بەهەمان شێوە پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی چۆنیەتیماڵەکردن لەگەڵ دیلەکاندا(الأسارى) دەفەرموێت: (إستوصوا باالأسارى خيراً )[١] بەمانی ئەوەی کەلەگەڵ دیلەکاندا باش ڕفتار بن..

گومانیش لەوەدا نیە کەتەواوی زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کەپێویستە لە ڕووی خواردن و خواردنەوە و بەرگ و پۆشاك و جێگە و ڕێگاو هەر پێویستیەکی دیکەوە مامەڵەی باش لەگەڵ دیلەکاندا بکرێ و ڕێزیان لێبگیرێ و ئازار نەدرێن

---

[١] أخرجه الطبرانی في الصغير برقم (٤٠٩).

٢) دووەم ڕێگای ئیسلام لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ (دیل)دا بریتیە لەم دوو ڕێگەیە:

أ- ئازادکردنیان بەشێوەیەك منەتباریان بکەن..

ب- لەبەرامبەر ئازادکردنیاندا پارەیەکی دیاری کراو وەربگرن. قورئان بۆ هەردوو حاڵەتەکە دەفەرموێت:

﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَاْ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾﴾ محمد:٤.

واتە: هەرکات بەرەنگاری کافران بونەوە (لە جەنگدا) لە گەردنیان بدەن، (بێگومان لەو سەردەمەدا تەنها ڕم و شمشێر هۆکاری جەنگ بوون) هەتا ئەو کاتەی کە لەپەلو پۆتان خستن، ئەوجا بەدیلیان بگرن، پاشان یان بەچاکە ئازادیان بکەن، یان بەقەرەبوو بەریان بدەن..

٣) شێوازێکی تر بریتیە لەوەی کەلەبەرامبەر ئازادکردنی دیلدا خزمەتێکی بە مسوڵمانان پێ بکەیت لەبەرامبەر ئازادکردنیدا..

هەروەك پێغەمبەری خوا لەجەنگی بەدردا ئەم کارەی ئەنجامداو ئازادکردنی دیلەکانی وابەستە کردەوە بەوەی کەهەریەکەیان (١٠) منداڵی مسوڵمانان فێری خوێندەواری بکەن..

**((عن إبن عباس: قال: كان ناس من الأسرى يوم بدر لم يكن لهم فداءً فجعل رسول الله ﷺ فدائهم ان يعلموا اولاد الأنصار الكتابة))**[١]

٤) ڕەوایەتی کوشتنی تاوانبارانی جەنگ (مجرمی الحرب) بێگومان ئەمەش یەکێکی ترە لەڕێگاکان و ئەوانەی کەتاوانباری جەنگ بوون و ناپاکی گەورەیان

---

[١] رواه أحمد برقم (٢٢١٦) تعليق شعيب الأرنؤوگ: حسن.

ئەنجامداوە دەکوژرێن هەروەك کوشتنی سەرانی جولەکەکانی (بەنی قریظة) دوای ڕازی بونیان بەحوکمی (سعدی کوڕی معاز)، ئەمەش نەك لەئیسلامدا بەڵکویاسای جەنگ بووە لەهەموو کات و سەردەمێکدا بەئێستەشەوە کەتاوانبارانی جەنگ و کەسە دیار و سەرکردەکان کەڕابەرایەتی جەنگیان کردوە دەکوژرێن و یاسای دیل نایان گرێتەوە.

٥) لەحاڵەتێکدا کەدوژمنان دیلەکانی مسوڵمانانیان کردەکۆیلە، یان کوشتیانن، ئەوە بۆ ئەو حاڵەتەدیاری کراوە سەپێنراوە، مسوڵمانانیش دەتوانن هەمان کار لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەن کە(دیل)ن لەلایان..

ئەمەش وەك کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوە (رد الفعل والمعاملة بالمثل). چونکە خوای مەزن دەفەرموێت:

﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ البقره: ١٩٤.

واتە: هەرکەس دەست درێژی کردە سەرتان بەهەمان شێوەی خۆی بەر پەرچی بدەنەوە بەڵام لەسنوری شەرعدا..

بەڵێ ئابەم شێوەیە (إسلام) بەشێوەیەکی گشتی مامەڵە لەگەڵ دیلەکاندا دەکات، بۆچونی جیاوازی زانایانیش لەسەر نەبونی حوکمێکی دیاری کراوی شەریعەت لەوبارەوە، هەرچەندە کەزۆربەی زانایان ڕایان وەهایە کەپێشەواوحوکمڕانی مسوڵمانان بۆی هەیە کەیەکێك لەوبژاردانەی کەپێشتر باسمانکرد دیاری بکات بۆ مەبەستی مامەڵە کردن لەگەڵ(دیلەکاندا)[1]..

خاڵی دەیەم: گەر بڕوا بەوە بکەین کە پێغەمبەری خوا ڕازی بوو بەوەی کەهەر کەس لە نێرینەکانی بەنی قورەیزە گەر موی لێهاتبێت بکوژرێت!! کەوابێ لەم کارەدا چەندە ڕەچاوی دادپەروەری کراوە؟!

---

[1] ئەم خاڵە لەکتێبی( بیر و ڕاو ڕەفتارە پەرگیرەکانی ڕێکخراوی داعش )ی مامۆستای بەڕێز (علی باپیر) وەرگیراون، لەمەسەلەی چۆنیەتی مامەڵکردنی ئیسلام لەگەڵ دیلەکاندا.

ئایا ئەم کارە گەر وابێت پێچەوانەی ئەو ئایەتەی قورئان نیە کەدەفەرموێت:

﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ فاطر:١٨.

واتە: هیچ تاوانبارێك تاوانی یەکێکی تر هەڵناگرێت..

گەر سەرانی جولەکەکانی بەنی قورەیزە سەرگەورەکانیان پەیمان شکێن و ناپاك و تاوانباری سەرەکی جەنگ بوون و زیان گەیەنەر بوون بەمسوڵمانان، کەوابێ دەبێت هەرخۆیان باجی تاوانو ناپاکیەکانی خۆیان بدەن.. نەك ئەو گەنجانەی کەئاگاداری کاری چەپەڵی ئەمان نەبوون و دەشگونجێت هیچ خۆشحاڵ نەبوبێتن بەڕفتار و کرداری سەرکردەکانیان.

بێگومان ئەمە بەهیچ شێوەیەك لەڕەفتار و ئاکار و ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر نەبووە کە کەسانێك سزا بدەن بەهۆکاری هەڵەی کەسانێکی ترەوە، بەڵکو ئەمە ڕەوشت و سیاسەتیکەسانی دوور لەخودا و دەوڵەتە زلهێزەکان بووە لەهەموو کات و سەردەمێکدا، نزیکترین و زیندوترین نمونەش لەسەر ئەم کارە بریتی بوو لەو ئابلۆقە ئابوریەی (الحصار الإقتصادي) کە ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بڕیاریان لەسەردا بۆ گەلی عێراقی لە دوای داگیرکردنی کوەیت لە لایەن (صدام)ەوە.

زیاتر لە (٧) ساڵ هەموو گەلی عێراقی بە ئێمەی کوردیشەوە باجی سیاسەتە چەوت و هەڵەکانی حیزبی بەعسمان دا و لەوپێناوەدا هەزاران کێشەی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و کارەساتی گەورە و تراژیدیای لێکەوتەوە کە زۆربەمان دەزانین !! بەڵام ئایا (صدام) و خانەوادە و چڵکاو خۆرەکانی چواردەوری چ کاریگەریەکی ئەو سزایانەی ئەمەریکا و هاوپەیمانە کانیانی بەسەرەوە بو؟! ئەمریکا و وولاتانی ڕۆژئاوای ئازادی خواز و دیموکراتی و بانگەشە لێدەری مافی مرۆڤ لەبری (صدام) و داروودەستە ستەم کارەکەی، سزای هەموو گەلی (عێراق)یان دا و لەبرساندا فێری هەزاران ڕەوشتی نزم و دزێویان کردن و باجی هەڵەکانی (صدام) یان بەدانیشتوانی عێراق دا...

ئەمە ڕەوشت و ئاکار و سیاسەتی زلهێزەکان بووە بەدرێژایی مێژوو نەك سیاسەت و ڕەوشتی پێغەمبەر و موسڵمانان.

**فەتح کردنی قەلاّکانی خەیبەر و هۆکارە سەرەکیەکانی ئەم جەنگە:**

دوا بابەت لەپانۆرامای ژیانی جولەکە لەسەردەمی خۆشەویست و شاری مەدینەی پیرۆزدا کە گوزەری بەناودا بکەین بریتیە لە:

فەتح کردنی قەلا سەختەکانی خەیبەر و گرنگترین هۆکار و فاکتەرەکانی ئەم جەنگە ئەویش بەم شێوەیە:

((خەیبەر شارێکی گەورەی پڕ لە قەلاّ و باخی خورما و مەزار و کشتوکاڵ بوو، لە دوری (٦٠ بۆ ٨٠) میلەوەیە لە شاری مەدینە و کەوتۆتە بەشی باکوری یەوە، لە ئێستادا گوندێکە و کەشوهەوایەکی بۆگەنی پیسی هەیە...)[1]

**هۆکارە گرنگەکانی ئەم جەنگە:**

بێگومان جولەکەکانی خەیبەر هۆکاری سەرەکی و ئاگر خۆشکەر و پاڵنەری سەرەکی بوون، بۆ خرۆشاندنی حەزی پیلان گێڕی و، پەیمان شکێنی و ئاژاوە و خیانەتی جولەکەکانی نێو مەدینە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا کە ئەنجامیاندا. هەر جولەکەکانی خەیبەر بوون کە سەرجەم تیرە و هۆز و خێڵە عەرەبەکان، (الأحزاب)یان لە جەنگی (خندق)ی ساڵی (٥)ی کۆچیدا هاندا و، کۆیانکردنەوە بۆسەر مەدینە بە ئامانجی لەناوبردنی موسڵمانان.

بەڵێ هەر جولەکەکانی خەیبەر بوون کە هانی سەرانی جولەکەکانی (بەنی قریظة) یان دا، بۆ خیانەت کردن و پەیمان شکێنی. لەسەرو هەموو ئەم ناپاکی و خیانەتانەوە، جولەکەکانی خەیبەر خۆیان سازدا بوو بۆ شەڕ و کوشتار و بەم کارە چەپەڵانەیان، جەنگێکی دەرونی نەخوازراویان توشی موسڵمانان کرد بوو، تا ئەو

---

[1] گوڵاوی سەرمۆر (صفي الدين مبار كفوري) و: بكر حمه صديق.

ئەندازەیەی کە هەوڵی تیرۆر کردنی خودی پێغەمبەریان دا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون!!

پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان زۆر لە مێژبوو بۆ دەرفەتێکی ڕەخساو دەگەڕان هەتاوەکو جولەکەکانی خەیبەر تەمبێ بکەن و نینۆکی درێژیان بکەن، بەڵام دوژمنێکی گەورەتر لەمان لەپێشتربوو کە یەکلابینەوە لەگەڵیدا کە ئەویش (قورەیش)بوو..

کاتێك کە پەیمانی حودەیبیە لە ساڵی (٦) کۆچیدا ئیمزا کرا لەنێوان پێغەمبەر ﷺو، سەرانی قورەیش دا و بڕیاری ئاگربەست مۆرکرا کە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ شەڕی نێوانیان ڕابگرن و هێرش نەکەنە سەر یەکتر، دەرفەتێکی باش ڕەخسا بۆ سزادانی ئەو پەیمان شکێن و ناپاك و تاوانبارانەی خەیبەر

**دەرچوون و بەڕێکەوتن بەرەو قەڵاکانی خەیبەر:**

(إبن إسحاق) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای گەڕانەوەی لە (حودەیبیە) مانگی (ذي الحجة) و هەندێك لە مانگی موحەڕەمیش تێپەڕیبوو.. بەڕێکەوتن بەرەو خەیبەر.

زانایانی تەفسیر دەڵێن: فەتح کردنی خەیبەر یەکێك بوو لەو بەڵێنە خواییەی کە دابوونی بە پێغەمبەر ﷺ هەروەك قورئان دەفەرموێت ﴿وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَـٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢٠﴾الفتح:٢٠.

واتە: خوای گەورە بەڵێنی دەستکەوتێکی زۆری پێداون کە لە دوژمنانی دەستێنن.. ژمارەی هاوەڵان لەم جەنگەدا (١٤٠٠) جەنگاوەر بوون بە سەرۆکایەتی و ڕابەرایەتی پێغەمبەر ﷺ..

ئەم ژمارەیە تەنها بریتی بوون لەو هاوەڵانەی کە لە (بەیعەتی رضوان)دا و لەژێر درەختەکەدا بەڵێنیان دا بە پێغەمبەر ﷺ، کە بجەنگن لە پێناو خوێنی

(عثمانی کوڕی عەففان) دا،[1] دیاری کردنی ئەم ژمارەیەش بە فەرمانی پێغەمبەر بوو ﷺ ئەویش بۆ جیاکردنەوەی دووڕوان و دڵنەخۆشەکان لە هاوەڵان. هەروەك فەرمووی ﷺ (تەنها شەیدایانی جیهاد نەبێت نابێت کەس لەگەڵیاندا بڕواتە دەرەوە)

کاتێك دووڕوان جیاکرانەوە لە هاوەڵان، سەرکردەی دووڕوان (عبدالله ی کوڕی ئوبەری کوڕی سەلول) هەواڵی دا بە جولەکەکانی خەیبەر، کە (محمد) و هاوەڵانی بەرەو لای ئێوە دێن و ئاگاداری خۆتان بن، هیچ لێی مەترسن چونکە ئێوە ژمارەتان زۆرە و چەك و تفاقی جەنگتان زۆرە، لەبەرامبەریشدا (محمد)یش چەند کەسێکی پەرتەوازەی کەمن و توانای ڕوبەڕووبوونەوەیان نیە لەگەڵ ئێوەدا..

کە جولەکەکانی خەیبەر بەمەیان زانی خێرا نوێنەریان نارده لای (غەطەفان) بۆ مەبەستی یارمەتیدان و کۆمەکی، چونکە هاوپەیمانی جولەکەکانی خەیبەر بوون و دژ بە موسڵمانەکان هەموو کۆمەکیەکیان دەکردن. (غەطەفان) بەمەرجی ئەوە ئەم هاوکاری و یارمەتیەیان قبوڵکرد کە: ئەگەر سەرکەوتن بەسەر موسڵماناندا نیوەی بەروبومی خەیبەریان بدەنێ!!

### ڕێگای چوون بەرەو خەیبەر:

پێغەمبەر و هاوەڵان لە ڕۆشتیاندا بەرەو خەیبەر شاخی (عەصر)یان گرتەبەر و، دواتر بەرەو جێگەیەك کە پێی دەوترا (رجیع).

لە (رەجیع)ەوە تا (غەطەفان) ماوەی شەو و ڕۆژێك ڕێگەبوو بە پیادە، کە (غەطەفان) هەواڵیان پێگەشت کەوتنە ڕێ بەرەو خەیبەر، بۆ یارمەتی دانی جولەکەکانی خەیبەر. کاتێك گەیشتنە نیوەی ڕێگە، دەنگ و باسی ئەوە لەناویاندا بڵاوبویەوە کە موسڵمانەکان داویانە بەسەر ماڵ و منداڵەکانیاندا و سەروەت و

---

[1] بۆ زانیاری لەسەر ئەم باسە سەردانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکە دەربارەی پەیمانی حودەیبیەو ڕوداوەکانی

سامانیان کەوتۆتە دەستی موسڵمانان!! هەر لەبەر ئەمەبوو کە خێرا گەڕانەوە و نەیانتوانی هیچ کۆمەکیەکی جولەکەکانی خەیبەر بکەن...

بەم شێوەیە جولەکەکانی خەیبەر بەبێ پشت و پەنا مانەوە و بێ ئومێد بوون لە یارمەتی و کۆمەکی (غەطەفان).

ئەو شەوەی کە بۆ سبەینێ شەڕی خەیبەری تێدا قەوما، موسڵمانەکان لە نزیک خەیبەرەوە شەویان کردەوە، جولەکەکان هەستیان بەم نزیك بونەوەیەی موسڵمانەکان نەکرد، یەکێك لە ڕەوشتە مەزنەکانی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی جەنگدا ئەوەبوو کە هەرگیز بەشەو نەیدەدا بەسەر دوژمندا هەتا بەرەبەیان ڕۆژ هەڵدەهات، کاتێك ڕۆژبویەوە جولەکەکانی خەیبەر بە پاچ و خاکەناز و ئەسبابی جوتیاریەوە بەرەو کێڵگە و زەویەکانیان کەوتنە ڕێ، بەڵام کە بینیان لەشکری موسڵمانان لەوێدان هاواریان کردوو ڕایانکردەوە ناو قەڵاکانیان.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

(الله أكبر .. خەیبەر وێران بوو.. الله أكبر.. خەیبەر وێران بوو.. خوایە ڕۆژێکی خراپیان بەسەردا بهێنیت)[1]

بەڵێ کە شەویان بەسەردا هاتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەیانی ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست کەسێك کە لەسەر دەستی ئەودا ئەو قەڵایانە فەتح دەکرێت، خوا و پێغەمبەری خۆش دەوێت و خوا و پێغەمبەریش ئەویان خۆشدەوێت..

کە بەیانی داهات هەموو هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا ڕاوەستان، هەموویان ئاواتیان دەخواست ئاڵاکەیان بدرێتە دەست..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کوا (علی کوڕی ئەبو طالب) ؟!

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چاوی دەیەشێت.[2]

فەرمووی بنێرن بەشوێنیدا و دواتر هێنایان و پێغەمبەری خوا ﷺ تفی پیرۆزی خۆی ـ وەك موعجیزەیەك ـ دا لە چاوانی (علی) و بەیارمەتی خوا گەورە چاوانی

---

[1] صحيح البخاري (باب: غزوه خيبر/ ج(٢) ص(٦٠٣ – ٦٠٤).

[2] إبن هشام ج(٢) ص(٣٢٩).

چاك بونەوە بەجۆرێك كە وەك ئەوەی ئازارێكیان نەبووبێت.. دواتر ئاڵاكەی دایە دەستی و ئامۆژگاری كرد و پێی فەرموو:

لەسەر خۆ برۆ و پێش ئەوەی جەنگیان لەگەڵدا بكەیت بانگیان بكە بۆ إسلام و موسڵمان بوون، گەر موسڵمان بوون پێیان بڵێ ئەرك و مافەكانیان كامانەن، چونكە وەڵڵاهی گەر خوای گەورە بە هۆكاری تۆوە یەكێك هیدایەت بدات ئەی (علی) ئەوە بۆ تۆ چاكترە لەووشتری (سور) – كە لەو زەمەنەدا وشتری سور یەكێك بووە لە شتە بەنرخ و گرانبەهاكان –).

شاری خەیبەردوو بەش، بەشێكیان لە پێنج قەڵا پێكهاتبوو كە بریتبوون لە :

١) قەڵای (ناعم)

٢) قەڵای (صعب)

٣) قەڵای (زوبیر)

٤) قەڵای (أبی)

٥) قەڵای (نزار).

بەشی دووەمیشیان سێ قەڵای تێدابوو كە بریتیبوون لە:

١) قەڵای (قموص)

٢) قەڵای (وەطیح)

٣) قەڵای (سلالم).

شەڕ دەستی پێكرد و یەكەم قەڵا كە موسڵمانەكان هێرشیان كردە سەر قەڵای (ناعم) بوو، چونكە ئەو قەڵایە هێڵی بەرگریی و ستراتیژی یەكەمی جولەكەكانی خەیبەر بوو، دواتر قەڵای (مرحب) یەكێكی تربوو لە قەڵا سەختەكانیان و زیاتر لە هەزار كەسی تێدابوو.

شەڕ و پێكدادانی قورس و خوێناوی لە (٥) قەڵاكەی یەكەمدا زۆربوو، سەرەنجام بە پشتیوانی خوای مەزن سەرجەمی قەڵاكان گیران و كەوتنە دەستی موسڵمانانەوە، بەنیسبەت (٣) قەڵاكەی تریشەوە جیاوازی لەنێوان سیرەی نوسەرەكاندا هەیە لە سەر چۆنیەتی فەتح كردنی.

هەندێکیان ڕایان وەهایە کە ئەم (٣) قەڵایە بەشەڕ گیران، هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن: پاش دانوستان دەستیان بەسەردا گیرا..

بەهەر حاڵ هەر کامیان بووبێت، پێغەمبەر ﷺ دوای (٥) قەڵای یەکەم، ئابڵۆقەیەکی توندی سەپاند بەسەریاندا و (١٤) ڕۆژی خایاند، جولەکەکان سەرکەشیان کردوو خۆیان نەدا بەدەستەوە، بەڵام سەرەنجام کە زانیان هیچیان پێ ناکرێت لەگەڵ پێغەمبەر و جەنگاوەرانی موسڵماناندا و تیاچوون چارەنوسیانە، داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە سوڵحیان لەگەڵدا بکات.

## سەرەنجام و کۆتای ئەم جەنگە:

تەواوی خاکی خەیبەر و قەڵاکانیان کەوتنە دەستی پێغەمبەرﷺو، موسڵمانەکانەوە جولەکەکان تەسلیم بوون و داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ، کە شاری خەیبەر بەجێ نەهێڵن و، بەدەستیانەوە بمێنێ و، وەك جاران کاروکشتوکاڵی تێدا بکەن. ئەمەش بەبیانوی ئەوەی کە ئەوان لە هەموو کەس زیاتر و باشتر کاری کشتوکاڵی دەزانن، لەبەرامبەر بەم مانەوەیەیاندا بەشێك لە داهاتی خەیبەر بدەن بە موسڵمانەکان، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوە ڕێکەوت لەگەڵیاندا و پێی فەرموون:

لەسەر ئەوە بڕیار دەدەین تاخۆمان ئارەزوومان لێی بێت.[1]

ژمارەی شەهیدەکانی موسڵمانان دەوترێت (٨) کەس بوون، زانای پایە بەرز (مەنصور فوری) باس لە (١٦) شەهیدی کردووە لە جەنگی خەیبەردا، پاشان دەڵێت: دوای لێکۆڵینەوە و گەڕانی زیاتر ناوی (٢٢) کەسم لەو شەهیدانەی فەتحی قەڵاکانی خەیبەردا بەرچاو کەوتووە، ژمارەی کوژراوەکانی جولەکەش (٩٣) کەسبوون[2] بێگومان جەنگی خەیبەر لەموحەڕەمیساڵی (٧) کۆچیدا ڕویدا.

---

[1] فقه السيرة بەکوردی/ (محمد سعيد رمضان بوطی) و: شێخ محمد شێخ سميع لا(٤٠٤).

[2] گوڵاوی سەرمۆر/ مبارك فوری: و: بكر حمه صديق لا(٤٥٥، ٤٥٦)

ژەهراوی کردنی پێغەمبەر لەلایەن ئافرەتێکی جولەکەوە:

کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر سەقامیگر بوو، ئافرەتێکی جولەکە بەناوی (زەینەبی کچی حارث) کە خێزانی کابرایەکی جولەکە بەناوی (سلام کوڕی مەشکەم)، مەڕێکی سورەوکراوی بەدیاری نارد بۆ پێغەمبەر، وتی: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە چ بەشێکی حەیوانە؟!

پێیان وت: شان و قۆڵەکەی، ئەویش تەواوی حەیوانە سورەوکراوەکەی ژەهراوی کردوو بە تایبەت (شان و قۆڵەکەی) کاتێك ئاژەڵە سورەوەکراوەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر و هاوەڵان، پێغەمبەر پارچەیەکی لەگۆشتی شانەکەی لێکردەوە و جاوی لەدەمیدا، بەڵام قوتی نەدا و تفی کردەوە، پاشان فەرمووی: ئەم پارچە ئێسقانە پێم دەڵێت ژەهراویە..

دواتر ئافرەتە جولەکەکە بانگکرا و هێنایانە بەردەم پێغەمبەر و پرسیاری ئەم کارە چەپەڵەی لێکرا کە بۆ ئەنجامی داوە؟!!

ئافرەتەکە لە وەڵامدا وتی: لەدڵی خۆمدا وتم: ئەگەر ئەم پیاوە - واتە پێغەمبەر - پادشایەکی دنیایی بێت ئەوە ڕزگارمان دەبێت لە دەستی، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خواش بێت لەلایەن پەروەردگاریەوە هەواڵی پێدەدرێت..

لەکاتی ئەو گۆشت خواردنەدا هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی (بەشیری کوڕی بەراء) بوو پارچەیەکی لەو گۆشتە خواردوو قوتیدا و بەهۆیەوە وەفاتی کرد..

چارەنوسی ئافرەتەکە جیاوازی زانایانی لەسەرە ئەویش بەو شێوەیەی کە لەسەرەتا پێغەمبەر ﷺ لێی خۆشبوو، بەڵام دواتر کە بەهۆکاری ژەهرەکەوە (بەشیری کوڕی بەراء) وەفاتی کرد، کوشتیانەوە لەبری ئەودا.[1]

---

[1] بڕوانە (زاد المعاد) ج(٢) ص(١٣٩) ، فتح الباری ج(٧) ص(٤٩٧) درێژەی ئەم باسە لە بوخاریدا باسکراوە، هەروەها (إبن هشام) ج(٢) ص(٣٣٧ - ٣٣٨).

دوا وته لەم بەندەدا:

دوای ئەو گوورزە خێرایەی کە کردمان بەنێو ڕووداوەکانی ناو شاری مەدینە لە سەرەتای تەشریف بردنی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵان و دامەزراندنی دەوڵەت و نوسینەوەی دەستوری مەدینە و پێدانی ماف و ئازادی بەتەواوی مرۆڤەکان و دین و کەمایەتیەکان و بەستنی پەیمان نامەی ئاشتی و هاوکاری و ئازادی دینی لەگەڵ جولەکەکاندا... ئەو ڕاستیانەمان بۆ ئاشکرا بوو کە:

١) پێدانی ئازادی ڕاوبۆچوون و ممارەسەکردنی هەر دینێك کە مرۆڤەکان قەناعەتیان پێی هەیە، یەکێکە لە بنەما چەسپاو و جێگیرەکانی ئیسلام و قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتی قەشەنگی خۆیدا ئاماژەی بەم ئازادی پێدانە بە مرۆڤەکان کردووە کە دیارترینیان ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ﴾.

٢) پێغەمبەر و هاوەڵان هیچ کات کێشەیان لەگەڵ جولەکەکاندا نەبوو بە هۆکاری جولەکەبونیانەوە، بەڵکو ئەوان کێشەیان لەگەڵ پێغەمبەر و موسڵماناندا هەبوو، هەموو کات لە هەوڵی نانەوەی ئاژاوە و تیرۆرکردنی پێغەمبەر و هەوڵی ژەهرخواردکردن و بەردانەوەی بەردی گەورە بوون بۆ سەرسەری ئەو پێغەمبەرە مەزنەی کە ڕێزی لێگرتن، پەیمانی لەگەڵدا بەستن، مافی دانێ، ئارامی بۆ دەستەبەرکردن، بواری ژیانی شەرەف مەندانەی بۆ ڕەخساندن، بە ئایەتی ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ﴾ لە موسڵمانانی نزیك خستنەوە کە هەموومان یەك خوای تاك و تەنهامان هەیە و موسا کە پێغەمبەری ئێوەیە، برای منە لە کاری پێغەمبەرایەتیدا و تەوارت کە پەرتوکی ئێوەی جولەکەیە، هەروەك قورئانی پیرۆز هەر لە یەك سەرچاوەوە هاتوون کە خوای مەزنە.

لەسەرەتادا ئیسلام بەم شێوەیە مامەڵەی برایانەی لەگەڵ ئەو ناپاکانەدا کرد، بەڵام ئەم جوامێر و ڕاستگۆیی و ڕەوشتەبەرزانەی موسڵمانان، نەدەشیا بۆ ئەوان و بەوێنەی پەروەردەکردنی مێش و قالۆنچە وەهابوو، لەناو باخچەیەکی بۆن خۆشی

پڕ لە گوڵ و گوڵزاردا!! ئەوان بە سروشتی حاڵی خۆیان ئەوەیان دەخواست، کە لەئاوەدانی دەربکرێن، زەلیل بکرێن، ژیانی شەرەف مەندانەیان پێ ڕەوا نەبینرێ..
ئەمەش بژاردەی خۆیان بوو و کەس ستەمی لێ نەکردبوون.

هەموو دەزانین کە ئەوان بەپێی برگەنامەکانی نێو پەیمان نامەکە، هەموو ماف و ئازادیەکیان پێ درا و هیچ کێشەیەکیان نەبوو، بەلآم بەدەستی خۆیان چاڵی مەرگیان بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵ و داماتووی خۆیان هەڵکەندوو، بەسەردا خۆیان هەڵدایە ناوی ﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ﴾.

٣) ئەوان پەیمان شکاندن و کلکایەتی بۆ دوژمن و ئاژاوەنانەوە و، پێغەمبەر کوشتن و خیانەتی گەورە و ناپاکیان بە شیرەوە هەر بە منداڵی خواردبوو، ئەستەم بوو بتوانن دەست بەرداری ببن و، بەڕاستی ببنە مرۆڤ چونکە هەرگیز خوی شیریان بۆ تەرك نەدەکرا بەتەمەنی پیری!!

دەرکردنیان لە مەدینە و دورخستنەوەیان لە بەر جولەکەبونیان نەبوو هەروەك هەندێك لە دوژمنان و نەفامان بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵکو بە هۆکاری خیانەت و ناپاکی و پابەندنەبونیان بوو بەو پەیمان نامەیەی کە مۆریان کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و موسڵماناندا، ئەمەش سیفەتی بەردەوام و هەمیشەییان بووە بە درێژایی مێژوویان و ئێستاشی لەگەڵدا بێت.

# بەندی هەشتەم

پێم خۆش بوو لە دوا بەندی ئەم کتێبەدا لە کۆمەڵە باسێك بدوێم کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بەجوولەکەو قەوارەی زایۆنیەوە هەیە، هەریەك لەو باس و خواسانە سەربەخۆن و پەیوەندیان بەوی دییەوە نیە، کە ئەوانیش بریتین لەمانە:

**باسی یەکەم:**

## مل کەچ بوونی دەوڵەتە زل هێزەکان لە خزمەت جوولەکەدا

هەروەك ئاشکرایە کە بزوتنەوەی صەهیۆنیەتی جوولەکە یەکەم بزافە لە جیهاندا کە نوێنەرایەتی جوولەکە دەکات، لە سەرەتاداو لە دوای ساڵەکانی ١٨٩٧، تەنها نوێنەرایەتی ١٠٪ ی جوولەکەی دەکرد لە جیهاندا، بەڵام ئێستا نوێنەرایەتی تەواوی سەرجەم جوولەکە دەکات لە جیهاندا، ئەویش دوای ئەو سەرکەوتنە یەك لە دوا یەکانەی کە بە دەستی هێنا لە جیّ بە جیّ کردنی بڕیارەکانی و بەتایبەت دامەزراندی دەوڵەتی (إسرائیل) و داگیرکردنی زیاتر ٨٠٪ ی خاکی فەلەسطین و بەشێك لە سوریاو لوبنان و دەست گرتنی تەواو بەسەر دورگەی(سیناء) داو، دواتر گێڕایەوە بۆ مصر دوای پەیمانی (کامب دیفید) بەو مەرجەی کە (سیناء) خاڵی بکرێت لە چەك و هیچ جۆرە چەکێکی تێدا نەبێت.

بەم جۆرە بزوتنەوەی صەهیۆنیەت لە ئێستەدا تا کە بزوتنەوەیە لە جیهاندا کە یارمەتی و پاڵپشتی (إسرائیل) دەکات بۆ دەست گرتن بەسەر جیهانی عەرەبی و خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا و لە پاشان جیهان بە گشتی، بزوتنەوەی صەهیۆنیەت و دەوڵەتی إسرائیل، هەر دووکیان بەرهەمی ئەمەریکاو ڕۆژئاوان لە ناوچەکەداو لەبەرامبەریشدا (إسرائیل) پارێزەری بەرژەوەندیەکانیانە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

دواتر تیشك دەخەینە سەر ڕۆڵی هەریەك لە (بەریطانیا و ڕوسیاو فەڕەنسا و ئەڵمانیاو وڵاتە یەگگرتووەکانی ئەمەریکا، لە یارمەتی دانی (إسرائیل) لە ناوچەکەدا.

## ڕۆڵی بریطانیا:

بێ گومان ژمارەی جوولەکەکانی بریطانیا هێندە زۆرن، کەلەهیچ بەشێکی تری ئەوروپادا هێندە ڕێژەیان زۆرنیە، لە بریطانیادا مەزهەبی (بروستانتی) فەرمان ڕەوایەو بە تەواوی مانا پشت گیری جوولەکە دەکەن لە گەڕانەوەیان بۆ فەلەسطین.

بەریطانیا هەر لە سەرەتای بیستەکاندا ودوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانی جەختی لەسەر ڕووخانی خەلافەت کردەوەو مژدەی ئەوەی دا بە جوولەکە، کە (فەلەسطین) دەست کەوتو بەشی ئەوان دەبێت لە دوای ڕوخانی خەلافەت، ئەمیش بۆ ئەوەی کە ڕێگری بکات لە یەکێتی نێوان وڵاتە عەرەبیەکان و بە تەواوی دایان بڕێت لە یەکتر، بێ گومان ئەمەش نەدەکرا، تەنها بەوە نەبێت کە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ جوولەکە دامەزرێنرێ لە فەلەسطین، بریطانیا بەڵێنی (بلفور) ی دا بە جوولەکە کە ئەمە دەقی نهێنی ناو بەڵێنەکە بەم جۆرە بوو.

((ڕاگەیاندنێکی دەوڵەتی بریطانیا بوو، کە بەشێوەی نامەیەك و بە ئیمزای بەلفۆری وەزیری دەرەوە بریطانیا، وەك وتارێك ئاڕاستەی (لورد روچیلد) کرا لە بەرواری ٢: ١١: ١٩١٧ تیایدا هاتبوو کە سەرنجی بەڕێزتان ڕادەکێشم بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی جوولەکەکان لە فەلەسطین و داوادەکەم هەرچی زیاتر کۆشش بکەین لە پێناو هێنانەکایەی ئاسان کاری بۆ گەیشتن بەم ئامانجەو لە هەمان کاتدا نابێت هیچ جۆرە کارێکی پێچەوانەی ماف و مەزهەبی کۆمەڵەی غەیرە جولەکەی فەلەسطین، یان ماف و پێگەی سیاسی جوولەکەکان لە هەر وڵاتێکی تر ئەنجام بدرێت[١].

بەڵێ ڕاگەیاندنی (بلفۆر) بەیەکێك لە بەڵگە گرنگەکانی زایۆنیزم حساب دەکرێت لە ڕاستێتی بانگهێشت کردنی جوولەکەکانی سەرتاسەری زەوی بۆ فەلەسطین.

دوا بەدوای ئەمە بریطانیا دەرگای کۆچی جوولەکەی خستە سەر پشت بۆ فەلەسطین و یارمەتیو کۆمەکی تەواوی ئەوانەی دەکرد کە کۆچ دەکەن، لە

---

١- فەرهەنگی سیاسی سەبا (عبد القادر صالح) لاپەڕە (٣٦)

ئاسانکاری زەوی کڕینی خاکی فەلەسطین و پێ بەخشینی زەوی بە باش و ستراتیژیەکان ی فەلەسطین بەجوولەکەکان.

لە بەرامبەریشدا کار قورسی و بارگرانی دادەنا لەسەر جووتیارانی فەلەسطین، پاشان بریطانیا دانی بەوە دانا کە زمانی (عبری) زمانی ڕەسمی (فەلەسطین) ە.

دواتر پاسەوانی تایبەتی لەسەر حسابی خۆی دانا بۆ جوولەکەکانی فەلەسطین بە بیانووی بەرگری کردن یان لەدەست درێژی عەرەبەکان.

لە کۆتایدا: بەڕاستی بریطانیا گەورەترین یارمەتی دەرو پاڵپشت بوو بۆ جوولەکەکان لە دامەزراندنی دەوڵەتی إسرائیل لە خاکی فەلەسطین دا، چونکە ئەوکات فەلەسطین و زۆرێك لە وڵاتانی تری عەرەبی و غەیرە عەرەبی لەژێر دەسەڵاتی بریطانیادا بوون و ئەوەی بریطانیا کردی تەنها (٢٨) ساڵی خایاند، واتە ساڵی (١٩٢٠) دەستی بەکارەکانی کردوو ساڵی (١٩٤٨) کۆتاییان پێ هات بە دامەزراندنی دەوڵەتی (إسرائیل) لە فەلەسطین دا.

## ڕۆڵی یەکێتی سۆڤیەت (الإتحاد السوفيتي) لە کۆندا:

لەپێش ڕووخاندنی یەکێتی سۆڤێت لەساڵی (١٩٩١) دا، سۆڤیەت لەیەکەمی پێشەوەی ئەو وڵاتانە بوو کە دانی نا بەقەوارەی زایونی إسرائیل دا، کەلە ١٥: ئایار: ١٩٤٨ دا دەوڵەتی جوولەکە إعلان کرا، ئەمەش بە ئومێدی ئەوەی کە (إسرائیل) ببێتە یەکەم دەوڵەتی (إشتراکی) لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و بنکەی بڵاوبوونەوەی بیری إشتراکی و مارکسی لە ناوچەکەدا، لە ١٥: ئایار: ١٩٤٨ سەربازانی وڵاتە عەرەبیەکان چوونە ناو خاکی فەلەسطین بۆ بەرەنگاربوونەوەی إسرائیل و پاشان ڕزگارکردنی تا گەیشتە (تەل ئەبیب) لەم کاتەدا کە إسرائیل خاوەنی دەسەڵاتێکی ئەوتۆ نەبوو لە بەرەنگاربوونەوەی هێزە عەرەبیە إسلامیەکاندا، وڵاتانی ڕۆژئاواو لەگەڵیشیاندا یەکێتی سۆڤیەت هەڵسان بەفەرزکردنی ئاگربەست لە عەرەبەکان بۆ ماوەی (٤) هەفتە ئەویش بۆ مەبەستی یارمەتی دان و پڕ چەك کردنی إسرائیل بۆ بەهێزکردن و دژابەتی کردنی عەرەبەکان.

سوڤیەت لەم ماوەی ئاگربەستەدا زۆر بەخێرایی و لەڕێگەی (چیکوسلوڤاکیاوە) چەکی ڕەوانەی إسرائیل کرد بۆ سەرکەوتنی بەسەر عەرەبەکاندا و چەکەکانی سوڤیەت گەورەترین ڕۆڵیان بینی بۆ داگیرکردنی٨٠٪ی خاکی فەلەسطین و دەرکردنی ملیۆنەها عەرەب لە زێدی باو باپیرانی خۆیان و دانانی جوولەکە لە جێگاکانیان.

دوای ئەوەی کە کیانی زایونی و دەوڵەتی إسرائیل سودی تەواویان لە بواری سەربازی ڕوسیا وەرگرت و بەسەر نەیارە عەرەبەکانیدا سەرکەوتن و بەهێزبوون لە ڕووی سیاسی و سەربازیەوە، سوڤیەت ئەوەی بۆ ئاشکرا بوو إسرائیل ئامانجەکانی سوڤیەت ناهێنێتە دی لە بڵاوکردنەوەی مارکسیەت و، بیری إشتراکیەت دا و بەڵکو بەپێچەوانەوە (إسرائیل) دروست کراوی دەستی ڕۆژئاوای سەرمایەداری یە، هەربۆیە سۆڤیەت بە پەیوەندیەکانی خۆیدا ڕۆیشتەوە لەگەڵ جوولەکەدا و سەرەنجام لە ڕیزی عەرەبەکاندا وەستا لە دژی إسرائیل و پاڵپشتی خۆی بۆ دووپات کردنەوە.

## ڕۆڵی ئەڵمانیا:

إسرائیل توانی بە جۆرێك لە جۆرەکان سەربکەوێت بەسەر نەیارە عەرەبەکانیدا لە ساڵی (١٩٤٨)، بەڵام دەسەڵاتی مالی و بانکەکانی ڕویان لە کزی و إفلاس کرد، بەو جۆرەی کەلەیەکێ لە دانیشتنەکانی وەزارەتی إسرائیلدا، ساڵی (١٩٥٠) سەرەك وەزیرانی إسرائیل بە ناوی (بن غورین) وتی ((دەوڵەتی إسرائیل لە کۆتای ساڵی ١٩٤٩ و سەرەتای ساڵی ١٩٥٠تووشی قەیرانێکی خەجاڵەت ئامێزی ئابووری بووە، کە ئەمەش هەڕەشە لە کیانی إسرائیلی دەکات)).

بەخشینەکانی جوولەکە لەنێوان ساڵەکانی(١٩٤٩، ١٩٥٠) دا (٢٦٣) ملیون دولار بوو، لە بەرامبەردا تووشی گەورەترین قەیرانی ئابووری هات ئەویش لەبەر ئەم هۆکارانە:

١-مەشق کردن بەسەربازانی جوولەکە و گۆڕینی بە سەربازی نظامی و دامەزراندنی (سەربازانی بەرگری إسرائیلی).

٢- كڕینی چەك بۆ پڕچەك كردنی دەوڵەت لەبەرامبەر مەترسیو هەڕەشەی نەیارانیدا، کە بێگومان پڕچەككردنی دەوڵەت گەورەترین سەرمایەی ماددیو ئابوری دەوێت.

٣- كۆچكردنی جولەكەكان بۆ ئیسرائیل لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتو بەتایبەت ساڵەكانی (١٩٤٨-١٩٥١) گەورەترین سەرمایەی ماددی دەویست لە دابینكردنی شوێنو ڕێگە بۆ ئەو جولەكە كۆچكەرانە بۆ فەلەستین كە لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا ژمارەی كۆچكەران نزیكەی (٦٠) هەزار جولەكە بوون.بێگومان ئەو كۆچكەرانە خاوەنی هیچ شتێك نەبوون لە ماڵو كارو سەرچاوەی ماددیو داوای هەموو شتێكیان دەكرد لە دەوڵەتی ئیسرائیلی كە بۆیان دەستەبەر بكات! !

٤- دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلیو وەزارەتو دامودەزگاكانی، لەو دەمەدا پێویستی بەزیاتر لە (١٠٠) ملیۆن جنیەی ئیستەرلینی هەبوو.بەریتانیا پێش بەجێهێشتنی فەلەستینو لەسەردەمی (إنتداب) ی فەلەستیندا موچەی تەواوی كارمەندانی قەوارەی زایۆنی دەدا، بەلاّم دوای بەجێهێشتنو تەسلیمكردنی فەلەستین بە جولەكە، تەواوی ئەو پارەتیانەی بڕیو ئەو ئەركە چووە سەرشانی ئیسرائیل خۆی لە جێبەجێ كردندا.

لەم كاتە دژوارەدا (ئیسرائیل) داوای لە ئەڵمانیای خۆرهەلاّت كرد كە قەرەبووی ئەو كوژراوە جولەكانەی بداتەوە كە لەجەنگی دووەمی جیهانیداو لەلایەن حیزبی نازیەوە كوژرابوون-بەحسابی خۆیان- سەرەنجام ڕاوێژكاری ئەڵمانیای خۆرهەلاّت بەناوی (أدیناوەر) ڕازی بوو بەوەی كە (٦٠) ملیار دۆلار بداتە دەوڵەتی ئیسرائیل بۆ ماوەی (١٠) ساڵو سەرەتا (ملیارو نیوێكی بەحازر بداتێ) و هۆكاری ڕازی بوونی ئەڵمانیا بەپێدانی ئەم بڕە پارە زۆرە بە ئیسرائیل بریتی بوو لەوەی كە ئەڵمانیا ترسا لەوەی كە جولەكە كۆسپ دروست بكەن لە گەیشتنی یارمەتیو كۆمەكیەكانی ئەمەریكا بە ئەڵمانیا، چونكە لەو دەمەدا ئەڵمانیا زۆر پێویستی بە یارمەتیدانی ئەمەریكا بوو بۆ دروست كردنەوەو بنیاتنانەوەی ئەڵمانیا كە لەجەنگی جیهانی دووەمدا كاول بوو بوو.

بەم جۆرە ئەڵمانیا ئیسرائیلی لەو قەیرانە ئابوریە ڕزگار کردو ڕۆڵی سەرەکی بینی لە ڕاوەستان و سەرکەوتنی دوڵەتی جولەکەدا.

## ڕۆڵی فەرەنسا لە دەستگرتن و یارمەتیدانی جولەکەدا:

گومان لەوەدا نیە کە فەرەنسا یەکێك بوو لەو دەوڵەتە زلهێزانەی کە بەشێکی زۆری وڵاتە عەرەبیەکانی داگیرکردبوو وەك (مەغریبی عەرەبی و جەزائیرو تونس و مەراکیش و مۆریتانیاو جیبوتی) دوای سەپاندنی (إنتداب) ی فەرەنسی بەسەر لوبنان و سوریادا، فەرەنسا بەزەبری ئاگرو ئاسن مامەڵەی لەگەڵ ژێردەستەکانی خۆیدا دەکرد، لەناویاندا جەزائیر کۆنترین وڵات بوو کە لەلایەن فەرەنساوە لە ساڵی (١٨٣٠) دا داگیر کرا، فەرەنسیەکان هانی هاوڵاتیانی خۆیاندا لە کۆچکردن بۆ جەزائیرو داگیرکردن و سڕینەوەی شوناسی کە سێتی جەزائیری بە هەموو جۆرێك، بەرهەمی غەدرو ستەم و دڵڕەقی و مامەڵەی فەرەنسیەکان لەگەڵ گەلی جەزائیردا دروست بوونی کۆمەڵێك شۆڕشی یەك لەدوای یەکی لێکەوتەوە، وەك: شۆڕیشی عبدالقادری جەزائیری لە ساڵی (١٨٣٢) و شۆڕشی (محمد المقرانی) لە ساڵی (١٨٧١) و شۆڕشی نەوەکانی (سیدي الشیخ) لە ساڵی (١٨٨١).لە ساڵی (١٩٥٤) دا شۆڕشی گەورەی جەزائیر دەستی پێکردەوە بەڕابەرایەتی(أحمد بن بلة) فەرەنسیەکان دوا پلەکانی وەحشی گەرێتیان بڕی لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکی جەزائیرداو شۆڕشی جەزائیری بەوپەڕی دامەزراویەوە ڕاوەستا لەبەردەم هێزی داگیرکەری فەرەنسیەکانداو ماوەی (٧) ساڵی خایاندو زیاتر لە (١) ملیۆن شەهیدی لێ کەوتەوە، هێزە فەرەنسیەکان دەستیان کرد بە بەجێهێشتی جەزائیرو لەساڵی (١٩٦٢) دا سەربەخۆییان دا بەجەزائیر، لەماوەی شەڕی نێوان فەرەنساو جەزائیردا (ئیسرائیل) ئەم هەلەی قۆستەوەو لە فەرەنسا نزیك بویەوەو هاوکاری لەگەڵدا گرێدا، لەئەنجامی ئەم هاوکاریەدا فەرەنسا چەکێکی زۆریدا، بە ئیسرائیل بەتایبەت چەکی ئاسمانی و دەریایی، ئیسرائیل بە چەکەکانی فەرەنسا ڕووبەڕوی هێزی عەرەب بویەوە لە (٥) ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٧) و لە ئەنجامدا بەسەریاندا سەرکەوتو

(سیناء) ی له میصر داگیرکردوو بەرزاییەکانی جولان له سوریاو (غەزەو ضفەی غەری) ش لەخاکی فەلەستین...

## ڕۆڵی ئەمەریکا لەیارمەتیدانی جولەکەدا:

یارمەتی کۆمەکی سەرجەم وڵاتان بۆ قەوارەی زایۆنی (ئیسرائیل) لەلایەکو ئەمەریکاش بەتەنها لەلایەك، هەموو لایەك ئەوە دەزانن هەر لەسەرەتاوە، بنیات نانی دەوڵەتی جولەکەو چاودێریکردنو پشتگرتنو دانپیانانو بەهێزکردنی لەڕووی سیاسیو سەربازیو ئابوریو بەرگری لێکردنو چاوسورکردنەوەو دژ وەستان لەبەرامبەر دوژمنەکانیو سەدانی تری لەم جۆرە، یارمەتیو ڕۆڵی ئەمەریکا بووە بۆ قەوارەی داگیرکەری (ئیسرائیل).

تا ئەو ئاستەی ئیسرائیل گەیشت بەم ڕۆژەو له ئێستادا پێی دەوترێت (الدولة فوق القانون) واته: ئەو دەوڵەتەی له سەروو یاساوەیەو هیچ یاسایەکی نێودەوڵەتی نایگرێتەوە، لەهەر کارێك ئەنجامی دەدات.

## یارمەتیو ڕۆڵی ئەمەریکا له بەرامبەر جولەکەدا خۆی له دوو قۆناغی سەرەکیدا تۆمارکرد کەئەوانیش ئەمانەن

**قۆناغی یەکەم:** له ساڵی (١٩٤٢) وەوە دەستی پێکرد بەوەی کەسەنتەری سەرەکی بزوتنەوەی صەهیۆنیەت بارەگاکانی له بەریتانیاوە گواستەوە بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئەم قۆناغە کۆتایی هات له (٥) ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٧) کە عەرەبەکان تیایدا توشی شکست هاتن لەبەردەم ئیسرائیلدا، لەم قۆناغەدا ئەمەریکا پاڵپشتی زۆر توندی لەقەوارەی زایۆنی ئیسرائیل دەکرد، جولەکەش ئەم گواستنەوەیان بەو زانیاریانە ئەنجامدا، کە دەیانزانی بەریتانیا له جەنگی دووەمی جیهانیدا شکست دێنێتو بەلاوازی دەمێنێتەوەو له بەرامبەریشدا ئەمریکا دەبێتە یەکەم هێزو یەکەم جەمسەر لەدونیادا.

**قۆناغی دووەم:** لە (٥) ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٧) ەوە دەستی پێکرد کە ئیسرائیل زاڵبوو بەسەر نەیارە عەرەبەکانیداو ئەمەریکاش لەم نێوەندەدا ڕۆڵی پەگەورە نیشاندانی ئیسرائیل بینی لەبەردەم تەواوی جیهاندا بە گشتیو وڵاتە زلهێزە خاوەن بڕیارەکان بەتایبەتیو پاشان بانگەشەکردن بەوەی کە ئیسرائیل پارێزەری بەرژەوەندیەکانی ئەمریکایە لە ناوچەکەدا.

(دوای جەنگی ساڵی ١٩٧٣) کە عەرەبەکان غیرەتو حەماسەتیان بۆ جارێکی تر جوڵا لەبەرامبەر فەلەستینی داگیرکراو، بڕیاری جەنگیان دایەوە لەگەڵ ئیسرائیلدا لەوکاتەدا زۆر بەئاشکرا دەرکەوت کە ئەمەریکا چەندە لایەنگری جولەکە دەکاتو لە پشتی بەرژەوەندیە باڵاکانیوەیەتیو دژ بەنەیارەکانیو قەوارەی زایۆنی پڕ چەك دەکاتو بۆ سەرکوتکردنەوەی دژەکانی.هەر لەپێدانی تازەترین جۆری چەکی زەمینیو ئاسمانیو دەریاییو لەسەرووی هەموشیانەوە چەکە کۆمەڵکوژەکانی وەکو: ئەتۆمو فسفۆر، کە ساڵی (٢٠٠٨) لەبەرامبەر موسوڵمانانی غەزەدا بەکاریان هێناو هیچ یاسایەکی نێودەوڵتیش شمولی نەکردن لە سزادانیان چونکە دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەروی یاساوەیەو یاسا بۆ ئەوان نیە!!! هەردوو حیزبی دەسەڵاتداری ئەمەریکا (چ کۆماریەکانو چ دیموکراتیەکان) لەسەرجەم بۆنەو وتارەکانیاندا – لەگەڵ تەواوی جیاوازیاندا – کۆکو یەك قسەو هەڵوێستنو پابەندن بە پارێزگاری کردن بەدابینکردنی ئارامیو ئاسایشو ئاشتی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل.دوای مۆرکردنی پەیمانی (کامب دیفید) ساڵی (١٩٧٨) لە نێوان (میصرو ئیسرائیل) و گۆڕینەوەی باڵوێزخانەی هەردوولا، مصر لەدژایەتیکردنی ئیسرائیل لەناو کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبیەکان هاتە دەرەوەو لەو ساتەوە بڕیاریدا کە بەهیچ جۆرێك دژایەتی ئیسرائیل نەکات، نە لەڕووی سەربازیو نە لەڕووی ئیعلامی.

**دوا وتە لەم بارەوە:**

هەروەك پێشتریش باسمان کرد کە دەوڵەتی ئیسرائیل لەلایەن ڕۆژئاواوە دروستکراو بنیاد نرا، ئەڵمانیا ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لەکاربۆ ئاسانکردنو

دامەزراندنی ئەو قەوارەیەدا، فەرەنساش لە ڕووی سەربازیەوە یارمەتی ئیسرائیلیدا، تا بەسەر دژەکانیدا سەربکەوێت، ئەڵمانیاش لەڕووی ماددیو ئابوریەوە پشتی ئیسرائیلی گرتو نەیهێشت بەچۆکدا بێت لەبەردەم نەیارەکانیدا، دواتر ئەمەریکاش بەتەنهاو سەرجەمی ڕۆڵەکانی بینی هەر لەڕووی سەربازیو سیاسیو ئابوریو تەواوی لایەنەانی تر لەپشتی جولەکە بوو تەنانەت لەئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیشدا، گەر ولاتان ڕەخنەیەك لە قەوارەی زایۆنی ئیسرائیل بگرن یان بیانەوێت بڕیارێك دژ بەئیسرائیل دەربکەن، خێراو دەستبەجێ ئەمەریکا مافی (ڤیتۆ) لە بەرامبەریاندا بەکاردەهێنێت تا سەرزەنشتی ئیسرائیل نەکرێتو پابەندی نەکەن بەهیچ بڕیارێکەوەو بەم کارەش تەواوی بڕیارەکای ئەنجومەنی ئاسایش هەڵدەوەشێنێتەوە لەبەرامبەر ئیسرائیلدا....

پاشان پەیوەندی نێوان ئەمەریکاو ئیسرائیل پەیوەندیەکی زۆر بەهێزەو هەریەك لەجێگەو شوێنی خۆیدا بەرژەوەندی ئەویتر دەپارێزێت.

گومان لەوەدا نیە کەئەمڕۆ ئەمەریکا تاکە جەمسەری هێزە لەجیهانداو بەرامبەری نیە، ڕاستیەکی تریش هەیە ئەوەیە کە جولەکە سەهیۆنیەکانیش دەستیان بەسەر ئەمەریکادا گرتووەو ناڕاستەوخۆ ئەمەریکاو جیهان دەبەن بەڕێوە کە هۆکاری زاڵبوونی جولەکە بەسەر ئەمەریکادا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم چەند خاڵە:

١- لە ئەمەریکادا نزیکەی (٦) ملیۆن جولەکە هەیە، کە لەویلایەتە دەوڵەمەندەکانی ئەمەریکاو شارە گەورەکانی وەك (نیۆرك) دا جێگیربوون، ڕێژەی جولەکەکانی شاری نیۆرك زیاترە لەڕێژەی جولەکەکانی ئیسرائیل، لەگەڵ ئەمانەشدا گەورەترین جالیەی جولەکە لەم شارەدان، ئەمەش وای کردووە جولەکە گەورەترین کێشی سیاسیان هەبێت لە ئەمەریکادا....

٢- وەك ئاشکرایە کە کۆمەڵگای ئەمەریکی لە گەلو نەتەوەی جیاواز جیاواز دروست بووە، هەمووشیان سودمەندن لەو ئازادیو یەکسانیەی کە دەستەبەر کراوە بۆیان.یاسای ئەمەریکا ڕێگا دەدات بە هەموو ئەو گەلو نەتەوە جیاوازو دینانەی کە حیزبو کۆمەڵ بۆ خۆیان دروست بکەن، بەمەرجێ دژایەتی سیاسەتە جێگیرو

گشتیەکانی ئەمەریکا نەکەن‌و دەستدرێژی نەکەنە سەر ئازادی‌و بیروباوەڕی کەسانی تر، جولەکە ئەم حاڵەتەیان قۆستۆتەوە لە ئەمەریکادا ئەویش بەوەی دەیان دامەزراوەو حیزبیان دروست کردووەو کە نەك هەر خزمەت بەجولەکەکانی ئەمەریکا دەکات بەڵکو بەتەواوی جولەکەکانی دونیاش خزمەت دەکات.

٣- جولەکە لەئەمەریکادا بەشێوەیەکی گشتی دەستیان بەسەر بازاڕەکانی پارەو بانقەکاندا گرتووەو بەمەش بوونەتە گەورەترین سەرمایەدار لە ئەمەریکادا.

٤- دەستگرتنی تەواوی جولەکە لە ئەمەریکادا بەشێوەیەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ دەستگرتنیان بەسەر میدیا لەو وڵاتەدا بەشێوەیەکی ڕەها هەر لەتەلەفزیۆن‌و سەتەلایت‌و سینەماو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان.....هتد.

بەمەش توانیویانە کە بیروباوەڕی تاکی ئەمەریکا ئاراستە بکەن بەوەی کە جولەکە هەرچی دەکات مافی خۆیەتی‌و ئەوانەش کە دژایەتی دەکەن لە لیستی ڕەشدان‌و تیرۆرستن.

بەهۆی ئەم خاڵانەو دەیان خاڵی ترەوە جولەکە توانیویەتی کە دەسەڵات بگرێت بەسەر ئەمەریکاداو لە خزمەت بەرژەوەندیەکانی خۆیدا بەکاری بهێنێت[1].

باسی دووەم:

## ڕووداوەکانی (١١) سیبتمبرو دەستی جولەکە لەپشتیانەوە!!!

لای هەموان ئاشکرایە کەلەبەرواری ١١: ٩: ٢٠٠١ دا کۆمەڵێك لە پیاوانی تەنزیمی قاعیدە هەڵسان بە فڕاندنی چوار فڕۆکەی مەدەنی لە ئەمەریکادا، دوانیان دران بەهەردوو تاوەری بازرگانی جیهانی ئەمەریکاداو سێیەمیشیان درا بەبینای (پەنتاگۆن) (وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا) و چوارەمیشیان دانرا بۆ (کۆشکی سپی) کە شوێنی سەرۆکی ئەمەریکی بوو، بەڵام ئەمەیان سەری نەگرت‌و ئەو کەسەی کەبەم کارە هەڵسا سەرکەوتوو نەبوو، لە بەجێهێنانی کارەکەیداو لەئەنجامدا

١- أضواء على بروتوكولات حكماء الصهيون (النصوص الكاملة) رجا عبدالحميد عرابي : ص ١٧٧.

فرۆكەكەی دابەزەویداو ئامانجی نەپێكا، ئەنجامەكانی ئەم ڕووداوە زەرەرو زیانێكی یەكجار زۆری ماددیو مرۆیی بەدوای خۆیدا هێنا، ئەنجامدەرانی ئەم كردەوەیە بەتیرۆرست ناویرانو ئەوە ڕاگەیەندرا كەلەم ساتەوە جەنگ بەرپاكرا لەگەڵ تیرۆردا لەسەرتاسەری جیهاندا، پاشان زۆركرا لەدەوڵەتانی جیهان كەلەگەڵ ئەمەریكادا بوەستن لە دژی تیرۆرو ئەوەشی ملكەچ نەبێت بۆ ئەم دژەڕاوەستانە بە تیرۆریزم ناودەبرێتو هەڕەشەی تۆڵەی لێدەكرێتو گەمارۆی ئابووری دەخرێتە سەر، لەڕاستیدا ئەم چەمكە(تیرۆر) چەكێك بوو دژ بە ئیسلامو موسوڵمانان بەكارهێنراو كورت كرایەوە لەو موسوڵمانانەی كە دەستیان بەدینی ئیسلامەوە گرتووەو دروشمی دینەكەیان جێبەجێ دەكەنو مل بۆ ئەمەریكاو جولەكە نەوی ناكەن.

لە ئەنجامدا ئەمەریكا گەیشتە ئەو باوەڕەی كە بەرپرس لە ئەنجامدانی ئەم كارە بریتیە لە ڕێكخراوی قاعیدە- كە ئەمە ڕاستیەكی حاشا هەڵنەگرەو گومانی تێدا نیە.بەلآم لێرەدا شتێكی سەیرتر هەیە كە دەزگای هەواڵگری ئەمەریكی ( C I A) بەمكارەی دەزانی لە پێش ڕوودانیدا، بەلآم بێ هەواڵ بوو لەوردەكاریەكانی، نەی دەزانی لەكوێ دەدرێتو كەی ڕوودەدات، لەبەرامبەریشدا دەزگای سیخوڕیو هەواڵگری جولەكە (موساد) بەم كارەی دەزانی لەگەڵ بوونی زانیاری زیاتر بە ڕووداوەكان.

دەزگای (موساد) دەیانزانی لەناوەندی بازرگانی جیهانیو بینای كۆشكی سپیو وەزارەتی بەرگری ئەمەریكی (پەنتاگۆن) دەدرێت، بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستیە ئەوەیە كە كارمەندانی جولەكەی ناوەندی بازرگانی جیهانی كە ژمارەیان نزیكەی (٣٠٠٠) كەس بوو، لە (١١: ٩: ٢٠٠١) دا نەچوون بۆ دەوامو سەركارەكانی خۆیان!!!

لەوەش گرنگتر پەیام نێرە وێنەگرەكانی جولەكە لەئەمەریكادا، چاوی كامێراكانیان دامەزراندبوو لەسەر ئەو شوێنانەی كەدواتر فڕۆكەكان بەریان دەكەون.ئەمیش بۆ مەبەستی فرۆشتنی ئەو وێنانە بەهەزاران دۆلار.

پێش ڕوودانی ڕووداوەکان هەردوو دەزگای هەواڵگری ئەمەریکاو ئیسرائیل زانیاریان دەربارەی ئەم ڕووداوە دەگۆڕییەوە بەڵام ئیسرائیل ئامادە نەبوو وردەکاری زیاتر بداتە ئەمەریکا تا پێش لە ڕووداوەکان بگرێت، کە ئەمەش لەڕاستیدا فێڵێکی ئاشکرا بوو کە جولەکە لە ئەمەریکایان کرد، هەروەك نوسەرێکی فەرەنسی بەناوی (تیێری میسان) دەڵێت: ئەو ڕووداوانەی کە لە (١١) ی سێپتەمبەر ڕویاندا فێڵێکی ئابڕوبەر بوو، هەردوو تاوەری گەورەی ناوەندی بازرگانی جیهانی بەدەستی خۆیانو لە ژێرەوە هەرەسیان پێ هێنراو پاشان لەناو چوون[1].

دوابەدوای ڕووداوەکان دەزگای هەواڵگری ئەمەریکی (cia) داوایان لە سەرۆکی ئەمەریکا (جۆرج بۆش) کرد کەزانیاری بەردەوامیان بداتێ لەسەر ڕووداوەکان، بەڵام سەرۆك داوای لەدەزگای هەواڵگری کرد کە ئەم باسە بشارنەوەو بڵاوی نەکەنەوە- واتە زانیاریە وردەکانو هەواڵەکانی پشتی پەردە-

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵئەدات- ئایا بۆ سەرۆك بۆش زانیاریە وردەکانی دەربارەی ئەم مەسەلەیە پەردە پۆش کردوو شاردنیەوە، ئامانج چی بوو لەم کارەدا؟! لە وەڵامدا دەڵێین: (دوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠١) و سەرکەوتنی (بۆش) بۆ سەرۆکی ئەمەریکا توندڕەوترینو قینلەدڵترین کەسانی مەسیحی لەدەوری بوشدا بوون کە بەناو مەسیحی بوونو لە دڵو بیرباوەڕیشدا پارێزەرو دڵسۆزی بەرژەوەندیەکانی جولەکە بوون لە پۆستەباڵاکانی ئەمەریکادا، وەك: (دیك چینی) جێگری بۆشو (دۆناڵد ڕامسفێلد) وەزیری بەرگریو (کۆندالیزاڕایز) سەرۆکی ئاسایشی نەتەوەییو جەنەراڵ (ولیەم بوکین) جێگری وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا لەکاروباری هەواڵگریدا.) ئەمانە بریتی بوون لەو کەسانەی گەورەترین ڕقو قین لەدڵیاندا بوو بەرامبەر ئیسلامو موسوڵمانانو بەردەوام کاریان بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام دەکرد.

---

١- صحيفة المحرر العربي، عدد (٣٤١)، ص ١٢.

حوکمەتی ئەمەریکی زۆر لایەنگری (ئیسرائیل) بوو، مەبەستی بوو کە ڕووداوی (١١) ی ئەیلول ڕوو‌بدات، ئەویش لەپێناو دەیان ئامانجی گڵاوی خۆی‌و ئیسرائیل کە بەدەستی بکەون ئەوانیش بریتی بوون لە:

١- ئەم ڕووداوە گەورەترین سودی بۆ جولەکە تێدابوو، ئەویش بەو جۆرەی ئەمەریکا دوای ئەم ڕووداوە جەنگی سەرتاسەری ڕاگەیاند لە تەواوی جیهاندا دژ بە تیرۆرو دژ بەو دەوڵەتانەی کە لەگەڵ ئەمەریکادا نین دژ بەتیرۆر، جولەکە لەفەلەستیندا گیرۆدە بوون بەدەست خەبات کارانی ئیسلامی فەلەستینەوە، ئەمە گەورەترین ڕێگە بوو بۆ ئەوەی جولەکە بە هەموو جۆرێك‌و بەبەکارهێنانی ئاگرو ئاسن‌و تەنانەت چەکە قەدەغەکراوە نێودەوڵەتیەکان، بەرگریکارانی فەلەستینی پێ لەناوبەرێت‌و ببێتە گەورەترین بەڵگە بەدەست جولەکە لەتواندنەوەی نەیارانیدا بەبیانوی نەهێشتنی توندڕەوی‌و ئیرهاب.

بەڵێ دوابەدوای ڕوداوەکانی (١١ی ئەیلولی ٢٠٠١) جولەکە زۆر زیاتر لەجاران دژایەتی گەلی فەلەستینی دەکرد کە پێشتر بۆی نەدەکرا، لەژێر پەردەی ڕەشی نەهێشتنی (ارهاب) دا ئەنجامیدا.

هەربۆیە لەسەرانسەری زەویدا، ئەو گروپ‌و کۆمەڵ‌و حیزبانەی کە نەیاری جولەکە بوون چونە لیستی ڕەشی تیرۆرەوەو پێویستی لەناوبردنیان ڕاگەیەنرا.

جولەکەو ئەمەریکا بەوەندەوە نەوەستان، کە دژایەتی بزافە دینی‌و نیشتمانە فەلەستینیەکان بکەن بەڵکو هەڵسان بەقەدەغەکردنی هەموو جۆرە یارمەتیەك کە بگاتە خەڵکی فەلەستین بە تایبەتی دانیشتوانی غەزەو (ضفة الغربية).

پاشان هەڵسان بەڕێگرتن‌و داخستنی خاڵە سنوریەکانی وڵاتان کە هاوبەش بوون لەگەڵ فەلەستین‌و وشك کردنی هەموو ئەو ڕێگایانەی کە یارمەتی‌و کۆمەکی‌و فەلەستینیەکانیان دەکرد، بەبیانووی ڕێگرتن لە یارمەتیدانی تیرۆر!!!

٢- ڕووداوەکانی (١١ی ئەیلولی ٢٠٠١) گەورەترین ڕێگە بوو بۆ داگیرکردنی ئەفغانستان‌و کۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی (طالبان) و ڕێکخراوی (القاعدة)!!!

دەست بەجێو دوای تەواوبوونی ڕووداوەکان ئەمەریکا بزوتنەوەی تالیبانو ڕێکخراوی قاعیدەی تۆمەتبارکرد بەئەنجامدانی ڕووداوەکان، کە ئەمەش گەورەترین بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە ئەمەریکا پێشتر بە دروستبوونی ڕووداوەکانی دەزانی، هەربۆیە لە نزیکترین کاتو ماوەداو بەبێ لێکۆڵینەوەی ورد، خێراو دەستبەجێ (قاعیدە) ی دەستنیشانو تۆمەتبارکرد لە پشتی ڕووداوەکانەوە، بێگومان ئەمەریکا لەپێش ڕووداوەکانی (١١) ی ئەیلولەوە نەخشەسازی کربوو بۆ دەستگرتنو داگیرکردنی ئەفغانستان، بەڵام ڕوداوەکانی (١١) ی ئەیلولی قۆستەوەو نەخشەکەی پێش خست....

ئەمەریکا لە داگیرکردنی ئەفغانستاندا زۆر ئامانجو مەبەستی هەبوو کە بریتی بوون لەمانە:

أ- حوکمەتی طالبان دەسەڵاتێکی ئیسلامی توندڕەو بوو، بەردەوام هەڕەشە بوون بۆ بەرژەوەندیە باڵاکانی ئەمەریکا لەجیهانداو زیانیان پێدەگەیاندن، هەر بۆیە ئەمەریکا لە فرسەتێك دەگەڕا کە ئەو دەسەڵاتە لەناو بەرێتو جۆرێك لەئارامی بۆ خۆیو بەرژەوەندیەکانی دەستەبەر بکات.

ب-وەك ئاشکرایە کە سنوری ئەفغانستان لکاوە بە سنوری کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە لە بەشی خۆرهەڵاتەوە، بەداگیرکردنی ئەفغاستانو دانانی بنکەی سەربازی تیایدا.

دەتوانێت لە نزیکەوە ببێتە جێی هەڕەشە لەسەر ئێرانو ئاگاداری تەواوی جموجوڵەکانی ئێران بێت لە ناوچەکەدا، کە بێگومان ئێران سەرچاوەی هەڕەشەیە بۆسەر ئەمەریکاو ئیسرائیل بەتایبەتی لەناوچەکەدا، هەروەك ڕابەری گشتی شۆڕشی ئیسلامی ئێران (خومەینی) بە ئەمەریکای دەوت (الشیطان الاکبر) واتە: شەیتانە گەورەترەکە!!!

ج- لە ڕووی خۆرئاواوە ئەفغانستان سنورەکانی بەسنوری پاکستانەوە لکاوەو بەمەش ئەمەریکا دەتوانێت دەستبگرێت یان بەتەواوی ئاگاداری پاکستان بێت کە پاکستان یەکێکە لەو دەوڵەتە ئیسلامیانەی کە خاوەنی بۆمبی ئەتۆمە، بەمەش

ئەمـەریکا دەتوانێـت کاریگـەری لەسـەر پاکسـتان دروسـت بکـات لەسـەر دۆستایەتیکردنی ئەمەریکاو ئیسرائیل لە دژایەتیکردنی (هندستان) چونکە هندستان تاکە وڵاتە کە دژبێت لەگەڵ پاکستاندا.

هەربۆیە سەرۆکی پاکستانی (پرویز موشەرەف) دانیـا بـە قـەوارەی زایۆنی ئیسرائیلداو بەمەش چەکی ئەتۆمی پاکستان خرایە ژێر چاودێری ئەمـەریکاوەو، پاکستان دەرکرا لە لیستی ئەو وڵاتانەی کە دژایەتی ئیسرائیلیان دەکردو هاودەم بوون لەگەڵ نەیارانیدا.

د- لە هەمووی گرنگتر ئەمەریکا بەداگیرکردنی ئەفغان گەورەترین دەستکەوتی دەست دەکەوت، ئەویش لـە سنورەکانی ئاسیای ناوەراست کـە بەشێك بـوون لـە یەکێتی سۆڤیەتی جاران، کە خاکی ئەو ناوچانە معادنێکی لە ئاسنو مس تێدا بـوو، پاشان لەگـەڵ ئەوەشدا خـاوەنی غـازو نـەوتێکی هێجگـار زۆرن، کـە بێگومـان ئـەو وڵاتانەی لەسەر ئەو هێڵە بوون بریتی بوون لە:

*- کازاخستان: لە هەموویان گەورەتر بـوو رووبەرەکـەی بـریتی بـوو لـە (٦٢،٦) ملیـۆن کـم٢ و ژمـارەی دانیشـتوانی بـریتی بـوون لـە (١٥) ملیـۆن کـەسو خـاوەنی گەورەترین کانزایە لە نەوتو غاز، لەگەڵیشیدا بوونی زەوی کشتوکاڵی.

*- تورکمانستان: رووبەری زەویەکەی (٤٤٤) کـم٢، و دانیشـتوانی تـەنها (١،٥) ملیۆنو نیوێکە، ئەمیش بەهەمان شێوە خاوەنی غازو نـەوتی زۆرە .ئێستا شـەریکە ئەمەرکیەکان سەرقاڵن بەبەرهەمهێنانی نەوتو غاز لە دەریای قەزوین.

*- ئۆزبەکستان: رووبەرەکـەی (٣٠٠) هـەزار کـم٢، بـەو ژمـارەی دانیشـتوانی زیاترە لە (١٢) ملیـۆن کـەس، ئـەم جێگەیـە دەوڵەمەنـدە بەسـەرمایەی کشـتوکاڵی بەتایبەت لۆکەو ساڵانە (٣) ملیۆن تەن بەرهەم دێنیٚ...

هـ- داگیرکردنی ئەفغانستان کارئاسانی زۆری کرد بۆ شـەریکاتەکانی ئەمـەریکا لەبەرهەم هێنانی غازو نەوتداو رێگـەی بـۆ نزیـك کـردەوە، ئـەویش بەگواستنەوەی

بۆریبە نەوت‌و غازەکانی لە ئەفغانستان‌و پاکستانەوە بەرەو دەریای عمان‌و لەویشەوە بۆ جیهان، کە بێگومان ئەم ڕێگەیە کەمترین دەستمایەی تێدەچوو.

و- لەکاتی ڕوودانی ڕووداوەکانی (١١) ی ئەیلولدا زۆرێك لە خەڵکی‌و دەوڵەتە زلهێزەکان هانی ئەمەریکایاندا کە مافی خۆیەتی بدات لە طالبان‌و قاعیدە، ئەمە ڕێگە خۆشکەرێك بوو بۆ ئەمەریکا کە ئەم کارە ئەنجام بدات‌و ئەمەریکا ئەم هەلەی قۆستەوە پێش ساردبوونەوەی دڵی گەرمی دەوڵەتان لە پاڵپشتی کردنی ئەمەریکادا.

هەر لەم کاتەدا زۆر ئاسان بوو بۆ ئەمەریکا کە داوا بکات لە وڵاتانی ئەوروپا یارمەتی بدەن لەسەر ئەم جەنگە کەبەناوی نەهێشتنی تیرۆرەوە سازی کرد لە جیهاندا!!!

## دوا وتە لەم داگیرکردنەدا:

ئەمەریکا ڕووداوەکانی (١١) ی ئەیلولی بەهەل زانی‌و تەواوی ئامانجەکانی خۆی تێدا بەجێ هێنا، سەپاندنی جیهانگیری(العولمة) بەسەر جیهانداو داگیرکردنی جیهان‌و لەناوبردنی هەموو ئەوانەی کەڕێگری لێدەکەن.

هەندێك لەتوێژەرەوانی بواری سیاسی دەڵێن: ((ڕووداوەکانی (١١: ٩: ٢٠٠١) سازێنرا بۆ ئەوەی ئەمەریکا دەست بگرێت بەسەر تەواوی جیهاندا لەلایەن جولەکەشەوە ئەم هەلە قۆزرایەوە، بۆ کۆتایی هێنان‌و لەناوبردنی ڕاپەڕین‌و بزافە دینی‌و نیشتمانیەکانی فەلەستین کە دژایەتی جولەکەیان دەکرد...))

ئەمەریکا تا ئێستاش پێناسەیەکی ڕاست‌و دروست‌و ڕوونی نیە بۆ تیرۆر (ارهاب)، تەنها ئەوەندە نەبێت کە هەرکەس لەڕیزی خۆیدا بن‌و مەترسیان لەسەر بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکاو ئیسرائیل نەبێت ئەوە ئازادی خوازو تێکۆشەرە، بە پێچەوانەشەوە هەرکەس دان بەقەوارەی زایۆنی (ئیسرائیل) دا نەنێت‌و بەبیری ئەمەریکا بیرنەکاتەوەو بەچاوی ئەمەریکاو ئیسرائیل نەبینێ، ئەوە بێگومان تیرۆریستەو لە لیستی ڕەشدایە!!

٣- یەکێکی تر لە دەستکەوتەکانی (١١: ٩: ٢٠٠١) بریتی بوو لە داگیرکردنی عێراق.دوای داگیرکردنی (ئەفغانستان) لەلایەن ئەمەریکاوە، سەرەی عێراق هات لەو پرۆژەیەی کە ئەمەریکاو ئیسرائیل دایان ڕشتبوو، چونکە داگیرکردنی عێراق گەورەترین دەستکەوت بوو سەرەتا بۆ ئیسرائیل پاشان بۆ ئەمەریکا، کە دواتر باسیان لێوە دەکەین(انشاالله).

عێراق خرایە ناو لیستی ڕەشی ئەمەریکاو نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، ئەویش بەبیانووی یارمەتیدانی چەکدارەکانی قاعیدەو لەخۆگرتنیان، پاشان بوونی چەکی کۆمەڵ کوژو حەشاردانی لەلایەن (صدام حسین) ەوە، بۆ ئەم مەبەستە لیژنەکانی پشکنینی نێودەوڵەتی لە ساڵی (٢٠٠٢) گەڕانەوە بۆ عێراق بەسەرۆکایەتی (جون بليك) بە ئامانجی گەڕان بەشوێن دۆزینەوەی چەکی کۆمەڵ کوژ (الاصلحة ذات الدمار الشامل).

پاشان ڕاسپاردنی (محمد برادعي) بە گەڕانو پشکنینی چەکی ئەتۆمی عێراق!!

سەرەنجامو دوای ساڵێك زیاتر لەهەوڵدان لەم بوارەدا بەدەست بەتاڵیو نەدۆزینەوەی هیچ یەکێك لەوانەی کە بۆی هاتبوون گەڕانەوە- لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان باش دەیانزانی کە عێراق هیچ یەکێ لەو چەکە قورسانەی نیە کە ئەمان بەشوێنیدا دەگەڕێن، بەلام لە سەرەتاوە نەخشەو پیلانیان بەم بیانووەوە دەستی پێکرد- دوای ئەوەی کە ئەمەریکاو بەریتانیا نەیانتوانی بۆ کۆمەڵگای نێودەوڵەتیو جیهانی بسەلمێنن بەوەی کە خاوەنی چەکی کۆمەڵکوژو ئەتۆمە، بەدروستکردنی درۆو بانگەشەی بێ بنەما لەسەر عێراق، ئەویش بەوەی کە ئەمەریکاو بەریتانیا ئەوەیان ڕاگەیاند کە عێراق بازرگانی لەگەڵ وڵاتی نەیجیریادا بەستووە کە چەند تەن لە یۆرانیۆمی لێ بکڕێت!!

سەرەنجام ئەو بانگەشە درۆیانەی کە دەیانکرد هیچی بەڕاست نەگەڕا، گەرنا بۆ لەدوای لەناوبردنی دەستەلاتی دیکتاتۆری (صدام) هیچ یەکێك لە چەکی ئەتۆمو چەکی کۆمەڵ کوژ لە عێراقدا نەدۆزرانەوە!!؟

پیلانەکە ئاشکرایەو بەڵگە بۆهێنانەوەی پێویست نیەو سەرەنجام ئەمەریکا بەیاوەری لەگەڵ بەریتانیاداو بە پیلانی نهێنی جولەکە، لە عێراقیانداو داگیریان کرد...کە بێگومان لەژێر فشاری (ئیسرائیلدا) ئەم کارە ئەنجامدرا، ئەویش لەرێگەی توندڕەوترین جولەکەی بەرپرسی لیژنەی سیاسی سەربازی لە پەنتاگۆن بەناوی (( "ریتشارد بیدڵ" کە تەواوی بڕیارەکان لەوەوە سەرچاوەیان دەگرتو ئەمەریکاو بەریتانیاش جێبەجێیان دەکرد...

لە پەڕاوەکانی (المحرر العربی) بە ژمارە (٣٨٧) ی ئازاری (٢٠٠٣) داو لە لاپەڕە (٦) دا نوسراوێك هاتووە دەڵێت:

((ریتشارد بیدل یقود الحرب الامریکیة الاسرائیلیة من البیت الابیض ضد العراق) ).

واتە: (ریتشارد بیدڵ) بوو کە ئاگری جەنگی ئەمەریکا ئیسرائیلی لە کۆشکی سپیەوە هەڵگیرساند دژی عێراق.

پاشان تەقریرێکی حیزبی لیکۆدی توندەڕەوی ئیسرائیلی دەڵێت: دەبێت ئەمەریکا جەنگ دژی عەرەبو موسوڵمانان بەرپا بکات تەنانەت ئەگەر زیانەکانی ئەم جەنگە بگاتە هۆی لەناوچونی ئەمەریکاش!!!

ئەمەریکا هێندە سوور بوو لەسەر بەرپاکردنی ئەم جەنگە گوێی بۆ ڕازیبوونی ئەنجومەنی ئاسایشو نەتەوە یەککگرتووەکان نەگرتو یەك لایەنە هەڵسا بەجێبەجێ کردنی ئەم کارەو جەنگی بەرپاکرد، هەرچەندە بەریتانیا بەشێوەیەکی جوزئی بەشداری کرد لەگەڵ ئەمەریکاو بەرپرسیارێتی بەصرەیان خستە ئەستۆ، وە ئەوەشی کە دەڵێن هێزی هاوپەیمانان، لەڕاستیدا هەر هێزی ئەمەریکا بوو بۆ ئەم مەسەلەیە، شەڕی ئەمەریکا لە دژی عێراق بۆ مەبەستی گۆڕینی دەسەڵات نەبوو لەعێراقدا بەڵکو بۆ مەبەستی بەرژەوەندیە باڵاکانی خۆیو ئیسرائیل بوو کەدواتر باسی لێوە دەکەین، بەڵکو لە بڕیاری نەتەوە یەککگرتووەکاندا ئەو یاسایە هەیە کە بۆ هیچ وڵاتو زلهێزێك نیە لە دنیادا، دەست وەرداتە وڵاتێکی ترو سیستەمی حوکمو دەسەڵاتی بگۆڕێت، گەر زۆر خراپیش بێت، ئەوە کارێکە تەنها پەیوەستە

بەو گەلو میللەتەوەو دەبێت ئەوان بیگلێن، بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا داگیرکردنی هێندە گرنگ بووە بەنیسبەت ئەمەریکاوە گوێ بەهیچ یەکێ لەم یاساو بڕیارانەداو کاری خۆی ئەنجامدا، لەکاتێکدا کە هیچ پاساوێکی دروستو یاسای نەبوو لەبەرپاکردنی ئەم جەنگەدا، تەنها ئەوەندە نەبێت کە قەوارەی ئیسرائیل فشاری زۆری لەسەر ئەمەریکا دروست کردبوو کە دەبێت ئەم جەنگە بەرپابکاتو بواری گەڕانەوەی نیە!!!

جەنگ تەواو بوو دەسەلاتی تاك ڕەویو ستەمی سەدام ڕوخێنراو زۆربەی خەلکی واتێگەیەنرا کە ئەمەریکا ڕزگارکەرە نەك داگیرکەرو لە پێناو ڕزگارکردنی گەلانی عێراقدا هاتووە تا ڕزگاریان بکات لە درندەیەکی وەك (صدام حسين)!!!

بەڵێ ئەمەریکا عێراقی ڕزگارکرد لەدەست ستەمی صدام بەلام ئەو پەندەی بەسەردا جێبەجێ بوو کە دەڵێت: ((چاکی مەکە با خراپ نەبێت)) ئەمەریکا لەپێناو بەرژەوەندی بالای خۆیو ئیسرائیلدا هاتو سستەمی تاك ڕەوی حیزبی بەعسی لە عێراقدا کۆتایی پێ هێناو ئەمە کارێك بوو لەبەرژەوەندی گشتی سەرجەم عێراقیەکاندا بوو، واتە چ ئەمەریکاو چ عێراقیەکان لەسەر یەك هێل بوون لەم بوارەداو هەردوولا سودمەند بوون لە کۆتایی هێنان بە حوکمی (صدام) ئێمەی عێراقی سودمەند بووین لەوەی کە ڕزگارمان بوو لەدەست (صدام) و دارو دەستەکەی، کە لەڕاستیدا ڕوخاندنی صدام ئەستەم بوو بەدەستی عێراقیەکان چ لەباکورو بە دەستی ئێمەی کوردو چ لەباشور بەدەستی عەرەبەکان!!

ئەمە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە، لەبەرامبەریشدا سودی ئەمەریکاو جولەکە لەم مەسەلەیەدا بریتی بوو لەمانە:

١- بە داگیرکردنی عێراق ئەمەریکا دەستی گرت بەسەر سەرجەم سەروەتو سامانی عێراقداو ئەو بووە خاوەنداری گشتی، کە گرنگترینیان نەوت بوو، ئەمەش خەونی ئەمەریکا بوو، هەر لەمێژەوە چاوی لەم سامانە گرنگە بڕی بوو، بۆ دەرفەتێك دەگەڕا کە داگیری بکات، ئێستەو لەم کاتەدا خەوی چەند ساڵەی هاتەدی!!!

٢- بەداگیرکردنی عێراق ئەمەریکا توانی دەست بگرێت بەسەر دڵی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، یان زاڵ بێت و دەست بگرێت بەسەر گەورەترین ناوچەی بەرهەمهێنانی نەوت و ئەو جێگایانەی کە نەوتی ئیحتیاتی تێدایە لە جیهاندا.

٣- ئەمەریکا بەم داگیرکردنە توانی بنکەیەکی تری سەربازی نوێ لەیەکێکی تر لە وڵاتانی عەرەبی دابمەزرێنێ لەدوای کوەیت کە عێراق بوو. هەرچەند لەوڵاتانی تری خلیج بوونی هێزی سەربازی ئەمەریکی لێبوو وەك: (قطر) و قاعیدەی بەحری لە (بحرین).

٤- کاتێك ئەمەریکا ئەم کارانەی ئەنجامدا تەواوی نەوتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەکەوێتە ژێردەستی و بە ئارەزووی خۆی سودی لێ دەبینێ، پاشان دەوڵەتانی تری لێ دوور دەخاتەوە و نایەڵێت سوودی لێ وەربگرن.

٥- سەرەنجام دووڕگەی عەرەبی ناونابرێت بە دوڕگەی عەرەب، بەڵکو ناودەبرێت بە دووڕگەی ئەمەریکا چونکە تەواوی هێزە زەمینی و ئاسمانی و دەریاییەکانی خۆی تێدا جێگیر دەکات و مانۆڕی سەربازییان تێدا ئەنجام دەدات بەبێ ئەوەی توشی هیچ ئاستەنگێك ببێت لەلایەن دەوڵەتانی دوور و نزیکەوە.

٦- داگیرکردنی عێراق گەورەترین سودی بۆ (ئیسرائیل) تێدا بوو، چونکە بۆ لەناوبردنی حوکمی صەدام و حیزبی بەعس حوکمەتێکی نوێ لە عێراقدا دروست بوو کە دەستکردی ئەمەریکا بوو، پاشان دانینا بە قەوارەی (ئیسرائیلدا) هاوڕێ لەگەڵ ئەو وڵاتە عەرەبیانەی تردا کە دانیان نابوو بە حوکمەتی (ئیسرائیلدا) لە پێشتر.

بەمەش ئیسرائیل دەرگاکانی ئابووری و پەیوەندی سیاسی چاکتر دەبێت لەگەڵ کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی و لە ڕووی ئابوریەوە. پێشکەوتنێکی باشتر دەبینێت بەخۆیەوە، کە ئەمەش یەکێکە لە هەرە ئامانجە گەورەکانی (ئیسرائیل) لە ناوچەکەدا.

٧- بەداگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمەریکاوە (ئیسرائیل) ڕزگاری بوو لە دژایەتی و هەڕەشەو، بەمەش ئارامیەکی تری یەکێك لە دەوڵەتە نەوتیەکانی ناوچەکە، کە (عێراق) بوو دەست کەوت. عێراق لە ڕیزی ئەو وڵاتانەدا خۆی بینیەوە

که هەرگیز دژایەتی (ئیسرائیل) ناکات هەروەك (مصر) و زۆرێك لە ولاتانی عەرەبی تری ناوچەکە...

٨- یەکێکی تر لەدەستکەوتەکانی تری ئەمەریکاو جولەکە بەتایبەتی بریتی بوو لە مەحروم کردنی گەلی فەلەستینیو بزافە بەرهەلستکارەکانی لە یارمەتیو کۆمەکیو پارەی عێراق، کە پێشتر یارمەتی دەدران لەلایەن حوکمەتی عێراقیەوە دژ بەجولەکە، بەم داگیرکاریە سەرجەمی ئەو یارمەتیانە کۆتاییان پێ هاتو ئەمەش گەورەترین دەستکەوت بوو بۆ (ئیسرائیل) کە لەم ڕێگەیەوە نەبوایە ئەم خەونەی نەدەهاتەدی!!

٩- دەستکەوتێکی تری ئیسرائیل لەم مەسەلەیەدا بریتی بوو لە جێبەجێ هێنانی گەورەترین خەونی چەندساڵەی کە دەیوت (حدودك یا اسرائیل من النیل الی الفرات).واتە: سنوری تۆ ئەی ئیسرائیل لە دەریای نیلەوە تا دەریای فورات، لە عێراق.

**دوا وتە لەم باسەدا:**

دەسەلاتداری گەورەو ئاراستەکەرو مامۆستای ئەمەریکا لە پشتی پەردەکانەوەو لە تەواوی جەنگو ڕووداوەکاندا (ئیسرائیل) بوو، چونکە بەرژەوەندی ئیسرائیل لە ناوچەکەدا لە پێش بەرژەوەندی ئەمەریکاشەوەیەو ئەمەریکا لەپێناو دابینکردنی ئارامیو ئاسایشو دەستکەوت بۆ ئیسرائیل ئامادەیە جەنگ لەگەڵ هەموو جیهاندا بەرپابکاتو ناویان بنێت تیرۆرست.

بەداخەوە تەواوی ولاتانی جیهان ئەم ڕاستیە دەزانن، بەتایبەت ولاتانی عەرەبی، بەلام لەبەر خاتری لەدەست نەچونی کورسی دەسەلاتو نەڕەنجاندنی ئەمەریکاو ئیسرائیل لێیان دەنگ ناکەنو وەك شەیتانی کەڕیان لێ هاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا نەك هەر بێدەنگن بەلکو زۆربەیان یارمەتی جولەکە دەدەن بۆ لەناوبردنیو سەرکوتکردنی بزافە دینیو نیشتمانیەکانی ناو فەلەستین وە ئەوەی بۆ جولەکە

ناگونجێت کە دەرهەق بەوان بیکات هەندێك لە وڵاتە عەرەبیە ناسیۆنالیزمە رەگەز پەرستەکان ئەنجامی دەدەن بە ئومێدی ڕازیکردنی جولەکەو ئەمەریکا !!

باسی سێیەم:

## هۆکارەکانی لەناوچوون و هەرەس هێنانی دەوڵەتی پڕ لە ستەمی ئیسرائیل

من بڕوام وایە کە جولەکە تەواوی ئامانجەکانیان هێناوەتەدی لە برگەکانی (برۆتۆکۆلات) دا، ئەویش بەدامەزراندنی دەوڵەتی (ئیسرائیل) ی و هەبوونی هێزی سەربازی پێشکەوتوو، ئابوری بەرزو پێشکەوتنی لە ڕووی سیاسیەوە.

ئیسرائیل ئێستا دەوڵەتێکی ئاسایی نیە، بەڵکو یەکێکە لە دەوڵەتە زلهێزەکانی دنیا کە خاوەنی ئەتۆم و تازەترین چەکی سەردەمە، لەگەڵ ئەوەی کە لەڕووی ئابوریەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە برەودایە، ئەویش بەهۆکاری ئەو یارمەتی و کۆمەکیانەی کە لەلایەن ئەمەریکاوە پێشکەشی دەکرێت.لەگەڵ هەموو ئەم پێشکەوتن و بەرەو پێش چوونەدا ئەمە سەرەتایەکە بۆ کۆتایی هاتن و لەناوچونی ئەو دەسەڵاتە پڕ لە ستەمەی جولەکە لە جیهاندا انشاءالله، (عبدالوهاب المسیری) خاوەنی مەوسوعەی (الیهود والیهودیة والصهیونیة) یە پێش بینی ئەوە دەکات لەساڵی (٢٠٠٣) کە (٢٠-٢٥) ساڵی تر لەدوای ئەو بەروارەوە کۆتایی دێت بە دەوڵەتی زایۆنی (ئیسرائیل) ئەویش لەبەر ئەم هۆکارانە:

### هۆکارە ناوخۆییەکان کە ئاماژە بۆ لەناوچوونی دەوڵەتی (ئیسرائیل)دەکەن

١- دەوڵەتی (ئیسرائیل) لەسەر بنەمای ستەم و داگیرکاری و کوشتنی خەلکی بەناهەق و دەرکردنی ئەو گەلە لەسەر خاکی خۆی دروست بووەو دەبێت ڕۆژێك بێت ئەم ستەمە کۆتایی پێ بێت و خوای باڵادەست تۆڵەیان لێ بکاتەوەو گەلی ستەملێکراویش مافی خۆیان وەربگرنەوە.

شاهێدی لەسەر ئەم هاوکێشەیە زۆرەو بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەر ستەمکارێك ستەمی کردبێت هەر چەند ساڵێکی دیاری کراو بۆی چوەتە سەرو سەرەنجام خوای گەورە تۆڵەی لیٚ سەندووەو ڕیسوای کردووە.

گەر بەخێرایی سەرێك لە ڕابردوو بدەین، ئەم ڕاستیەمان زۆر بەباشی بۆ ئاشکرا دەبێت، ستەمی فیرعەون لەگەلەکەی‌و بەردەوام بوون‌و مۆڵەت پێدانی بۆ چەند ساڵێکی دیاریکراو، سەرەنجام خوای گەورە لەناو دەریادا لەگەڵ سەربازەکانیدا نوقمی کردن‌و تۆڵەی ستەم‌و خۆبەگەورە زانینی چەندین ساڵەی لیٚ کردنەوەو کۆتایی بەو دەسەڵاتە تاك ڕەوو خۆسەپێنەرە هێنا کەستەم‌و بەدکاری‌و کوشتن دیاری دەستیان بوو بۆ گەلەکەیان.

پاشان بێباوەڕەکانی قورەیش کە زیاتر لە (٢٠) ساڵ ئاڵای جەنگیان لە دژی پێغەمبەرﷺ و باوەڕداران بەرز دەکردەوەو هەموو ڕێگەیەکیان گرتەبەر لە ستەملێکردن‌و دەربەدەرکردن‌و کوشتن‌و فڕاندن‌و بوهتان بۆ دروستکردن‌و سەدان شتی تری لەمانە: سەرەنجام کۆتایی هات بە بت‌و بتخانەو ئاڵای ڕەش‌و پڕ لەستەمی قورەیشە بتپەرستە بێباوەڕەکان نەوی کراو کۆتایی هات بەدەسەڵات‌و هێزو بیروباوەڕیان‌و لەبەرامبەریشدا ئاڵای بەرزی (لااله الا الله) سەرکەوت بەسەر هەموو نەیارە ستەمکارەکانیدا.

پاشان ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی فارس‌و ڕۆم لەکۆنداو کۆتایی هات بەهێزو دەسەڵاتی بێ سنوریان، بەڵگەیەکی ترە لەو بەڵگانەی کە سەرەنجامی هەموو ستەمکارێك هەر تیاچوون‌و لەناوچوونە، پاشان ڕوداوو بەسەرهاتەکانی سەدەی ڕابردوو باشترین بەڵگەن لەسەر ئەم خاڵە.

شۆڕشی جەزائیر لە دژی داگیرکەری فەرەنساو دوای (١٣٠) ساڵ لە ستەم‌و داگیرکاری‌و ڕشتنی خوێنی هەزاران کەس بەناهەق، سەرەنجام ملیان بەفەرەنسا نەوی کردوو خاك‌و وڵاتیان پیٚ بەجیٚ هێشت، بەڕابەرایەتی جەبهەی تەحریری جەزائیری‌و کەسایەتی ناوداری ئەو بزوتنەوەیە بەناوی(أحمد بن بلا).

پاشان حوکمی (کمال ئەتاتورك) ی عەلمانی لەتورکیاداو دوای (٧٠) ساڵ زیاتر لە دژایەتی کردنی عەقیدەو بیروباوەڕو ڕەسەنایەتی خەڵكو قەدەغەکردنی دینو دوورخستنەوەی لە دەسەڵاتو لە بەرامبەریشدا بڵاوکردنەوەی بەدکاریو خراپەکاری، سەرەنجام ئەو دەسەڵاتە عەلمانیە خۆسەپێنە، کۆتایی هاتو حیزبێکی ئیسلامی بەڕابەرایەتی (رجب طیب ئۆردوغان) جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەستو بوونەوە بە فەرمانڕەوا لە تورکیادا.

هاتنە سەرەوەی شیوعیەکان لە ڕوسیاو لەدوای ساڵی (١٩١٧) و ئەنجامدانی هەزارەها کاری دزێو لە کوشتنی بەکۆمەڵو ستەمو نادادوەری کۆمەڵایەتیو بڵاوکردنەوەی بێکاری لەو وڵاتەدا، سەرەنجام لەساڵی (١٩٩١) ئەو دەسەڵاتە پڕ لە ستەمە ڕوخێنراو ڕەوانەی زبڵخانەی مێژوو کرا.

بەدەر لە هەموو ئەم نمونە واقیعیانەو لە هەمووی دیارترو حاشا هەڵنەگرانەتر، ژیانی پڕ لە ستەمو غەدرو خوێناوی حیزبی بەعسە لە عێراقدا.

دوای هاتنە سەر دەوری بەعسیەکان لە عێراقدا ڕەوتی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوریو سەرجەم لایەنەکانی تریان گۆڕی بەو شێوەی کە خۆیان ئارەزوویان لێدەکرد.

حیزبی بەعسی تاکڕەو هەموو دەزانین کە چی لە عێراقو عێراقیەکان کرد لە کوشتنو لەناوبردنو تەعریبکردنی کوردو ڕاگواستنو کوشتنی بەکۆمەڵو کردنی زەوی عێراق بە گۆڕی بەکۆمەڵو داخستنی دەمو هاواری ستەملێکراوانو دامەزراندنی هەزارەها دەزگای سیخوڕیو دائیرەی ئەمنو زیندانی بەکۆمەڵو تاکە کەسیو هەزاران شتی تری لەمانە دەرهەق بەتەواوی نەتەوەکانی عێراقو لەسەرو هەموشیانەوە میللەتی کوردی خێر لەخۆ نەدیوو، سەرەنجام هەموومان بینیمان کە (صدام) و حیزبە ئەفلەقیەکەی چی بەسەر هاتو چارەنوسیان بەچی گەیشت- کە لێرەدا بواری باس لێوەکردنی نیە.

ئەمانەو دەیان نمونەی تری هاوشێوەی ئەوانە بەڵگەی دروستو واقعین لەسەر لەناوچونی هەر دەسەلاتو هێزو کۆمەڵو دەوڵەتێك کە ستەمو خوێن ڕێژیو سوکایەتی بەرامبەر بەکەسانی تر بکەن!!

خوای گەورەش لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿ وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴾ الكهف: ٥٩.

بێگومان ئەم یاسایە بەسەر جولەکەی ستەمکارو خوێنڕێژو ئەمەریکای پاڵپشتیشیدا بە فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ دەبێت (إن شاءالله) و لە داهاتوویەکی نزیکدا بە چاوانمان دەیبینین، چونکە (ئیسرائیلو ئەمەریکا) دوایلەکانی ستەمو خوێنڕێژیو داگیرکارییان بریوە لە تەواوی جیهاندا.

٢- یەکێکی تر لەهۆکارە ناوخۆییەکانی ڕوخانی دەوڵەتی ئیسرائیل بریتیە لە ڕاپەڕینو بەرهەڵستی بزوتنەوە فەلەستینیەکان، بەتایبەتی ئەو بزافە ئیسلامیە ڕەسەنانەی کە بەڕاستیو بەبێ دوو ڕوویی لەبەرامبەر قەوارەی زایۆنیدا وەك شاخ مێخیان داکوتاوەو بەگیانو ماڵیان دژایەتی جولەکە دەکەنو ئامادەی سادەترین تەنەزول نین بۆ ئەو قەوارە ستەمکارەو سازش لەتەنها بستێکی ئەو خاکە داگیرکراوە ناکەنو دەجەنگن لەپێناو سەرکەوتن یان شەهیدبوون، بوونی ئەو بزافە ئیسلامیە ڕەسەنانە کە بەڕاستی ئەوانن نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵکی فەلەستینو لە سەرو هەموویشیانەوە بزوتنەوەی (حەماس) کە جولەکەی زۆر پەستو بێتاقەت کردووەو سەرچاوەی سەرەکیە لەترسو دڵەڕاوکەو نائارامی بۆ ئیسرائیل!!

بەڕاستی ئیسرائیل سەری سوڕماوەو هەرگیز پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە ئەو بزافە ئیسلامیو نیشتمانیانە بەگشتیو (حماس) لە کەرتی غەزەی ئابلۆقەدراو بەتایبەتی، هێندە ئازاو خۆڕاگرو گیان فیدایيو بەدرێژای مانگێكو بەشەوو بەڕۆژ لە ڕێگەی دەریاییو ئاسمانیو زەمینیەوەو بەبەکاهێنانی هەموو جۆرە چەکێکی سوكو قورسو قەدەغەکراوی وەك (فسفۆڕ) خۆبگرنو نەهێڵن سەربازانی سوپای جولەکە تەنها بستێك لەو خاکە داگیربکەن؟!

سەرەنجام سوپای جولەکە لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٩) بەڕیسوایی‌و بەبێ هیچ دەستکەوتێك گەڕانەوە ئیسرائیل‌و بەردیان بۆ نەخرایە سەر بەرد!!!

هەر بۆیە ئیسرائیل لە پێناو ڕیشە هەڵکێشانی ئەم بزوتنەوە ئیسلامیە ڕاستەقینە بەهێزەدا هەموو ڕێگەیەکی گرتۆتەبەر، هەر لەدانانی ئابلۆقەی ئابوری لەسەر غەزەو لە ساڵی (٢٠٠٧) وەوەو داخستنی مەرزی (ڕەفەح) کە خاڵی سنوری غەزەو میصرەو دژایەتی کردنی هەموو ئەو کەس‌و لایەن‌و دەوڵەتانەی کە یارمەتی‌و کۆمەکی خەڵکی گەمارۆدراوی (غەزە) دەکەن، هەروەك دەست گرتن بەسەر کەشتی ئازادیدا لە بەرواری ٣١: ٥: ٢٠١٠، کە لەتورکیاوە بەرەو غەزە بەڕێکەوت‌و لە ئەنجامدا زیاتر لە (١٠) کەسی نێو ئەو کەشتیە لەلایەن سەربازە دڕندە خوێنڕێژەکانی جولەکەوە شەهید کران‌و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بریندارکردن، پاشان دەستیان گرت بەسەر کەشتیەکەو تەواوی سەرنشینەکانیداو بەرەو سنورە دەریاییەکانی ئیسرائیل بەڕێیان کرد.

ئەم ستەمە یەك لەدوای یەکانەی (ئیسرائیل) دەرهەق بە گەلی ستەملێکراوی فەلەستین هەردەبێت ڕۆژێك کۆتایی بێت‌و جولەکە پاداشتی کردەوە چەپەڵەکانیان وەربگرن.

٤- یەکێکی تر لەو هۆکارانە بریتیە لەوەی کە جولەکە لەفەلەستیندا فەسادی ئەخلاقی‌و بەدڕەوشتی زۆریان لەنێواندا بڵاو بۆتەوە، بەجۆرێکی دیارو بەرچاو کە تەواوی سنورەکانی شکاندووە، ئەوانەی جولەکەن‌و لە ئیسرائیلدا ژیان بەسەر دەبەن زۆربەی هەرە زۆریان خەریکی مومارەسەی کاری لەزەت وەرگرتن لەڕێگە نادروست‌و خراپەکانەوە، ئەمە وای کردووە لە جولەکەی دانیشتوانی ئیسرائیل کە هەست بەچارەنوسێکی ڕەش‌و نادیار بکەن، تەنانەت (تل أبیب) بەشاری بەدکاری‌و ئیشە قێزەونەکان ناسراوە لەجیهاندا!!!

جولەکە لە فەلەستیندا باوەڕی بتەویان بەوە هەیە کە چارەنوسیان نادیارەو وەك تەختەی سەرئاو دەڕوانن بۆ ژیانی خۆیان، چونکە ئەو خاکەی لەسەری دەژین

داگیریان کردووەو هەردەبێت ڕۆژێك بێت بگەڕێتەوە دەستی خاوەنە دروستەکانی خۆی.

بەشێکی زۆری نائارامی جولەکە لەفەلەستیندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مامەڵە وەحشی گەرانەی کە قەوارەی زایۆنیو بەبێ بەزەییانەو دڵڕەقانە ئەنجامی دەدەن لەگەڵ خەڵکی بێچارەو دڵشکاوی فەلەستیندا بەتایبەت خەڵکی غەزەو (ضفەی خۆرئاوا) لەم پێناوەدا هەندێك لە حیزبە جولەکەکانی ئیسرائیل تەواوی پەستیو بێتاقەتی خۆیان دەردەبڕن لە سیاسەتە وەحشیەکانی ئیسرائیلو بانگەشەی ئەوە دەکەن کەئاشتی لەگەڵ فەلەستینیەکاندا ئەنجام بدرێتو لەڕێگەی گفتوگۆوە کێشەکان یەکلا بکرێتەوە نەك لەڕێگەی زەبروچەکەوە.

٥- چوارەم هۆکار لەهۆکارەکانی تیاچوونو لەناوچوونی دەوڵەتی پڕستەمی (ئیسرائیل) بریتیە لەدیاردەی (دیموگرافی) کە تایبەتە بەزانستی ئاماری دانیشتوان، بەتایبەت لەڕووی توێژینەوەی ژمارەی لەدایك بوونو مردنو تەندروستیو ژن هێنان دەکۆڵێتەوە[1].

ئەم حاڵەش لەڕاستیدا گەورەترین مەترسی لەلای جولەکە دروستکردووە، ئەویش بەوەی ئافرەتانی فەلەستین توانایەکی باشیان هەیە لە منداڵبوونو زیادبوونی ڕێژەیان، کە ئافرەتانی فەلەستینی دەتوانن زیاتر لە (١٠) منداڵیان ببێت بەبێ ئەوەی توشی هیچ حاڵەتێکی تەندروستی ببن، بەڵام ئافرەتانی جولەکە بەشێوەیەکی گشتی نایەڵن لە دوو منداڵ زیاتریان ببێت، مەگەر هەندێکیان نەبێت کە وەك حاڵەتێکی (شاز) (٥) منداڵیان ببێت یان زیاتر.

بەم پێیەش ژمارەی فەلەستینیەکان چەند بەرامبەری ژمارەی جولەکەکان ڕۆژبەڕۆژ لەزیاد بووندایە، کە ژمارەیان (٥) ئەوەندە زیادی کردووە بەپێی ئامارەکان لەساڵی (١٩٤٨) ەوە تا ئێستا !!

---

١- فەرهەنگی سیاسی سەبا: لاپەڕە (١١١).

بێگومان ئەم حاڵەتەش ترسو دڵەڕاوکێی زۆری لەلای جولەکە دروست کردووەو بەخەتەرێکی زۆری دەزانن لەسەر خۆیان.

لەبەرامبەر قەرەبوکردنەوەی ئەم حاڵەتە نابەرامبەرەدا حوکمەتی ئیسرائیل سەرجەمی ئەو هۆکارانەی گرتووەتەبەر کە تەواوی جولەکە پەرتەوازەکانی جیهان بگێڕێتەوە بەرەو فەلەستین‌و هەموو کارئاسانیەکیشیان بۆ ئەنجام دەدات.بەڵام هەوڵەکانیان بێ بەرهەمەو جولەکەکانی دەرەوەی فەلەستین لەوە حاڵی بوون کە باری ئاسایشی فەلەستین‌و حوکمەتی ئیسرائیل ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوو لە ئاڵۆزی دەکات‌و ئاستەنگی گەورەی بۆ دروست دەبێت‌و لەبەرامبەریشدا جوڵەو بزافە نیشتمانی‌و ئیسلامیەکانی بەرگری فەلەستینی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پێ دادەکوتن‌و بەهێز دەبن‌و مل نادەن بۆ حوکمەتی ئیسرائیل.

## هۆکارە دەرەکیەکان، کە ئاماژە بە ڕووخانی دەوڵەتی ئیسرائیل دەکەن

١- هۆکاری مێژوویی: بەدرێژای مێژوو وڵاتی شام دووچاری داگیرکاری‌و دەست بەسەراگرتن‌و خوێن ڕشتنی زۆر بووە لەلایەن دەستەڵات داران‌و زۆردارو گەلانی ترەوە، بەڵام سەرەنجام داگیرکەران وەدەر نراون‌و توشی شکستی قورس هاتوون‌و کۆتایی بەدەسەڵاتیان هاتووە، لەم پێناوەدا تەنها یەك نمونە لە سەدان نمونە وەردەگرین ئەویش شەڕی صەلاحەدینی ئەیوبی بوو لەگەڵ گاورە خاچ پەرستەکاندا، ئەمەش دوای لاوازبوون‌و لەت بوونی خەلافەتی عەباسی لە بەغدادو خەلافەتی فاطمی لە قاهرە، خوای گەورە (صەلاحەدینی ئەیوبی) ناردو سەرجەم موسوڵمانە پەرتەوازەکانی یەکخستەوەو سەربازگەلێکی بەهێزو مەشقپێکراوو ئامادەی لێ دروست کردن‌و خۆی بووە سەرکردەیان لە دژی خاچ پەرستان‌و لەئەنجامدا سەرکەوتن بەسەریاندا لە جەنگی (حطین) ی بەناوبانگدا، (قدس) ی لەدەست خاچ پەرستان ڕزگارکردو پاشان کۆتایی بەدەسەڵاتی گاورە خاچ

پەرستەکان هێنا لە فەلەستین و شامدا، ئا بەم جۆرە تەمەنی ئیسرائیل هەرچەند زۆربێت و درێژە بکێشێت ئەوە بێگومان هەر ڕۆژێك کۆتایی پێ دێت(انشاءالله).

٢- هۆکاری ئەمەریکی: پێشتر باسمانکرد کە ئەمەریکا هۆکاری سەرەکیە لە یارمەتی دان و پشت ئەستورکردنی قەوارەی زایۆنی (ئیسرائیل) و بەهەموو شێوەیەك دەستی دەگرێت و لە ڕووی سیاسی و ئابوری و سەربازی و سەرجەم بوارەکانی ترەوە یارمەتی و کۆمەکی دەکات، گومانیش لەوەدا نیە کەهێزی ئابوری تاکە هێزە بۆ گەشەکردن و بنیاتنانی هەموو دەوڵەت و دەستەڵاتێك لە جیهاندا، ئابوری ئەمەریکاش یەکێکە لەهەرە لایەنە ئابوریە بەهێزەکانی دنیاو توانا ئابوریەکانی هاوتایان نیە لەجیهاندا، بەرهەمی ئەمەریکا ٣١٪ی بەروبووم و بەرهەمی جیهانی پێك دێت، لە بەرامبەردا یەکێتی ئەوروپا ٢٦٪ و یابان ١٥٪.

فراوان بوون و زاڵبوونی ئەمەریکا لە جیهاندا پشت ئەستورە بەو هێزە سەربازیە پێشکەوتووەی کە هەیەتی و بنکەی سەربازی لە زۆربەی وڵاتانی جیهان بەتایبەت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دامەزراندووە، ئەمەش لەپێناو درێژەپێدان... دژایەتی پێکردن و سەرکوتکردنی هەموو ئەو هێزو دەسەڵاتانەی کە لەبەرامبەریدا ڕادەوەستن، هەموو ئەمانەی کە باسمانکرد پێویستیان بەتوانای ئابوری قورس هەیە، ئەمەریکا لەساڵی (٢٠٠٥) بڕی ئەو مەسرەفەی کە کەوتە سەرشانی گەیشتە (٤٦٤) ملیار دۆلار.

مەسرەفی (١٥٠) هەزار سەربازی ئەمەریکی لە عێراق (٣-٤) ملیار دۆلارە مانگانەو هیچ وڵاتێکیش بەشداری ناکات لەگەڵیدا.

سەرەنجامی هەموو ئەم خەرجیانەی لەسەر شانی ئەمەریکادایە، نرخ و بەهای دۆلاری ئەمەریکی ١٢٪ی لەدەستدا لەساڵی (٢٠٠٢) لەبەرامبەر دراوەکانی تردا وەك (یۆرۆ) ی ئەوروپی و (یەن) ی یابانی، لە ساڵی (٢٠٠٣) دا ڕێژەی دۆلار ٢٥٪ ی دابەزی لەبەرامبەر (یۆرۆ) ی ئەوروپیدا. لەگەڵ ئەمانەشدا ڕێژەی کاڵا هێنراوەکان بۆ ناو ئەمەریکا بەڕێژەی ٤٣٪ زیاتر بوو لە ڕێژەی شتە هەناردەکان (الصادرة الواردة) هەرچەند ئەمەریکا هەوڵی زۆریدا کە ئەم هاوکێشەیە یەکسان بکاتەوە بەڵام

ئەستەم بوو کەبۆی ئەنجام بدرێت، ئەویش لەبەر بێتوانیی کێشمەکێشی کالا ئەمەریکیەکان لەبەرامبەر کالا ئەوروپیەکان لە بازاڕەکانی جیهاندا.

سەرەنجامی ئەم هاوکێشانە لەوەوە سەردەردەکەن کە زۆر چاوەڕوان دەکرێت لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەمەریکا لەڕووی ئابوریەوە داڕوخێت، بەلگەش لەسەر ئەم ڕاستیە بریتیە لە ئیفلاس کردنی زۆربەی شەریکاتەکانو داخستنیانو زیادبوونی ڕێژەی بێکاری (بەتالە) لە ئەمەریکاو هیچ تیانەمانی بانقەکان بەهۆی مامەلەی (سو) کاری (الربا) و بێ نرخ بوونی دۆلاری ئەمەریکی لەئاست دراوەکانی تر بەتایبەت (یۆرۆ) و هەروەها بێ نرخ بوونو شکانی کالا ئەمەریکیەکان لە بازاڕەکانی جیهاندا بەهۆکاری ئەو بۆچوونە خراپەی کە ئەمەریکا بۆ خەلکی دروست کرد لەبەرامبەر خۆیدا، ئەویش بەهۆی داگیرکایو وەلاتانو مومارەسەکردنی سیاسەتی چەوتو پشت گیریکردنی نادروستی ئیسرائیلو کوشتنی بەناهەقی خەلکو دەنگ نەکردنی لەو دەریا ستەمو خوێن ڕێژیەی کە جولەکە ئەنجامی دەدەن دەرهەق بە گەلی فەلەستینی....

هەرەس هێنانی ئەمەریکا لە ڕووی ئابوریەوە سەرەتایەکە بۆ هەرەس هێنانی لە ڕووی سەربازیشەوە، چونکە ئەو هەموو بنکە سەربازیە زەبەلاحانەی کە ئەمەریکا هەیەتیو زۆربەی لە ولاتاندا جێگیر کردووە مانگانە پێویستی بە ملیاران دۆلارە بۆ مەسرەف کردنو بەڕێوەبردنی، ئەمەش کارێکی ئەستەمە گەر لەڕووی ئابوریەوە هەرەس بهێنێت....

دیسانەوە هەرەسهێنانی ئەمەریکا لە ڕووی ئابوریەوە کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبێت لەسەر لاوازبوونی قەوارەی زایۆنی ئیسرائیل، چونکە تاکە پالپشتی ئیسرائیل لە جیهاندا لە ڕووی ئابوریەوە تەنها ئەمەریکایە، گەر ئەمەریکا لە ڕووی ئابوریەوە ئەمە حالی بێت!! سەرەنجام ئیسرائیلیش هەمان چارەنوس چاوەڕوانیەتی کە کەوتنو هەرەس هێنان ئەنجامیەتی(ان شاءالله).

دوا وته لەم باسەدا:

حەزدەکەم دوا وتەم لەم بوارەدا بە قسەی هەندێك لە زانایانی کۆمەڵناسی کۆتایی پێ بهێنم ئەویش دەربارەی جولەکە کە دەڵێن: دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزراوە لەسەر دینێکی فاسدو گەندەڵ، بێگومان هەر دەوڵەتو کۆمەڵگایەك کەلەسەر بنەماکانی گەندەڵی دروست بوو، ئەوە کەوتنو بەچۆکدا هاتنو لەناوچوون چارەنوسیەتی.

گەر تەنها یەك نمونە وەربگرین لە ژمارەی جولەکە لەفەلەستین ساڵی (١٩٥٦) دەبینین کە ڕێژەیان (١,٦٦٧,٤٥٥) کەس بووە، ئەم ژمارەیە هەریەکەی جولەکەی وڵاتێك بوون، بۆ نمونە (٠,٠٨,٨١٠) یان ئەصڵو نەسەبیان دیارنەبووە کەخەڵکی چ وڵاتێکن، (٠,٠٣١,٥) یان خەڵکی ئاسیا بوون، (٠,٠٢٤,٤) یان جولەکەی ئەفەریقا بوون، (٠,٠٤٣,٣٠) یان جولەکەی ئەوروپا بوون، (٠,٠,٨٠) یان جولەکەی ئەمەریکا بوون!!

جا سەرنج بدە ئاخۆ دەبێت چ پەیوەندی نزیکایەتیەك لە نێوان ئەم کەسە جیاوازانەدا هەبێت؟! کە عاداتو تەقالیدو ڕەنگو دەنگو جۆری بیرکردنەوەو هەموو شتێکیان جیاوازە؟!!

سەرجەم توێژینەوەو هەواڵەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە جولەکەکانی ئەوروپا بەسوکو کەم بایەخ سەیری جولەکەکانی ئەفەریقاو ئاسیا دەکەن!!

وە باوەڕیان وەهایە کە جولەکەکانی ئەوروپا بوون کە بنیادی دەوڵەتی ئیسرائیلیان ناو ئەوانی تر هاتنە سەر حازری.تەنانەت ئەم دژایەتیەی نێوان جولەکەکان گەیشتۆتە ئاستێك کە چینایەتی لەناودا دروست کردوونو جولەکەکانی دابەش کردووە بەسەر دوو کۆمەڵدا.

کۆمەڵی بەرزو باڵاو کۆمەڵی بێ نرخو بایەخ، کۆمەڵی یەکەم خۆیان بەلەپێشترو خاوەن ماف ترو پیرۆزتر دەزانن لە کۆمەڵی دووەم.

لەم پێناوەدا دکتۆرێکی ئەمەریکی بەناوی (هومر أوجل) سەردانێکی ئیسرائیل دەکات تا لەنزیکەوە زیاتر ئاشنا ببێت بەم دژایەتیو دووبەرەکیەی نێوان جولەکەکان، سەرەنجام گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دەڵێت: ((وجدت في اسرائيل أقواما مختلفين، نجحوا في اقامة مزارع ومدن وفشلوا في اقامة وطن واحد) ).

واتە: کۆمەڵە نەتەوەیەکی جیاوازم لە ئیسرائیلدا بینی، سەرکەوتوو بوون لە بنیادنانی کێڵگەو شاردا بەلام شکست خواردوو بوون لە بنیادنانی یەك نیشتماندا!!

دواتر درێژە بەقسەکانی دەداتو دەڵێت: (ئەوە گەورەترین هۆکارە بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئیسرائیل خۆی پێ لەناوبەرێت).

نوسەرێکی بەریتانیش بەناوی (نیقل باریو) پشتگیری وتەکانی دکتۆر (هومر أوجل) ی ئەمەریکی دەکاتو دەڵێت: ((ان اسرائيل لايمكنها الاستمرار كدولة اوروبية تعيش على الارض عربية) ).

واتە: دەوڵەتی ئیسرائیل ناتوانێت بەردەوام بێتو خۆ ڕابگرێت وەك دەوڵەتی ئەوروپی، کە بژی لەخاکی عەرەبیدا[1].

---

١- اليهود تأريخ إفساد وانحلال ودمار: د. توفيق الواعي: ص (٢٠٧-٢٠٩).

باسی چوارەم:

## ناوو ژمارەی حیزبە ئیسرائیلیەکانی ناو فەلەستین‌و مێژووی دامەزراندن‌و بەرنامەی کارکردن‌و پەیڕەوو پرۆگرامیان

بێگومان لەناو دەوڵەتی ئیسرائیلدا دەیان حیزب‌و کۆمەڵ‌و دامەزراوەی جیاواز هەن کەهەرجارەی یەکیان جڵەوی دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست‌و ئەو دەوڵەتە دەبەن بەڕێوە کە گرنگ ترین‌و لەبەرچاوترینیان ئەمانەن:

یەکەم: حیزبی مزراحی:

ئەم حیزبە بەکۆنترین حیزبی دینی صەهیۆنی هەژمار دەکرێت‌و مێژووی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٠٢) لە شاری (ڤیلینا vilne) لە ڕوسیای ئەو کاتەو لەسەر دەستی حاخامی ڕوسی بەناوی (یعقوب ریـنـز)، بیروباوەڕی ئەم حیزبە بریتی بوو لە گەڕانەوەو کۆچکردنی جولەکەکانی جیهان بۆ فەلەستین وەك بەجێهێنانی واجبێکی دینی‌و پاشان باوەڕیوون جێبەجێکردنی دەقەکانی تەورات کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی قەوارەی زایۆنیدا دژایەتی نەبێت...

دووەم: حیزبی هابوعیل hapoel:

بریتیە لە ڕێکخراوێکی صەهیۆنی جیهانی‌و لە ساڵی (١٩٢١) دا دروست بوو، ئەم ڕێکخراوە بەشێك بوو لە حیزبی (مزراحي) بیروباوەڕی ئەم ڕێکخراوە بریتی بوو لە جەخت کردنەوە لەسەر مافی کرێکاران‌و پەرەپێدان بەهەستی دینی جولەکە.

سێ هەم: حیزبی (ئەغوادات ئیسرائیل) agudat israel

ئەم حیزبە بریتی بوون لە کۆمەڵەیەکی دینی توندڕەو لە لایەن کەسێکی جولەکە بەناوی (الحرديم) دامەزرێنرا.

بیروباوەڕی ئەم حیزبە بریتی بوو لە ڕەگەز پەرستی‌و توندڕەوی دینی‌و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەبێت جولەکە بگەڕێتەوە بۆ تەورات‌و جێبەجێی بکات.

ئـەم حیزبـە بەتونـدڕەوترین حیـزب هـەژمار دەکرێـت لـە دژایـەتیکردنی عەرەبەکاندا.

**چوارەم: حیزبی بوعالی أغوادات ئیسرائیل.**

ئەم حیزبە لقێك بوو لە حیزبی (ئەغواداتی ئیسرائیلی) و بریتی بوو لەحیزبێکی دینی کرێکاری، لە ساڵی (١٩٢٢) لە پۆڵەندا دامەزرا، بە مەبەستی بەرگری کردن لە مـاف کرێکـارانی جولەکـەکان، ئـەویش لـەدوای ئـەوەی کـە پۆڵەنـدا بڕیـاری ئـەوەی دەرکرد کەنابێت کرێکارانی جولەکە لەکارگەکانی ولاتـی پۆڵەنـدا کاربکـەن، ئـەویش لەبەرئەوەی کە کرێکارانی جولەکە نایەنە سەر کار لەڕۆژانی شەممەندا، بیروبـاوەڕی ئەم حیزبە بریتی بوو لـە جـەخت کردنـەوە لەسـەر کردنـەوەی ئۆردوگـای زیـاتر لـە فەلەسـتینداو پێـدانی سـەرجەم مافـەکان بـەکرێکاران‌و باشـترکردنی بـاری کۆمەڵایەتیان، ئەویش بەداواکردنی سنورێك بۆ کاتی ئیشکردنیان کـە لـە (٨) زیـاتر نەبێـت....

**پێنجەم: ڕێکخراوی (نموشن إیمونیم):**

لە عەرەبیدا بە مانای (کتلة الایمان) واتە بەشێك لە باوەڕ دێت، بـریتی بـوو لـە ڕێکخراوێکی دینـی توندڕەو، لـە سـاڵی (١٩٤٧) دا دامـەزرا، بەشـداری زۆر گـەورەو لەبەرچـاوی هـەبوو لـە بنیادنـان‌و دروسـتکردنی ئۆردوگاکـان لـە خـاکی فەلەسـتین بەتایبەت لەناوچەکانی (رام الله ونابلس).

بیروباوەڕی ئەم ڕێکخـراوە توندڕەوە بـریتی بـوو لـەوەی کـە دەبێـت جولەکـە تەواوی هێزو توانای خۆی بەکاربهێنێت لە گەیشتن بە ئامانجەکانی.

پاشان جەختیان لەسەر ئەوە دەکـردەوە کـە غـەیری جولەکـە لـە فەلەسـتیندا نیـەو نابێـت ببێـت، ئـەویش بـەوەی کـەدەیان وت (لاجـود لشـعب إسمـه شـعب فلسطين)[1]. واتە: گەلێك بوونی نیە، لەفەلەستیندا- بەناوی گەلی فەلەستینەوە.

---

١- الاسس الدينية للحركة الصهيونية: التميمية ص: ٥٠٤.

**شەشەم: حیزبی دینی نیشتمانی (المفدال):**

ئەم حیزبە، بە گەورەترین و کاراترین حیزب هەژمار دەکرێت لەناو قەوارەی زایۆنیدا، لە هەڵبژاردنەکانی هاوینی ساڵی(١٩٥٦) دا دامەزرا، ئەم حیزبە بە حیزبێکی دینی و سیاسی و کارا دادەنرێت لەناو ئیسرائیلدا و بەشداری حوکمەتە یەك لەدوای یەکەکانی ئیسرائیلی کردووەو توانایەکی ئابوری بەرزیان هەیە، تەنانەت دەستیان گرتووە بەسەر چەند بانك و شەریکاتی زۆردا، لەناو خودی ئیسرائیلدا.

ئەم حیزبە باوەڕی بە گفتوگۆی ئاشتیانە هەیە لەگەڵ سەرجەم دەوڵەتە عەرەبیەکان و دەستەڵاتە فەلەستینیەکان لەسەر ئەم بنەمایانە:

١- ڕەخساندنی ئاسایشی تەواو بۆ تاکی جولەکەو پاشان دەوڵەتی ئیسرائیلی.

٢- دژایەتی کردنی تیرۆرو ئابلۆقەدانی لەناو دەوڵەتدا.

٣- بوونی هێزەکانی ئیسرائیل لەنێوان دەریای ئەردەن و دەریای ناوەڕاستدا و نابێت هیچ هێزێکی تری فەلەستینی لێ بێت!!

٤- قودس بەتەنها پایتەختی هەتاهەتایی گەلی جولەکەو دەوڵەتی ئیسرائیلەو نابێت قودس دوکەرت بکرێت لەنێوان جولەکەو فەلەستینیەکاندا.

٥- جولان بەشێکە لەخاکی ئیسرائیل و نابێت لێی جیابکرێتەوە، دەبێت لەژێر دەسەڵاتی ئیسرائیلدا بێت تەنانەت دوای مۆرکردنی پەیمانی ئاشتیش.

٦- دەوڵەتی ئیسرائیل ڕێگرە لە گەڕانەوەی دانیشتوانی عەرەب بۆ ئەو شوێنانەی جولەکەی تێدا دەژی.

٧- هەر پەیمان نامەو ڕێکەوتنێك لەنێوان ئیسرائیل و دەوڵەتە عەرەبیەکاندا مۆربکرێت، ئەوە دەبێت لە لایەنی فەلەستینیەوە ئەسیرەکان ڕزگار بکرێن و بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان.

**حەوتەم: حیزبی ئیسرائیل بیتن:**

سەرۆکی ئەم حیزبە ناوی (أبیغدور لیبرمانە) و لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٣) دا (٧) کورسی پەرلەمانیان بەدەست هێنا.

### هەشتەم: حیزبی عەمەلی ئیسرائیلی (حزب العمل الاسرائیلي):

سەرۆکی حیزب بریتیە لە (عمیر بیرتس) و ئەم حیزبە دادەنرێت بەدیارترین حیزبە چەپ ڕەوەکانی ناو ئیسرائیل، لە دوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی(١٩٩٢) جڵەوی گرتە دەست تا (١٩٩٦) و پاشان ساڵی (١٩٩٩) تا (٢٠٠١) ئەم حیزبە (٤٤) کورسی پەرلەمانیان بەدەست هێنا، لە ساڵی (١٩٩٢) و (٣٤) کورسی لە ساڵی (١٩٩٦) و (٢٦) کورسی لە ساڵی (١٩٩٩) بەرنامەو بیروباوەڕی ئەم حیزبە بریتیە لەوەی کە دەوڵەتی ئیسرائیل دەوڵەتێکی جولەکەیەو ماڵێکی نەتەوەییە بۆ هەموو جولەکەیەکی ئەم جیهانە گەر لەهەر شوێنێك بن.

### نۆیەم: حیزبی لیکود (حزب اللیکود):

لە دوای ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٧٣)ەوە ئەم حیزبە دروست بووە، یەکێکە لە حیزبە ڕاست ڕەوە توندڕەوەکانی ناو ئیسرائیل سەرکردەی ئێستای ئەم حیزبە توندڕەوە (بنیامین نتنیاهو) [1] یەو باوەڕی تەواویان بەوە هەیە کە جولەکە خاوەنی هەموو مافێکی خۆیەتی لەخاکی فەلەستیندا، لە بەرامبەریشدا باوەڕی بەهیچ مەسەلەیەکی ئاشتیو پەیمان مۆرکردنی هیچ ڕێکەوتنێك نیە لەگەڵ عەرەبدا، گرنگترین بەرنامەو بیروباوەڕی ئەم حیزبە لە ڕووی سیاسیەوە بریتیە لەدابینکردنو دەستەبەرکردنی ئەم ئامانجەیان، تەئکید لەسەر ئەم سێ لایەنە دەکەنەوە (ئاسایش- بتەوکردنی بواری ئابوری- پاراستنی شوناسی جولەکە) چونکە ئەوان

---

١- بنیامین نتنیاهۆ، لە ساڵی ١٩٤٩ لە (تل أبیب) لە دایك بووە، بڕوانامەی ماجستەری هەیە لە بواری بەڕێوەبردنی کاردا، سێ جار ژنی هێناو خاوەنی سێ منداڵە، بۆ یەکەمجارو لەساڵی (١٩٨٨) دا هەڵبژێردراو لە ساڵی (١٩٩٣) بۆ یەکەمجار سەرۆکی حیزبی لیکود دەستنیشان کرا، لە ساڵی (١٩٩٦) دا پلەی سەرۆك وەزیرانی گرتە دەست، دوای سێ ساڵ شکستی هێنا لەسەر دەستی (ایهود باراك) لە هەڵبژاردنە گشتیەکانداو دوا بەدوای ئەم شکستە دەست هەڵگرتنی لە کاری سیاسی ڕاگەیاند، لە ساڵی (٢٠٠٢) گەڕایەوە ناو سیاسەتو کرایە وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل، دواتریش بەوەزیری مالیە، لە ساڵی (٢٠٠٥) و بۆ جارێکی تر دەست کێشانەوەو وازهێنانی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام لەهەمان ساڵدا لە لایەن حیزبی لیکودەوە دەست نیشان کرایەوە بەسەرۆکی حیزب.

باوەڕیان وەهایە کە ئاسایش و ئارامی و خۆش گوزەرانی کۆمەڵایەتی و بەردەوام بوونی کۆچ لەلایەن جولەکەکانی جیهانەوە بەرەو ئیسرائیل، هەروەها شوناسی جوکە گەرایی و فەرهەنگی ئیسرائیلی هۆکاری گەورەن لەگەڕانەوەی جولەکە بۆ زەوی فەلەستین.

**مەرجی بەشداریوونی لە گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵ عەرەبەکاندا دوو خاڵە:**

١- دەست هەلگرتن و وازهێنانی لایەنە فەلەستینیەکان لە دژایەتی ئیسرائیل و هەوڵدان بۆ لەناوبردنی.

٢- لەبەریەك هەڵوەشاندن و لە ڕیشە دەرهێنانی بزوتنەوە تیرۆرستەکان.

**دەیەم: لیستی حیزبی کرێکاران (دعم) قائمة حزب العامل:**

حیزبی کریکاران (دعم) بریتیە لە حیزبێکی کرێکاری تازە، بیروباوەڕو پرۆگرامی حیزبیان بریتیە لە کۆتایی هێنان بەهەموو جۆرەکانی ئابلۆقەو برسی کردنی گەلی فەلەستینی پاشان باوەڕی تەواویان بەگفتوگۆی ئاشتیانەی نێوان ئیسرائیل و فەلەستینی هەیە، لە پێناو گەیشتن بە چارەسەرێکی دادوەرانەی نێوانیان.

**یانزە: حیزبی کادیما:**

سەرۆکی ئەم حیزبە بریتیە لە (إیهود أولمرت) و کاری سەرەکی و بنەمای باوەڕیان بریتیە لە پارێزگاری کردن لەدەوڵەتی ئیسرائیل ئەویش وێناکردنی ئەو دەوڵەتە بەماڵی نیشتمانی پڕ لە ئاسایش بۆ تەواوی جولەکەکانی جیهان لە فەلەستین، پاشان گفتوگۆ لەگەڵ لایەنە فەلەستینیەکاندا یەکێکی ترە لەبەرنامەی کاریان، ئەویش لە پێناو کۆتایی هێنان بەو نائارامیەی کە توشی قەوارەی زایۆنی هاتووەو یەکلایی بوونەوەی کێشەکانی نێوانیان و دانانی سنوری کۆتایی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل.

یەکێکی تر لەبنەما فکریەکانی تریان ئەوەیە کە باوەڕیان وایە گەلی جولەکە ماف نەتەوەیی خۆیەتی کە لەفەلەستیندا بژیو لە ولاتانی ترەوە کۆچی بۆ بکەن.

پاشان بەهیچ جۆرێك ئامادەی سازش کردن نین لەسەر بستێك خاکی فەلەستینو بە ماف دروستو ڕەوای خۆیانی دەزانن.[1]

**دوا وتە لەم باسەدا:**

حزبەکان لەناو دەوڵەتی ئیسرائیلدا ژمارەیەکی زۆرنو بنەمای فیکریو بیروبۆچونی هەنگاوو هەڵوێستو زۆربەی شتەکانیان جیاوازە لەوی تر، بەڵام ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا لە توێژینەوەم لەسەر ژمارەو کارو ئایدیای ئەو حیزبانە ئەوەیە کە:

گەر سەرنجی حیزبە ئیسرائیلیەکان بدەین چ کۆنەکانو چ حیزبە تازە کاراکانی ناو دەوڵەتی ئیسرائیل کە ولات بەڕێوە دەبەن، لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازیو کێشمە کێشمەی کە لەنێوانیاندایە، بەڵام لەسەر کۆمەڵێك خاڵی بنەڕەتیو مەبدەئی یەك هەڵوێستن کە ئەمانەن:

١- پارێزگاری کردن لە شوناسی جولەکە.

٢- سازش نەکردن لەسەر تەنها بستێکی خاکی فەلەستین کە لەژێر دەستەڵاتی جولەکەدایەو نەدانەوەی بەفەلەستینیەکان.

٣- هەموو حیزبو لایەنە ئیسرائیلیەکان بەبێ (استثناء) کۆکن لەسەر دژایەتیکردنی هەموو ئەو کەسو لایەنو دەوڵەتانەی کە جێی مەترسین لەسەر قەوارەی ئیسرائیل.

٤- سەرجەم حیزبو لایەنە ئیسرائیلیەکان تەواوی هەوڵو خەباتیان بریتیە لە زیاتر سەقامگیرکردنو فراوانترکردنی سنوری دەوڵەتی ئیسرائیلو دژوەستان لەبەرامبەر ڕێگرەکانیاندا.

---

١- الاساطير التأريخية اليهودية حول الارض مسجد الاقصى (عثمان سعيد) ص (٢٥٣).

٦-سەرجەم حیزب‌و لایەنە ئیسرائیلیەکان مەرجەعیەتی فکری‌و سیاسی‌و عەقیدییان بریتیە لە جێبەجێ کردنی بڕگەو خاڵە بڕیار لەسەر دراوەکانی هەریەك لە: (تەوراتی دەستکاری کراو- تەلمودی وتەو دانراوی حاخامەکان، بڕگەو بابەتەکانی پرۆتۆکۆلات).

٧-سەرجەمیان سازن لەسەر دژایەتیکردنی لایەنە نیشتمانی‌و ئیسلامیەکانی ناو فەلەستین بەگشتی‌و بزوتنەوە ئیسلامیەکان بەتایبەتی‌و (حماس) بەتایبەتی تر.

بەڵێ ئەمانەو دەیان خاڵی تری هاوبەش دیارترین سیمای نێوان حیزب‌و لایەنە ئیسرائیلیەکانە، گەر سەرنجیان بدەین، لە هەمان کاتیشدا بەبڕوای من ئەم لایەنەیە نهێنی سەرکەوتن‌و دامەزراوی‌و سەقامگیر بوونیان لە فەلەستین بەتایبەتی‌و خۆرهەلاتی ناوەڕاست بەگشتی.

## تیشکێك لەسەر حیزب‌و لایەنە بەرهەڵستکارەکانی نێو فەلەستین

لە ئەنجامی ستەمی بێ سنورو کوشتنی بەناهەق‌و داگیرکردنی خاك‌و ئاوی فەلەستین‌و بەرفراوان کردنی سنوری دەوڵەتی ئیسرائیل‌و لەناوبردنی ڕۆڵەکانی ئەو خاك‌و گەلەو مامەڵە لەگەڵ کردنیان بە ئاگرو ئاسن‌و تازەترین چەکی سەردەم‌و بێدەنگی وڵاتانی بەناو دیموکراسی‌و مافی مرۆڤ!!! چەند بزوتنەوە حیزبێکی نیشتمانی‌و ئیسلامی لە بەرەنگاربوونەوەی ئەم دەریا ستەمەی جولەکەکاندا بەرهەم هات، کە نوێنەرایەتی گەلی ستەملێکراوو دەربەدەرکراوو خوێنڕژاوی فەلەستینیان لە ئەستۆگرت‌و دژبوونی خۆیان لەبەرامبەر ئەو هێزە بێ ڕەحم‌و وەحشیەی ئیسرائیلیەکاندا ڕاگەیاند.

ئەم بزوتنەوەو حیزبانە لە لایەن قەوارەی ئیسرائیل‌و ئەمەریکاو دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەورووپاو هەندێك لە وڵاتە عەرەبیە بەناو ئیسلامیەکان- کە لەڕاستیدا خزمەتی جولەکە دەکەن‌و عەلمانی تەواون- دژایەتی زۆر کران‌و خوێنی زۆریان ڕشت‌و خەباتی زۆریان کرد تا سنورێك بۆ ستەم‌و کارە دزێوو گەندەڵیەکانی

ئیسرائیل دابنێت‌و قودسی شەریف‌و ئەسیر لە چنگی پڕ لە خیانەتی جولەکە ڕزگار بکەن‌و بیگێڕنەوە دەستی موسوڵمانان!!

بەلام سەرجەمی ئەو حیزبانە لەلایەن جولەکەو ئەمەریکاو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی خرانە ناو لیستی ڕەش‌و بە تیرۆرست ناوزەند کران!!

ئەمیش لەبەرئەوەی کە داکۆکی لە مافی گەلی خۆیان دەکەن‌و خەبات لەپێناو ڕزگارکردنی خاکی داگیرکراوو قودسی پیرۆزدا دەکەن‌و بە ویستی جولەکەو ئەمەریکا ناڕۆن بەڕێداو بە ئاوازی ئەوان ناخوێنن!!

لە بەرامبەریشدا ئیسرائیل بە ئاشتی خوازو مامۆستای دیموکراتی‌و مافی مرۆڤ هەژمار دەکرێت لە ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا!!

بەڕاستی ئەوە گەورەترین ستەمە کە لەژێری مرۆڤەکان دەکرێت، ئەویش بە ئاوەژووکردنەوەی ڕاستیەکان‌و پیشاندانی ڕەش بە سپی‌و سپی بەڕەش، هەروەك وتمان لە دەرەنجامی ئەم هەموو ناهەقی‌و ستەمەدا چەند حیزب‌و بزوتنەوەیەکی نیشتمانی‌و ئیسلامی دروست بوون کە ئەمانە دیارترینیان بوون:

**یەکەم: بزوتنەوەی (حماس) ی ئیسلامی:**

(حماس) ی کورتکراوەی ناوی (حركة المقاومة الاسلامية) واتە (بزوتنەوەی بەرگری ئیسلامی)، ئەمیش بریتیە لە بزوتنەوەیەکی ئیسلامی نیشتمانی کە کار دەکات لەپێناو سازاندن‌و ڕەخساندنی هەلێکی گونجاو بۆ ئازادکردنی فەلەستین لەدەستی جولەکەی داگیرکەر.

حماس بزوتنەوەیەکی جیهادیە بەمانا فراوانەکەی جیهادو لە بەرواری ١٥: ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٧) دا دروست بوو، هەرچەندە ڕەگ‌و ڕیشاڵی ئەم بزوتنەوە ئیسلامیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی (١٩٤٠) کە (حماس) بەشێك بووە لە (بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان) (حركة الاخوان المسلمين).کە ئیخوان لە ساڵی (١٩٤٨) دا ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاویان بینی لە جیهاد کردن دژی قەوارەی زایۆنی ئیسرائیل.

بنیادنەرو دروستکەری ئەم بزوتنەوە ئیسلامیە (حماس) بریتی بوو لە شەهیدی تێکۆشەر (شێخ ئەحمەد یاسین) کە دوابەدوای ئەم دامەزراندنە لە لایەن سەربازە دڕندەکانی ئیسرائیلەوە دەستگیر کراو (١١) ساڵ لە بەندیخانەدا مایەوە.

بزوتنەوەی (حماس) باوەڕیان وەهایە کە دژایەتیکردن لەگەڵ جولەکەدا لەخاکی فەلەستین بریتیە لە صراع لەگەڵ جولەکە، کە ئەمەش کێشمەکێشمێکی چارەنوس سازەو تەواو نابێتو کۆتایی نایەت مەگەر هۆکارەکانی لەناو بچن.ئەوانیش بوونی قەوارەی زایۆنیو کۆمەڵگای ئۆردوگا نشینەکانو داگیرکردنی بەردەوامی خاکی فەلەستین لەلایەن جولەکەوە، هەرکات ئەمانە نەمانو بنبڕ بوون، بزوتنەوەی (حماس) یش لە جیهادو خەبات دەوەستێت.

بزوتنەوەی حماس وادەبینێن کە دەوڵەتی عبری ئیسرائیل مەشروعێکی گشتگیری دوژمنکاریەو تەنها چاوی لەچەند هەرێمو خاکێکی دیاریکراوی فەلەستین نەبڕیوە، بەڵکو چاوی لەتەواوی خاکی فەلەستین بڕیوەو بۆ هەلی زیاتر دەگەڕێت تا تەواوی خاکی پیرۆزی فەلەستین داگیرکاتو لەوێشەوە ڕەگو ڕیشاڵی ئومەتی ئیسلامی دەربهێنێتو دەسەڵاتی سەربازیو ئابوریو سیاسیو فکری خۆی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بسەپێنێت!!

تاکە هۆکاریش بۆ گەیشتن بەم ئامانجە بریتیە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەرتاسەری(عبری) لەناوچەکەداو بە ئومێدی سەرکوت کردنو لەناوبردنی هەر جوڵەو بزافێك کە دژایەتی ئەو قەوارەیە بکات.

کاری سەربازیو چەکداری یەکێکە لە گرنگترین هۆکار لە لای (حماس) بۆ دژایەتیکردنی ئیسرائیلو ڕووبەڕووبونەوەی، ئەویش لەنەبوونی هیچ مەشروعێکی عەرەبی لە دژایەتیکردنی ئیسرائیلدا.

دژایەتیکردنو ڕووبەڕووبونەوەی حماس لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل بریتیە نیە لە دژایەتیکردنی ئەو قەوارەیە کە جولەکەن واتە هۆکاری دژایەتیان لەگەڵ جولەکەدا لەبەرئەوە نیە کە (ئەهلی کتابن) و جولەکەن، بەڵکو لەبەر ئەو هەموو

داگیرکاری و خوێنڕێژی و ستەمە بێ سنورانەیان کە دەرهەق بەگەلی فەلەستین ئەنجامی دەدەن.

(حماس) دژی هیچ مەشروعێکی ئاشتی نیەو بەڵکو کاردەکات لە پێناو سەقامگیربوونی ئاشتی لەناوچەکەدا بەگشتی و فەلەستین بەتایبەتی، بەڵام ئەوان لەگەڵ ئەو ئاشتیەدان کە دادپەروەری فەراهەم دێنێت و مافی زەوتکراوی گەلی فەلەستینی دەگێڕێتەوە.

بزوتنەوەی حماس لە ئێستەدا بە گەورەترین و کاریگەرترین لایەنی فەلەستینی ئیسلامی جیهادی هەژماردەکرێت و خاوەنی بنکەیەکی جەماوەری بەرفراوانەو لە هەڵبژاردنەکانی ئەم دوایەی فەلەستیندا زۆرینەی کورسیەکانی پەرلەمانی لە ڕێگەی دیموکراسی و هەڵبژاردنەوە بەدەست خست، بەڵام نە حوکمەتی ئیسرائیل و نە حوکمەتە نەخۆشەکەی (محمود عباس) و نە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و نە زۆربەی وڵاتە عەرەبیە عەلمانیەکان دان بەو حوکمەتەی (حماس) دا نائێنن کەبەمافی خۆی و لە ڕێگەی هەڵبژاردن و بەدەنگی زۆرینەی خەڵك هەڵبژێردراوە !!

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ئەم بزوتنەوەیە لە دژایەتی کردنی ئیسرائیل و سازش نەکردن لەخاکی فەلەستین و مامەڵە نەکردنیان بە کێشەی فەلەستینەوەو ڕاوەستانی بەهێزیان دژ بە ئیسرائیل و دروستکردنی نائارامی بەساروخەکانیان لەناو ئیسرائیلدا.

ئیسرائیلیش لە پێناو ڕیشەکەن کردن و لەناو بردنی ئەم بزوتنەوە کاریگەرە ڕێگەیەك نەماوە کە نەیگرێتەبەر، بەڵام خوای گەورە شکستی بەتەواوی هەوڵەکانیان هێناوەو بەهێزبوونی ئەم بزوتنەوەیە ڕۆژبەڕۆژ لە بەرەو سەرچوندایە.

(حماس) لە ئێستەدا دەسەڵاتی تەواویان بەسەر کەرتی غەزەدا هەیەو دەیبەن بەڕێوە، قەوارەی زایۆنیش لە ساڵی (٢٠٠٧) ەوە گەمارۆی ئابوری فراوانی لەسەر ئەم (کەرتە) داناوەو تا ئێستاش هەر بەردەوامە، ئەویش لە پێناو خنکاندن و لەناوبردنی سەرجەم دانیشتوانی غەزە لە ڕێگەی برسێتیەوەو دژایەتی هەموو کەس و دەوڵەتێکی دوورو نزیك دەکات، گەر بەهەر شێوەیەك یارمەتی خەڵکی

گەمارۆدراوی غەزە بدەن‌و یارمەتیە مرۆیەکانیان ڕەوانەی ئەوێ بکەن، باشترین بەلگەش لەسەر ئەم ڕاستیە بریتی بوو لەدەستگرتن بەسەر کەشتی ئازادیدا، کە لەتورکیاوە بەرەو غەزە بەڕێ کرا بە مەبەستی شکاندنی ئەو گەمارۆ ئابوریەو یارمەتیدانی خەلکی هەژارو نەداری ئەو شارە، بەلام سەرەنجام جولەکەی خوێنڕێژو داگیرکەر ئەم هەولە مرۆڤ دۆستانەی تورکیایان لەناو بردوو دەستیان گرت بەسەر کەشتیەکەو تەواوی سەرنشینەکانی‌و شەهید کردن‌و بریندارکردنی دەیان کەشتیوان‌و حساب نەکردن بۆ تورکیاو هیچ بڕیارێکی نێودەولەتی، چونکە ئیسرائیل لە سەرو یاساوەیەو هیچ یاسایەکی نێودەولەتی شمولی ناکات، هەروەك وتراوە (الدولة فوق القانون).

دووەم: بزوتنەوەی فەتح:

دروست بوونی ئەم بزوتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو سەرەتای شەستەکان، ئەویش لەبەرەنجامی ئەو ستەم‌و دەست درێژیە بەردەوامانەی قەوارەی ئسرائیل کە دەرهەق بە گەلی فەلەستین ئەنجامی دەدا.

لەکۆتایی سالی (١٩٥٠) دا ئەم بزوتنەوەیە بە شێوەیەکی نهێنی دەستی بەکارەکانی کردو لە سەرەتای شەستەکاندا لە هەریەك لەسوریاو لوبنان‌و ئەردەن‌و ولاتانی خلیجی عەرەبی دەستیان بەکارەکانیان کرد.

بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم بزوتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ هاوپەیمان بوون‌و یەکگرتنی هێزە بەرگریەکانی ناو خودی فەلەستین‌و هەندێك لەئەندامە چالاکەکانی کۆمەلەی برایان (الاخوان المسلمین).

ئەندامە چالاك‌و کاراکانی دەستەی دامەزراندنی بزوتنەوەی فەتح بریتی بوون لە (٥) کەس کە ئەمانە بوون:

١- أبو جیهاد.

٢- فتاح حمود.

٣- یوسف عمیر.

٤- سلێمان صمد.

٥- یاسر عرفات.

یەکەم تا چوارەم سەر بەکۆمەڵەی برایان بوونو (یاسر عرفات) یش دادەنرێت بەهەواداری ئەو کۆمەڵەیە لەو کاتەدا.

## بیرو بۆچوونو مەبدەئی ئەم بزوتنەوەیە(الفتح)

١. فەلەستین بەشێکە لە نیشتمانی عەرەبیو گەلی فەلەستینیش بەشێکە لە ئومەی عەرەبیو خەباتیشیان بەشێکە لەو خەباتە.

٢. گەلی فەلەستینی خاوەنی کەسایەتی سەربەخۆی خۆیەتیو خاوەنی مافی دیاریکردنی چارەنوسێتی لەدەسەڵات دارێتی سەرجەم خاکی فەلەستیندا.

٣. خەباتی گەلی فەلەستینی بەشێکە لەخەباتی گەلی هاوشێوەی گەلانی تری جیهان لە دژایەتی کردنی قەوارەی زایۆنیو داگیرکەری ئیمپریالیزمی جیهانی.

٤. جەنگی ڕزگارکردنی فەلەستین واجبێکی نەتەوەییە لەسەر ڕۆڵەکانی فەلەستینو تەواوی ئومەتی عەرەبی.

٥. هەر پەیمانو بڕیارێك دەربکرێت لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان یان کۆمەڵە دەوڵەتێك یان هەر دەوڵەتێك بەتەنها دەربارەی کێشەی فەلەستینو تیایدا مافی گەلی فەلەستینی تێدا زەوت بکرێت ئەوە لەلای ئێمە -فەتح- بەرپەرچ دەدرێتەوەو هیچ بایەخێکی نیە.

٦. بوونی قەوارەی زایۆنی لەناو خاکی فەلەستیندا بە داگیرکاری هەژمار دەکرێت.

٧. ڕزگارکردنی فەلەستینو بەرگری کردن لە پیرۆزیەکانی واجبێکی دینیو مرۆییو عەرەبیە.

٨. بزوتنەوەی فەتح بزافێکی نیشتمانی شۆڕشگێڕی سەربەخۆیەو نوێنەرایەتی شۆڕشی گەلی فەلەستینی دەکات دژ بەقەوارەی زایۆنی.

بەشێوەیەکی گشتی بزوتنەوەی فەتح زیاتر بە باگراوندێکی نیشتمانیو نەتەوەییە وەکار دەکات لەسەر ئەم بنەمایەش هەنگاو بۆ کارەکانی دەنێت.

لە ئێستەدا (محمود عباس) سەرۆکی ئەم بزوتنەوەیەو لە لایەن ئەمەریکاو ئیسرائیلو زۆربەی دەوڵەتە عەرەبیەکانو وڵاتانی ئەوروپاوە پەسەندە بۆ رابەرایەتی گەلی فەلەستین، هەرچەندە بزوتنەوەی (فتح) و (محمود عباس) لە رووی یاساییەوە شەرعیەتی دەسەلاتیان نەماوە بەسەر حوکمەتو فەرمانڕەوایی لە فەلەستیندا، چونکە لەهەڵبژاردنەکانی ئەم دواییەی گەلی فەلەستیندا شکستیان هێنا لەبەردەم بزوتنەوەی (حماس) داو بەمەش شەرعیەتی یاساییان نەما بەڵام ئەوانەی کەدان بە (فتح) دا دەنێن دژی ئیرادەو خواستی گەلی فەلەستینن، چونکە (حماس) لە رێگەی هەڵبژاردنو بەدەنگی خەڵك هەڵبژێردراو شەرعیەتی دەسەلاتی پێدرا نەك بەزەبری چەكو زۆر.

هۆکاری ئەمەش زۆر ئاشکرایە کە ئەویش بریتیە لەوەی (حماس) بەڕاستی کار لەپێناو رزگارکردنو ئازادکردنی فەلەستیندا دەکەنو سازش لەسەر دەنکە بەردێکی ئەو خاکە پیرۆزە ناکەن بۆ جولەکە، لە بەرامبەریشدا (فتح) دەستەمۆی بڕیارو خواستەکانی ئیسرائیلو ئەمەریکا بووەو سازشی زۆری ئەنجام داوە لەبەرامبەر جولەکەداو هەیبەتو کاریگەری خۆی لەبەردەم قەوارەی زایۆنیدا لەدەست داوەو لە ئێستادا بەو ئاوازە دەخوێنێت کە ئیسرائیلو ئەمەریکا دڵخۆش دەکاتو خودی (محمود عباس) یش بەکرێ گیراوێکی زۆر ئاشکراو بێگومانی ئەمەریکاو ئیسرائیلەو کار لەگەڵ دوژمنەکانی گەلی فەلەستیندا دەکات بۆ لەناوبردنی هێزی بەرگریو حوکومەتی شەرعیو هەڵبژێردراوی (حەماس).

### سێیەم: بزوتنەوەی جیهادی ئیسلامی فەلەسطینی:

سەرەتای دروست بوونی ئەم بزوتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٨٠) و لەسەرەتادا کۆمەڵە گەنجێکی خوێندکاری زانکۆ رابەرایەتیان دەکرد کە ئەو کات لە

زانكۆكانی مصر دەیان خوێند و لەسەرو هەمووشیانەوە شەهید (دكتۆر فتحی الشقاقی) بوو كە بە دامەزرێنەری سەرەكی دادەنرێت.

دامەزراندنی ئەم بزوتنەوە ئیسلامیە جیهادیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆكارەی كە لەو سەردەمەدا واتە سالّی (١٩٨٠) ئەو شۆڕش و بەرگریانەی لە فەلەسطین دا كاریان دەكرد زیاتر بە بیری نەتەوەیی و شۆڤینی عەرەبیەوە لەبەرامبەر بە إسرائیل دا دەجەنگان و كێشەی فەلەسطین یان بەكێشەی نەتەوەیی دەناساند نەك كێشەی گەلێكی موسلّمان كە زەوی و خاكیان لیّ داگیركراوە !!

هەر بۆیە لەم كاتەدا هەستیارەدا بزوتنەوەی جیهادی ئیسلامی دروست بوو بۆ پڕكردنەوەی ئەو بۆشاییەی كە بزوتنەوەو بزافەكانی تر فەرامۆشیان كردبوو.

لەسەرەتای سالّی (١٩٨١) و كۆتایی سالّی (١٩٨٠) داو دوای گەڕانەوەی دانەری ئەم بزوتنەوەیە دكتور (فتحی الشقاق) و هەندێك لە هاوڕێكانی بیرۆكەی دانان و بنیات نانی ئەم بزوتنەوە إسلامیە جیهادی یە یان داڕشتن لە سەتای كاریاندا هەستان بە هۆشیاركردنەوەو بەرچاو ڕۆشن كردنی گەلی فەلەسطین دەربارەی جیهادكردن و مەشق كردنی سەربازی بە ئەندامان و هەواداران لە دژی قەوارەی زایۆنی داگیركەردا.

ئەویش لە پێناو ناوزەند كردنی شۆڕشی گەلی فەلەسطین بە خەباتێكی إسلامیانە و كێشەی گەلێكی موسلّمان پێش كێشەی نەتەوەیەكی عەرەب.

مەبدەئو بیروباوەڕی ئەم بزوتنەوەیە:

١- بزوتنەوەی جیهادی فەلەسطین باوەڕی تەواوی بەوە هەیە كە (إسلام) عەقیدەو شەریعەتەو بەرنامەی ژیانەو گەورەترین سەرمایەیە بە دەستی فەلەسطینیەكانەوە لە دژی إسرائیل دا، پاشان (إسلام) مەرجەعی بنەڕەتی یە بۆ داڕشتنی كاری ئیسلامی لە پرچەك كردن و ڕووبەڕووبونەوەی دوژمناندا.

٢- فەلەسطین خاكێكی ئیسلامی عەرەبیەو حەرامە دەست بەرداربوون و سازش كردن لەسەر تەنها بستێكی و قەوارەی زایۆنیش هێزێكی داگیركەرو خۆسەپێنەرە و دووبارە حەرامە دان نان بەو قەوارەیەدا.

٣- فەلەسطین تایبەت مەندی خۆی هەیە لەو پیرۆزییانەی کە قورئان و مێژوو و واقع شاهیدی لەسەر دەدەن، کەواتە دەبێت فەلەسطین بکرێت بە چەقی ئومەتی ئیسلامی و لە وێوە ئەم خاکە ڕزگار بکرێت و دژایەتی و ڕووبەڕووبونەوەی قەوارەی زایۆنی بکرێت.

٤- یەك بوون و یەك هەڵوێستی هێزە ئیسلامی و نیشتیمانیەکانی سەر ساحەی فەلەسطین مەرجی سەرەکی یە بۆ بەردەوام بوونی مەشروعی جیهاد و ڕووبەڕوبونەوە لە دژی جوولەکەو دەسەلاتی حکومەتی إسرائیل.

٥- ڕزگارکردنی خاکی فەلەسطین و پاککردنەوەی ئەو خاکە لە بوونی دەسەڵاتی جوولەکەو دامەزراندن و پەیڕەوی کردنی حوکمی إسلام تیایدا یەکێکی ترە لە مەبدەئوو بیروباوەڕەکانیان.

٦- هۆشیار کردنەوەی گەلی فەلەسطین و ئامادە کردنیان بۆ جیهاد لە ڕووی عەسکەری و سیاسی و تەنظیمی و ڕۆشنبیری و پەروەردەییەوە خاڵێکی ترە لە بنەماکانیان.

## ئایا جوولەکە گەلی هەڵبژاردەی خوان (شعب الله المختار) هەروەك بانگەشەی بۆدەکەن ؟!!

یەکێکی تر لەو مەسەلە گرنگانەی کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین و لەسەری برۆین و بەرچاو ڕوون بین لەبەرامبەریدا بریتیە لەمەسەلەی گەلی هەڵبژاردەی خوا(شعب المختار) (chosen people) زارەوەی گەلی هەڵبژاردە (الشعب المختار) تەرجەمە کراوی (هاعم هنفحار) ی عبریە.

بەڵێ ئەم مەسەلەیە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە جوولەکە باوەڕیان وەهایە خوای گەورە لەناو سەرجەم گەلانی تری دنیادا بە جیاواز دروستی کردوون و فەزڵ و گەورەیی ڕەهای پێداون و دەبێت سەرداری سەرجەم گەلانی دنیا بن و ئەوانیش خزمەت کارو نۆکەریان بن؟ زۆرێکی تر لە دەستەواژەو زارەوەکانی زمانی عبری جوولەکە ئاماژەی بە هەندێ دەقی تر دەکەن سەبارەت بە گەورەیی و جیاوازی خۆیان بەسەر گەلاندا هەروەك.

- (أتابحرتانو) واتە (أخترتنا أنت) بە مانای تۆمان هەڵبژارد ئەی جوولەکە!!
- (عم سیجولا) واتە (شعب الأرث) بە مانای گەلی میراتگر!!
- (عم قادوش) واتە (الشعب المقدس) بە مانای گەلی پیرۆز!!
- (عم نیتسح) واتە (الشعب الأبدي) بە مانای گەلی هەتا هەتایی!!

بوونی ئەم زاراوانە لە فەرهەنگی جوولەکەدا ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم گەلە لە هەموو شتێکدا خۆیان بە جیاواز سەیر دەکەن لە ئاست گەلانی ترداو تەنانەت ئەو خوا و پەرستراوەشی کە دەیپەرستن، (إله) واتە پەرستراوی خۆیان بە جیا دەبینن لە پەرستراوی خوای گەلان و نەتەوەکانی تری جوولەکە، خوا لە لای ئەوان یان ڕوون تر بڵێین ئەو خوایەی کە ئەوان دەیپەرستن ناوی (یهوە) وەو باوەڕیان وایە کە سەریان دەخات بەسەر تەواوی گەل و میللەتەکانی ترداو ڕێگەیان پێدەدات کە هەموو شتێك ئەنجام بدەن لە بەرامبەر ئەو گەل و میللەتانەی کە جوولەکە نین.

میللەتانی تر لەلای جوولەکە، جگە لە ئاژەڵ و گیاندارە بار هەڵگرەکان شتێکی تر نین و خواوەندی خۆیان (یهوه) مل کەچ و ژێرباری خستون تا جولەکە بە ویست و حەزی خۆیان سوار کۆڵیان بین و کارەکانی خۆیانیانی پێ جێ بە جێ بکەن) )[1]

جوولەکە دەستەواژەی (بشر) بۆ غەیری خۆیان بە کاردەهێنن کە (بشر) لە زمان و زاراوەی ئەواندا بە مانای غەیری مرۆڤ دێت، واتە ئەوان جگە لە جوولەکە بە مرۆڤ نازانن، مرۆڤ تەنها ئەو کەسەیە کە جوولەکە بێت و غەیری جوولەکە لە سنوری مرۆڤدا نین و ئاژەڵن و تەنانەت گۆشت و خوێن ڕۆحیان جیاوازە و وەك ئاژەڵ وەهان و لە ڕیزی شتە پیسەکاندان و خاوەنی هیچ کام نین لەڕەوشت و دین و بەها باڵاکان، تەوراتی دەست کاری کراوو تەلمودی دەستی حاخامەکانیان زۆر بە ئاشکرا سەرجەم مرۆڤایەتی پۆلێن دەکەن بەسەر دوو تاقم و کۆمەڵدا، کۆمەڵی یەکەم و لەپێشترو گەورەتر جوولەکەن و گەلی هەڵبژاردەی خوان و کۆمەڵەی دووەمیان غەیری جوولەکەن و ئەو گەل و میللەتانەی کە جوولەکە نین.

گەلی یەکەم کە جوولەکەن بە تەنها ئەوانن کە هیدایەت دراون و ڕێگەی ڕاست دەزانن و پەیام و پێغەمبەران بۆ لایان ڕەوانە کراوە و لە بەر ئەم هۆکارەشە باوەڕیان بەو پێغەمبەرو پەیامانە نیە کە بۆ غەیری خۆیان نێردراون هەر لە بەر ئەمەیە کە دەڵێن (الثواب لليهود و والعقاب للبشر آيان كان) واتە: پاداشت تەنها بۆ جوولەکەیەو تۆڵەش بۆ غەیری جوولەکەیە لە هەر کوێ بن.[2]

لە (سفر التثنية) دا هاتووە و دەڵێت: (لأنك شعب مقدس للرب إلهك، وقد أختارك الرب لكي تكون شعبا خاصاً فوق جميع الشعوب الذين على وجهِ الأرض) [3]

---

١- الماسونية و المنظمات السرية ماذا فعلت ؟ ومن خدمت؟ عبد المجيد همو.

٢- الماسونية و المنظمات السرية ماذا فعلت ؟ ومن خدمت؟ عبد المجيد همو.

٣- سفر التثنية: (٢، ١٤)

واتــه: لەبەرئــەوەی تــۆ –واتــه جوولەکــه– گــەلی پــیرۆزی پــەروەردگاری پەرستراوی، بە دڵ نیاییەوە پـەروەردگار هـەڵی بـژاردوی بـۆ ئـەوەی ببنـه گـەلێکی تایبەت بەسەر گەلانی سەر زەوی دا.

هەروەها لە (سفر اللاويين) دا هاتووە کە دەڵێت:

(أنا الرب الهكم الذي ميزكم من الشعوب وتكونون لي قديسين لأني قدوس أنا الرب، وقد ميزتكم من الشعوب لتكونوا لي و يشكرون اليهود إلهه في الصلواة لأخيارهم شعب المختار) [1]

واته: من پەروەردگارو پەرستراوی ئێوەم، کە جیام کردونوتووە لە گەلانی تر، کەواتە ئێوەش بۆ من ببنـه پاکژەکان، چـونکە مـن پاکژم، مـن پـەروەردگارم، بـه دڵنیاییەوە ئێوەم جیاکردۆتەوە لـە گـەلانی تـر بـۆ ئـەوەی بـۆ مـن بـن و سوپاسـی پەرسـتراوی جوولەکـە بکـەن لـە نوێژەکانیانـدا چـونکە هـەڵم بـژاردوون بـە گـەلی هەڵبژاردە.

جوولەکە باوەڕیان وایە کە جیهان بە بێ ئەوان هیچ بەهاو بایەخێکی نیە و ئەم پیرۆزیو تایبەتمەندێتیەشیان دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە وا دەبیـنن ڕۆحـی جوولەکـە تێکەڵـە بـە ڕۆحـی خـوا و لـە گـەورەیی و پـیرۆزی و تایبـەت مەنـدێتی ئـەو بـە هرەمەندبوون – سبحانه و تعالى عما يكذبون. [2]

لێرەوە جوولەکە ئەو هەستەیان لەلا دروست بووە کە شەریکن لەگەڵ خوادا بـۆ مەبەستی مل کەچ کردنی سەرجەم مرۆڤەکان لە ئاستیاندا.

لە ڕوانگەی ئەم یاسایەوە جوولەکە خۆیان وەك نەتەوە بە پیرۆز دەزانن و ئـەو خاکەی کەلەسەری شی دەژین هەر بە پیرۆزی تەماشا دەکەن.

دیسـانەوە لـە (تلمـودی) دەسـت کـردی خۆشـیاندا زۆر بـە ئاشـکرا بـاس لـە تایبەتمەندێتی جوولەکە دەکات و دەڵێت:

---

١– سفر اللاويين (٢٦، ٢٤، ٢٠).

٢– الأساطير التأريخية اليهود حول الأرض مسجد الأقصى: عثمان سعيد العاني ص١٠٣.

- (الشعب المختار فقط يستحق الحياة الأبدية و أما باقي الشعوب فمثلهم كمثل الحمير)

واتە: بە تەنها گەلی هەڵبژاردە، شایستەی ژیانی هەتا هەتاییە، بەڵام تەواوی گەلانی تر نموونەیان وەك گوێ درێژ وەهایە.

- (أيها اليهود إنكم من بني البشر لأن أرواحكم مصدرها روح الله، و أما باقى الأمم فليست كذلك لأن مصدرها الروح النجسة).

واتە: ئەی جوولەکە ئێوە لە نەوەی ئادەمیزادن چونکە ڕۆحی ئێوە سەرچاوەی لە ڕۆحی خواوە گرتووە، وە تەواوی گەلانی تر ئەم تایبەت مەندێتیەیان نیە و سەرچاوەی ڕۆحەکانیان لە ڕۆحە پیسەکانەوەیە.

- (أرواح اليهود عزيزة عند الله باالنسبة لبباقى الأرواح لأن أرواح غير اليهود أرواح شياطين و شبيهة بأرواح الحيوانات)

واتە: ڕۆحی جوولەکە بەڕێزە لە لای خوا، بە بەراورد لەگەڵ ڕۆحی سەرجەم گەلانی تردا، چونکە ڕۆحی غەیری جوولەکە بریتین لە ڕۆحی شەیتانەکان و وێنەیان وەك ڕۆحی ئاژەڵان وەهایە.

- (كل اليهود مقدسون، كل اليهود أمراء، لم تخلق الدنيا إلا لجماعة إسرائيل) [1]

واتە: سەرجەم جوولەکە پیرۆزن، هەموو جوولەکەیەك گەورەو سەردارە، دنیا دروست نەبووە مەگەر بۆ کۆمەڵی ئیسرائیل نەبێت؟!

- (الأمميوت هم الحمير، خلقهم الله، ليركبهم شعب الله المختار)

واتە: سەرجەمی گەلان - غەیرە جوولەکە - گوێ درێژت، خوا دروستی کردوون بۆ ئەوەی گەلی هەڵبژاردەی خوا سواریان بن!!!!!

ئەمەی کە وترا بەشێکی زۆر کەم و بچوکە لەو بیروباوەڕوو بنەما فکریانەی کە جوولەکە وێنای کەسێتی خۆیانی بۆ دەکەن و لەبەرامبەریشدا گەلانی تری غەیری جوولەکە بە ئاژەڵ وگیانداره بار هەڵگرەکان دەزانن، گومان لەوە دانیە کە

---

١- الكنز المرصود في قواعد التلمود، ص٣٧٥.

لەسەردەمی خۆیاندا خوای گەورە نعمەت و بەخششی زۆری پێدان، هەر لە ڕزگارکردنیان لە دەستی فرعەون و ناردنی دەیان پێغەمبەر بۆ ناویان و لەسەروو هەمووشیانەوە فەزڵی دان بەسەر، سەرجەم گەلانی ئەو سەردەمەی جیهاندا، قورئان شاهیدی لەسەر ئەم ڕاستیە دەدات هەروەك دەفەرمووێت: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ البقرة: ٤٧

واتە: (ئەی نەوەی (إسرائیل) یادی نازو نیعمەتەکانم بکەنەوە کە ڕشتومە بەسەرتاندا وەمن ڕێزی ئێوەم داوە بەسەر خەڵکی هەموو جیهاندا) سەرجەمی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوە یەك ڕان کە فەضلی جوولەکەکان لەسەردەمی خۆیاندا دراوە بەسەر خەڵکی دا پەیوەندی بەسەردەمی دوای خۆیانەوە نیە.

بەڵکو زۆر بە پێچەوانەوە گەلی (جوولەکە) دوای ناردنی ئەو زنجیرە پێغەمبەرە بۆ لایان لەلایەن پەروەردگارو پەرتوکی ئاسمانی بۆ مەبەستی ڕێنیشاندانیان، خیانەتوو ناپاکیان دەرهەق بە پێغەمبەران و پەرتوکە ئاسمانیەکان ئەنجام دا، ئەویش بەوەی کە دەستیان دایە پێغەمبەر کوشتن و لە ناوبردنیان و پاشان گۆڕین و دەستکاری کردن و شێواندنی پەرتووکە ئاسمانیەکان و لابردنی وتەکانی خوای گەورە و دانانی قسە پوچ و بێ ماناکانی خۆیان لە جێگەیدا هەر بەم هۆیەوە بوو کە (جوولەکە) لە بالاترین ئاستی گەورەیی و فەزڵەوە دا بەزینە نزم ترین ئاستی مرۆڤایەتی و بۆ دواجار لە سنوری مرۆڤ بوون دەرچوون و خرانە ڕیزی (بەرازو مەیمون) ەوە و زانا نەزانەکانیشیان بە گوێ درێژی هەڵگری بارە کتێب لە لایەن خوای گەورە وەسف کرا!!

پاشان لەسەر زمانی پێغەمبەرانیانەوە نەفرینیان لێ کراو لە سۆزی پەروەردگار وەدەرنران.

هۆکاری ئەم نەفرین لێ کردنەش بەهۆی ئەنجام دانی سیفەتە دزێوو خراپەکانیانەوە بووکە بریتی بوون لە مانە:

١- كاریان نەدەكرد بەوەی كە دەیان زانی و فەرمانیان بە چاكە نەدەكردوو ڕێگریان لە خراپە نەدەكردو شوێن ڕاستی نەدەكەوتن و پشتیان تیّ دەكرد.

٢- هەڵسان بە دەست كاری كردن و شێواندنی كتێبە پیرۆزەكان.

٣- هیچ پەیمانێكیان نە دەبردە سەرو بەردەوام دەیان شكاند.

٤- بیّ باوەڕیان ئەنجام دەدا لە بەرامبەر بە نیشانەكانی خوای پەروەردگاردا.

٥- بوهتان و قسەی نابەجێیان بە دەم خواوە هەڵدەبەست و بڕیاری هەژاریان دەدا بۆ خواو دەوڵەمەند بوونیش بۆ خۆیان.

٦- بانگەشەی ئەوەیان دەكرد و بەشانازیەوە دەیان وت (عیسی) مان كوشتووە.

٧- بیّ ئەدەبیان لەبەرامبەر خوادا ئەنجام دەدا بەوەی كە سیفەتی ناشیاوو نادروستیان دەخستە پاڵی.

٨- لەڕیزی یەكەمی ئەوانەدا بوون كە هاوەڵیان بۆ خوا ئەنجام دەدا و فریشتەكانیان بە كچی خوا هە ژمار دەكرد (سبحان و تعالی عما یشركون).

٩- مامەڵەكردنیان بە كاری (سو) خۆری و خواردنی ماڵی خەڵكی بە ناڕەواو گویّ نەدان بە ماڵی حەرام.

## كێشەی فەلەسطین لەنێوان بیری ناسیۆنالیزمی عەرەبی و هەستی ئیسلامیدا

وەك لای هەمووان ئاشكرایە كە لە ساڵی (١٩٤٨) ەوە خاكی فەلەسطین لە لایەن جوولەكەی خوێن ڕێژەوە داگیركراوە و لەو ساڵەوە تا ئێستا (٦٢) ساڵ دەكات، كێشەی فەلەسطین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوو لە خراپ بوون و ئاڵۆز بوونی زیاتر دەكات و سەرجەمی ئەو هەوڵ و دژایەتی و خەبات و تێكۆشانەی كە لەلایەن گەلی ستەم لێكراوی فەلەسطینیەوە ئەنجام دراوە لەبەرامبەر قەوارەی زایۆنیدا، پوچ كراونەتەوەو لە بار براون.

لێرەدا من باس لەو خەباتە نەپساوو بەردەوامەی گەلی فەلەسطین ناکەم کە لە ماوەی نیو سەدە زیاتر کردوویانە لە دژی (إسرائیل) چونکە لە باسەکانی پێشوودا کەم تا زۆر باسمان لێوە کردووە، ئەوەی جێ سەرنج و لەسەر ڕاوەستان بێتو ئامانجم لە باسکردنیدا هەبێت ئەوەیە کە:

١- ئایا کێشەی فەلەسطین کێشەیەکی دینیە یان نەتەوەییە ؟!

٢- ئایا جوولەکە بنیادی دەسەلاتی سیاسی و عەسکەری و ئابوری خۆی لەسەر (دین) بنیاد ناوە یان شتی تر؟! ڕوون تر بڵێین: ئایا دەوڵەتی (إسرائیل) دەوڵەتێکی دینیە ؟ یان دەوڵەتێکی نەتەوەییە؟!!

٣- ئایا لە بەرامبەردا دەکرێت ئێمە بە چ شێوەیەك لە کێشەی فەلەسطین بڕوانین؟!

٤- کێشەی فەلەسطین چ پەیوەندییەکی بە ئومەتی ئیسلامیەوە هەیە ؟!

٥- خەبات کردن بۆ ڕزگارکردنی فەلەسطین لە دەستی جوولەکە پێویستە لە ڕوانگەی کام لە مانەوە بێت: أ- ئیسلام بکرێتە بنەماو لەوێوە خەبات لە دژی جوولەکە ئەنجام بدرێت !!؟

ب- بیری نەتەوە پەرستی و ڕەگەزپەرستی (ناسیونالیزم) و شۆڤێنیەتی عەرەبی بکرێتە بنەما و لەوێوە دژایەتی قەوارەی إسرائیلی پێ بکرێت!!

٦- ئایا مەترسی دژایەتی کردنی جوولەکە بە بیرێکی إسلامیانەوە کاری گەری زۆرترە لەسەر تێك شکاندنی دەوڵەتی إسرائیل یان بە بیری عەرەبی شۆڤێنیەوە ؟!

٧- ئایا دەکرێت ئێمەی کورد وەك میللەتێکی ستەم لێکراو و موسڵمان بێ دەنگ بین لە بەرامبەر بە کێشەی فەلەسطین ؟! بە بیانووی ئەوەی کە ئەوان لە ئەنفال و کیمیاباران و نەهامەتیەکاندا هەست و هەڵوێستێکیان نەبووە ؟!!

٨- واجبی ئێمەی موسڵمان لە بەرامبەر بەکێشەی فەلەسطین و قودسی داگیرکراو دەبێت چی بێت ؟!!

٩- ئایا جوولەکە بە تەنها فەلەسطین ی داگیرکردووە ؟! یان ئەمە هەوڵێکە بۆ داگیرکردنی تەواوی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دژایەتی کردنی ئومەتی ئیسلامی و سەرکوت کردن و لە ڕیشە دەرهێنانی ؟!

بۆ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە و دەیان پرسیاری تر کە ئێستە لە بیری تۆی خوێنەردایە دەڵێین (و بالله التوفيق):

(سەرەتا هەموو دەبێت لەوە تێبگەین کە خاکی فەلەسطین خاکێکی پیرۆزە و قورئان باس لەم پیرۆزیە دەکات و هاوشان لەگەڵ (مەککەی) پیرۆز باسیان لێوە دەکات لە سەرەتای سورەتی (الأسراء) دا، کە دەفەرمووێت: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الإسراء: ١

واتە: (پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەوی کرد لە بەشێکی کەمی شەودا بەبەندەی خۆی (محمد صلی الله علیه وسلم) لە مزگەوتی (حرام، کەعبەی پیرۆزەوە) بۆ مزگەوتی (الاقصى) لە (بیت المقدس) کە دەوروبەریمان پیرۆزو پڕ بەرەکەت کردووە، تا هەندێك نیشانەو بەڵگەو دەسەڵاتداری و توانایی خۆمانی نیشان بدەین، بەڕاستی ئەو زاتە بیسەرو بینایە.)

بەڵێ خاکی فەلەسطین خاکێکی پیرۆزەو لەگەڵ ئەوەشدا خاکی ئەو کەسانەیە کە تێیدا دەژین، هەروەك چۆن هەموو خاکێك لەسەر ئەم زەوی یەدا موڵکی ئەوانەیە کەلەسەری دەژین و باوو باپیرانیانی لەسەر ژیاوە، پێم وایە هیچ کەسێك ناتوانێت إنکاری ئەم ڕاستیە بکات.

بەهەمان شێوەش خاکی فەلەسطین موڵکی ئەوانەیە کە لەسەری دەژین و باووباپیرانیانی لەسەر ژیاوە، ئەوانەی لەو خاکەدا دەژین و پێشتریش ژیاون خەڵکێکی مووسڵمان بوون و پابەندبوون بە دینی إسلامەوە و زۆرینەیان پەیڕەویان لەیاساکانی ئەو دینە کردووە و لەبەرامبەریشدا هەریەك لە دینەکانی تری (جوولەکە و گاورو....) بوونیان لەسەر ئەو خاکە هەبووە، بەڵام ڕێژەیەکی کەم بوون و ((دینی

کەمینە) ) بوون و هێندە هێزوو ژمارەیان زۆر نەبووە کە جێ ی سەرنج بێت و هاو ئاستی پەیڕەوانی دینی إسلامی ببنەوە.

لەلایەکی دیکەوە بەشی هەرە زۆری خاکی فەلەسطین داگیرکراوەو خاوەنە شەرعیەکانی خۆی تێدا ڕاگوێز کراوە، پاشان ئەو جوولەکانەی لەوێدا نیشتەجێ کراون هەریەکەی خەڵکی وڵاتێك و بگرە کیشوەرێکی ترن و هێنراونەتە فەلەسطین و خراونەتە جێگەی خاوەنە ئەصلیەکانی ئەو زەوی و خاکە، کە هەزاران ساڵە جێگەی خۆیان و باوو باپیرانیان بووە!! بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەم خاڵە(کەرکوك) بە نموونە وەردەگرین، کە یەکێکە لە شارەکانی کوردستان و دەیان ساڵە لە کوردستان کراوەتەوە و خراوەتە سەر پارێزگا عەرەب نشینەکانی تری عێراق، ئێمەی کورد چەندین ساڵە خەبات و شۆڕش دەکەین لە پێناو ڕزگارکردنی کەرکوك لە دەستی عەرەبە شۆڤینیەکان، بەشێکی هەرە زۆر لە زامەکانی ئێمە لە مەسەلەی کەرکوك دا بریتی یە لە جێ بە جێ کردنی سیاسەتی بە عەرەب کردنی ئەو شارەو سڕینەوەی شوناس و کلتوری ئەو شارە کە کوردایەتی یەو پاشان دەرکردنی خێزانە کوردەکان و نیشتەجێ کردنی عەرەب لە جێگەکانیاندا!!

جا سەرنج بدە!! ئەو عەرەبانەی کە هێنراونەتە کەرکوك و لە جێگەی خێزانە کوردەکان دانراون خەڵکی کوێن ؟! ئایا لە وڵاتانی تری عەرەبیەوە هێنراون و هەریەکەی دانیشتوی وڵاتێکی ترن ؟! بێ گومان لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، ئەو عەرەبانە خەڵکی دروستی عێراق و هەڵگری شوناسی عێراقین!!

بەڵام لە هەمان کاتدا ئێمە بە داگیرکەرو ستەم کاریان دەزانین کە هاتوونەتە شارێکی کوردییەوە و سیمای ئەو شارەیان لە کوردایەتی سڕیوەتەوە و بە شارێکی عەرەبی نمایشی دەکەن هاوشان لەگەڵ پارێزگا عەرەب نشینەکانی تردا هەژماری دەکەن!!

من باوەڕ ناکەم هیچ کوردێك حاشا لە کوردستانی بوونی کەرکوك بکات و ڕێگە بە خۆی بدات کە باوەڕی وابێت کەرکوك بە عەرەب نەکراوە و داگیرنەکراوە،

خەباتی دەیانساڵەی شۆڕشە یەك لە دوا یەکەکانی کورد لەسەدەی ڕابووردوو تەنانەت بە ئێستەشەوە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستیە !!

**پرسیارەکە لێرەوە دروست دەبێت:**

باشە گەر عەرەبی دانیشتووی عێراق و هەڵگری شوناس و ناسنامەی عێراقی بە داگیرکەرو پاوان خواز هەژمار بکرێت لەوەی کە کەرکوکیان داگیرکردووەو کەلتورو مێژوو داب و نەریتی ئەو شارەیان سڕیبێتەوە ؟! ئەی دەبێت چی بوترێت لەبەرامبەر خەڵکی فەلەسطینی عەرەب نشین و موسڵمان کە لە هەموو جیهانەوە جوولەکەی بۆ هێنراوە و لە جێگەی خاوەنە شەرعیەکانی ئەو خاکەدا نیشتەجێ کراوەو دانراوە ؟!!

ئەمە نموونەیەکی زۆر سادە بوو بۆ زیاتر تێگەیشتن و نزیك بوونەوەمان لەم باسە، کە خاکی فەلەسطین خاکێکی داگیر کراوە لە لایەن بریطانیاوە، بە پێی بەڵێنی (بلفور) کار ئاسانی و ڕێخۆش کردن سازێنراوە بۆ جوولەکەو بۆ دواجار و لە ساڵی (١٩٤٨) دابە تەواوی ئەو خاکە پیرۆزەیان داگیرکرد.

گەر کەسێك هەبێت و بڵێت: نەخێر وەها نیە و خاکی فەلەسطین هەر لەدێر زەمانەوە خاکی جوولەکە بووە و لە ئێستەدا مافی خۆیانە کە بگەڕێنەوە ناوی ؟!!

لە وەڵامدا بە هەموو ئەوانەوە دەڵێم:

(گەر خاکی فەلەسطین خاکی جوولەکە بوایە ئەوە نەدەبوو هەر لە سەرەتاوە و لەسەردەمی سلطان عبد الحمیدی دووەمدا، لە لایەن (تیودور هرتزل) ەوە کە دامەزرێنەری بزوتنەوەی ماسۆنیەتی جیهانی بوو، مامەڵە بە کڕینی ئەم خاکەوە بکردایەو داوای لە (سلطان) بکردایە کە پێیان بفرۆشێت !!

باشە گەر کەسێك خاوەنی هەر شتێك بێت، جا گەورە بێت یان بچوك بەها داربێت یان بێ بەها، و لێی داگیرکرابێت، چۆن تەواوی هەوڵەکانی دەخاتە گەڕ بۆ کڕینی مافە زەوت کراوەکەی ؟!

ڕوونتر بڵێم: گەر خاکی فەلەسطین ملکی دروستی جوولەکە بوایە، ئەوە خەباتیان دەکرد بۆ ڕزگارکردنی لە دەستی داگیرکەران، هەروەك نموونەی هەزاران

شۆڕشی ئەم دنیایە لە دژی داگیرکەران و ڕزگارکردنی خاك و وڵات لە دەستیان، نەك هەوڵ دان بۆ کڕینی ئەو خاکە لە دەسەڵاتدارانی؟ لە کۆتای ئەم وەڵامەدا ئەوە دەڵێم کە: شتێك مامەڵەی پێوە دەکرێت و دەکڕێیت کە هی خۆت نیەو دەتەوێ بەو پارەو مامەڵەیە بیکەیتە موڵکی خۆت!!!

پاشان دێمە سەر وەڵامی پرسیارەکان و لەوێوە دەست پێ دەکەم کە ئایا کێشەی فەلەسطین کێشەیەکی دینیە یان نەتەوەییە ؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: گەر بمانەوێت وەڵامێکی دروست بۆ ئەم پرسیارە دابنێین، دەبێت پرسیارێکی تر بکەین: ئایا ئەوانەی کە خاکی فەلەسطین یان داگیرکردووە کێن؟!

ئایا دیارترین سیمایان لە ڕووی (زمان، دین، ڕەگەز، شوناس، مێژوو، بیروباوەڕ...) چیە؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: دیارە کە ئەوانە دیارترین (سیما) یان (دین) ە و لە ڕوانگەی ئەوەشەوە بنیادی هێزی (سیاسی و سەربازی و ئابوری و دەسەڵات و دیاری کردنی سنورو تەواوی شتەکانی تریان داوە) بە شێوەیەکی گشتی و گشت گیر، دەوڵەتی إسرائیل و قەوارەی زایۆنی دەسەڵاتێکی دینیە پێش ئەوەی دەوڵەتێکی نەتەوەی بێت.

یەکەکانی بنیادی ئەم دەوڵەتە لە ڕووی دروست بوون و ژمارەوە مەسەلەی (دین) و جوولەکە گەرایی بەهێزی کردووەو نەك مەسەلەی نەتەوەییەکان بەڵگەشمان بۆ ئەمە، ئەوەیە کە جوولەکە نیشتەجێ کانی فەلەسطین -هەروەك پێشتر باسمان کرد-هەریەکەیان خەڵکی وڵاتێکن و هیچ ڕایەڵەیەکی پەیوەندی نەتەوەیی و مێژووی و کلتوری لە نێوانیاندا نیە، بەڵکو تەنها شتێك کە گرێ ی داون و پەیوەندیەکانی نێوانیانی بەهێزکردووە (دینە)، کەواتە ئێستە وەڵامی پرسیارەکەمان دەست کەوت کە دەوڵەتی (إسرائیل) لەسەر بنەمای دین دروست بووە نەك لەسەر بنەمای (نەتەوە)، ناونانی دەوڵەتەکە بە (إسرائیل) و ئاراستەکردنی دەسەڵاتدارانی ئەو قەوارەیە بە تەواوی دام و دەزگا و یەکە

سەربازیەکانی و بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی، لەلایەن زاناو حاخامەکانی جوولەکەوە باشترین بەڵگەن لەسەر ئەم ڕاستیە، پاشان بێینە سەر وەڵامی ئەوەی کە ئایا کێشەی فەلەسطین کێشەی دینە یان نەتەوەیە؟! بە تێگەیشتن لە وەڵامی پرسیاری پێشوو، وەڵامی ئەم پرسیارەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەویش بەو جۆرەی، گەر دەوڵەتی (إسرائیل) قەوارەیەکی دینی بێت و لەسەر بنەمای (دین) بنیادی دەوڵەت و دەسەڵاتی خۆی نابێت، ئەوا بێگومان کێشەی فەلەسطینیش کێشەیەکی دینیە نەك نەتەوەی و دەبێت لە ڕووی دینەوە ڕووبەڕووی ئەم قەیران و کێشەیە ببینەوە نەك لە ڕووی نەتەوەییەوە (ناسیونالستی).

سیاسەتەکانی (إسرائیل) لە نێو خاکی فەلەسطین دا بە درێژی (٦٢) ساڵی داگیرکاری بریتی نەبووە لە کارکردن لەسەر سڕینەوەی مۆرکی نەتەوەیی عەرەب ودژایەتی کردنی زمان و کەلتوری عەرەبی بە پلەی یەکەم، بەڵکو بەڕێژەی هەرە زۆر و لەڕیزی یەکەمدا، دژایەتی دینی ئەو خەڵکە کراوە و ئەم خاڵە بۆتە چەقی دوژمنایەتیەکەی، بەڵگەشمان لەسەر ئەمە داگیرکردنی (قودس) ی پیرۆزە لەلایەن قەوارەی (إسرائیل) و تا ڕادەیەك نەرمی نواندن لە بەرامبەر حزب و لایەن نیشتیمانیە شۆڤینیەکان و سەرکوت کردن و لەڕیشە دەرهێنانی بزوتنەوەئیسلامیەکانە، (٦٢) ساڵە بە ناوی عەرەبی و ڕەگەز پەرستی عەرەبیەوە دژایەتی جوولەکە دەکرێت لەفەلەسطین دا چ بەرهەمێکی هەبووە و چی لێ سەوز بووە ؟!

گەر کێشەی فەلەسطین کێشەی عەرەبی بوایە هەروەك دەڵێن (کێشەی عەرەب – إسرائیل) ئەوە دەبوو جوولەکە لە نێو ئەو ملیونەها عەرەبەی نیشتیمانی عەرەبدا هەر زوو کۆتایی بە دەسەڵات و هەیمەنەی بهاتایە و ڕیشەکێش بوایا!!

بەڵام بە پێچەوانەوە نەك ئەمە نەبوو، بەڵکو إسرائیل ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە ڕووی هێزی سەربازی و دەوڵەتی سیاسی و ئابوری و سەرجەم بوارەکانی ترەوە بەهێزتر دەبێت و کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبیش زۆر زوو زیاتر بە چۆك دا دێن و ئاڵای سپی و خۆ بە دەستەوە دان بۆ حکومەتی ئیسرائیل هەڵدەکەن، دژایەتی کردنی إسرائیل بە

ناکرۆ دەبێکی نەتەوە پەرستی و شۆڤێنی وەك نموونەی کەسێك وەهایە کە ئۆتۆمبیلەکەی لە بێ بانزینی دا گوژابێتەوە و ئەویش بۆ چارەسەرکردنی ئۆتۆمبیلەکەی بچێت (پۆن) ی بزوێنەرەکەی بگۆڕێت بە ئومێدی کەوتنەوە ئیشی ئۆتۆمبیلەکەی، کە بێگومان ئەم دوو شتە زۆر دوورن لە یەکتری و نەمانی بەنزین لە کوێ و پۆن گۆڕین لەکوێ؟! ئایا ئەو ئۆتۆمبیلە بە گۆڕینی پۆنەکەی دەکەوێتەوە کار؟!!

بێ گومان نەخێرەو چارەسەرکردنی کێشەی نێوان (جولەکەو فەلەستین) یش بە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دینداری ئیسلامیەوە دەبێت لەبەرامبەر جولەکەدا، چونکە – هەروەك باسمان کرد – ئەوان بەناوی دینەوە دژایەتی خەلکی فەلەستین و ئومەتی ئیسلامی دەکەن نەك بەناوی نەتەوەییەوە!! تاشۆڕشی نەتەوەییان لەدژ سار بدرێت!!!.

جولەکە زۆر خۆش حالە ئەم کێشە و دژایەتیە ناوبنرێت بەکێشەی عەرەب– إسرائیل، نەك بەکێشەی (إسلام– إسرائیل) چونکە جولەکە باوەڕی تەواویان بەوە هەیە کە تا هەزاران سالی تر کۆتایی دنیا بەناوی نەتەوەپەرستی و شۆڤێنیەتی عەرەبیەوە ڕووبەڕوویان بوەستێتەوەو دژایەتیان بکەن، ناتوانن سادەترین مافی خۆیان وە دەست بخەن و بەرد لەسەر بەرد دابنێن و مێژووی خەباتی نیوسەدە زیاتری شۆڕش و بزوتنەوەو دەولەتە عەرەبیە شۆڤێنیەکان بەلگەن لەسەر ئەم ڕاستیە، بەلام لەبەرامبەر ئەمەدا ئەوەی جێ ی مەترسی و نائارامی و نیگەرانیە لەلای قەوارەی زایونی (إسرائیل) بوون و دروست بوونی حزب و لایەن و ڕێکخراوی ئیسلامیە لەدژی جولەکە، چونکە ئەوان باش لەوە تێ گەیشتوون کە لەشەڕی بەرامبەر بەبیروباوەڕی پتەوی ئیسلامیدا شکست دەخۆن و وەك خوێ ی ناو ئاو دەتوێنەوە، مێژوو شاهیدە لەسەر ئەم حالەتەو جولەکە شەڕی هەموو کەس و بیروباوەڕێکی لەم سەر زەویەدا پێ دەکرێت و سەرکەوتوش دەبێت بەسەریدا، تەنها شەڕی موسلمانی ڕاستەقینەی پێ ناکرێت و چۆك دادەدات لەبەرامبەریدا، جولەکە باش حالی بووە لە دروشمی ((خیبر خیبر یا یهود جیش محمد سوف یعود)) بوونی

بزوتنەوە إسلامیەکانی سەر گۆرەپانی فەلەسطین، هەریەك لە بزوتنەوەی (جیهاد و حەماس) و بەتایبەت تر (حماس) گەورەترین زەبری کوشندەی داوە لەسەر دڵی قەوارەی (إسرائیل) و بەتەواوی مانای ئارامی لەبەربڕیوون، هەربۆیە بەهەموو جۆرێك و بەبەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێك، تەنانەت چەکە قورسە قەدەغەکراوە نێودەوڵەتیەکانیش و بەئاگرو ئاسن دژایەتی بزوتنەوەی بەرگری ئیسلامی (حماس) دەکات وبەدەستەڵاتێکی ناشەرعی فەلەسطینی ناو دەبات، هۆکارەکانیشی ئاشکران و لەبەر ئەوەیە کە حەماس بەتایبەتی بزوتنەوەیەکی ئیسلامی جیهادی مەبدەئین و ڕێگەی دروستی ململانێی دژایەتی إسرائیل یان دۆزیوەتەوەو لەو ڕێگەیەوە خەبات دەکەن و زەبری کوشندە لە إسرائیل دەدەن و نائارامی سەرتاسەری لەنێویاندا دروست دەکەن.

یەکێکی تر لەو پرسیارانەی پێویستە وەڵام بدرێتەوە ئەوەیەکە:

ئایا دەبێت ئێمە وەك میللەتی کوردی موسڵمان خاوەنی چ هەڵوێستێك بین لەبەرامبەر کێشەی فەلەسطین دا ؟! ئایا بێ دەنگ بین بە بیانووی بەدەنگ نەهاتنی ئەوان لەسەر ئێمە؟ یان بەدەنگ بین وەك دەربڕینی هاودەمی و هاوسۆزی بۆ گەلێکی ستەم لێ کراوو وخاك داگیرکراو؟!

حەزدەکەم لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کەمێك بابەتیانەو واقیعیانە تر بدوێم و هەندێك ڕاستی بخەمە ڕوو کەزۆربەی خەڵکی لێ ی بێ ئاگان!!

١-گەر بەبیرێکی ڕەگەزپەرستی و نەتەوە پەرستیەوە بڕوانینە کێشەی ڕەوای گەلی فەلەسطین ئەوە بێ دەنگ بون و بێ باك بوون باشترین هەڵوێستمان دەبێت!!

چونکە لەبیری بچوك و سنورداری نەتەوە پەرستی و دەمارگیری دا مرۆڤ دەبێت بەتەنها لەبیری دۆزی نەتەوەی خۆیدا بێت و لەخەمی گەل و نەتەوەکانی تردا نەبێت وبێ باك بێت لەئاست کێشەکانیان دا!!! کەئەمەش لەڕاستیدا بچوك کردنەوەی گەورەیی و مەزنی مرۆڤەکان دەردەخات لەئاست یەکترداو هیچ ڕایەڵەیەکی پتەووبەهێز نامێنێت لەنێوانیاندا و بیری پوچی نەتەوە پەرستی

(ناسیۆنالیزم) مرۆڤایەتی لەبەریەك هەڵدەوەشێنێت و بچوکیان دەکاتەوە لەتاقم تاقمی بچوك و لاوازدا.

٢-گەر پرسیارێکی واقیعی ئاراستەی هەموو کەسێکی ژیرو فامیدە بکەین و پێیان بڵێین: -

((ئایا ئێوە لەئێستەدا و لەڕێگەی چ هۆکارێکەوە باس و خواسی گەلان و میللەتانی تری دورو نزیك دەزانن و لەکێشەو ناڕەحەتیەکانیان ئاگادار دەبن؟! لەوەڵامدا تەنها ئەوەدەڵێن: بێگومان لەڕێگەی ڕاگەیاندنەکان(میدیا) هەر لە (ئەنتەرنێت و سەتەلایت.......بەپلەی یەکەم و ئەوجا هۆکارەکانی تر)) لێرەوە هەم پرسیارەکەو هەم وەڵامەکەش دەست پێ دەکەن وکۆتاییان دێت، ئەویش بەوەی، گەر ئەو هۆکارانەی کەئێستا هەیە بەتایبەت (ئەنتەرنێت و سەتەلایت) هەواڵ و ڕوداوەکانمان وەك خۆی و لەکەمترین ماوەدا بۆ نەگوێزنەوە، ئێمە بەچیدا هەواڵ و ناڕەحەتی و کارەساتی گەلان و میللەتانی ترمان پێ دەگات ؟! پرسیارەکە پێچەوانە بکەرەوە، گەلی ستەم لێکراوی فەلەسطین کەخۆیان نوقمی غەزەب و تۆپ و فڕۆکەو ئاگرو ئاسنی جولەکەی خوێن ڕێژ بوبون و لەساڵی (١٩٤٨) ەوە خوێنیان بەناحەق دەڕژا لەکوێوە ئاگاداری حاڵی ئێمە بن، لەکاتێکدا کەئەو کاتانەی ئێمە دەچەوسێنرانیەوە بەدەستی بەعسی عەلمانی و شۆڤێنی عەرەبی ڕاگەیاندن وەك ئێستاو بەبێ پەردە بونێکی وەهای نەبوو کەئابڕوی ستەم کاران بەرێت و گەندەڵیەکانیان لەکەمترین ماوەدا ئاشکرا بکات و نیشانی هەموو جیهانی بدات !!!

٣-گەر دەنگ نەکردن لەئاست کێشەو نەهامەتیەکانی ئێمەی گەلی کوردا لەلایەن فەلەسطینیەکانەوە کارێکی عەیبەو دزێوو خراپ بێت؟! هەروەك دەڵێن، ئەوە بە پێ ی ئەم پێوەرە وڵاتە زل هێزەکانی ئەوروپا و ئەمریکا بەگشتی پشکی شێریان بەردەکەوێت لەوەی بەتاوانبارو بێ هەڵوێست سەیریان بکەین، چونکە سەرجەمی ئەوچەکە کۆمەڵ کوژیانەی کە دەدران بەحکومەتی (بەعس) و (صدام)ی جولەکە ڕەفتار، لەلایەن وڵاتە زل هێزەکانی ئەوروپای بەناودیموکراسی و مافی

مرۆڤەوەدەی درایە و خۆشیان لەهەموو کەس زیاتر ئاگادارو شاهیدی ئەوە بوون کە (صدام) چی بەئێمەی کورد دەکردوو چۆن ئەنفال وکیمیاوی و ڕەشە کوژی لەبەرامبەرماندا ئەنجام دەدا، تا ئەو کاتەی کە ئەمریکا و ولاتانی ڕۆژئاوا بەرژەوەندیان گرێ درابوو لەگەلّ (صدام) دا کەشەڕی ئێرانیان بۆ بکات لەبری خۆیان، بێ دەنگ و کەڕو کوێرو لالّ بوون لەئاست تاوان و ڕەشە کوژیەکانیدا، بەلام ئەوکاتەی کە بەرژەوەندیان لەگەلّدا نەما بەودەردەیان برد کە هەموو دەزانین!!
کەواتە تاوانباری گەورەو سەرەکی لەئاست کێشەکانی ئێمە و سەرجەم ناڕەحەتی و دەربەدەری و جینوسایدمان لەلایەن بەعسی ئەفلەقیەوە، ئەمریکاو سەرجەم دەولّەتە زل هێزە خاوەن بڕیارەکانی ئەوروپاوە بوو نەك گەلی خوێن ڕێژکراو و داگیر کراوی فەلەسطین، کەناڕەحەتی وگرفتەکانیان بەدەست جولەکەوە هیچی کەمتر نەبوو لەئێمە.

٤-با سەرێك لەولاتانی بەناو ئیسلامی عەرەبیش بدەین و گوزارشتێکی ژیرانە بەبێدەنگی و بێ هەلّوێستیان بکەین لەبەرامبەر دەربەدەری و نەهامەتیەکانی ئێمەی کوردا.

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین کەلەسەرجەم ولاتانی بەناو ئیسلامی و عەرەبیدا میللەت وحکومەت دووشتی زۆر جیاوازو بگرە نەیارن لەگەلّ یەکدا ونەحکومەت و دەسەلاتەکەی نوێنەری ڕاستەقینەی میللەتەو نەمیللەتیش شەرعیەتی تەواوی داوە بەودەسەلاتە کەتا مردن لەسەر کورسی حوکم بێت و دوای مردنیشی کوڕەکەی لەجێگەی دا دابنیشێتەوەو ئەوەی باوکی فریای نەکەوت لەستەم و بەتالان بردنی سامانی ولات، ئەم بۆی تەواو بکات!! ئەمە ڕاستیەکەیەو گومانی تێدا نیەو حالّی ولاتانی عەرەبیە کەلەڕوی دیکتاتۆری و حوکمی تاك ڕەویەوە هیچیان لە (صدام) ی لەگۆڕنراو باشترنین، تەنها لەڕوی ناوەوە نەبێت، بەلام لەناوەڕۆکدا هەریەك بابەتن و قوتابی یەك قوتابخانەن.دەسەلاتدارانی ولاتانی عەرەب نەك هەر ئیسلامی نین، بەلّکو دژی هەرکەس و حیزب و لایەنێکن کە ئیسلامی ڕاستەقینەبێت و پڕکردنی

بەندی خانەکانیان لەلایەنگران و هەوادارانی گروپە إسلامیەکان باشترین بەڵگەن بۆ ئەم ڕاستیە.

(میصر وتونس) نزیك ترین نمونەن کەلەم خاڵە باشتر تێ بگەین، ئەو وڵاتانە هەروەك وتمان بەهیچ جۆرێك وەك دەستەڵات و ممارەسەی حوکم نابێت پێیان بوترێت وڵاتانی إسلامی، چونکە هیچ سیمایەکی ئیسلامیانە بە حوکم و دەستەڵات و هەست و هەڵوێستیانەوە بەدی ناکرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەست تێکەڵن لەگەڵ جولەکە و ئەمریکا و نەیارانی ئیسلامدا بۆ ڕیشەکەن کردنی هەرکەس و لایەنێك کەبانگەشەی ئیسلامەتی ڕاستەقینە بکات، کەواتە دەکرێت بەو وڵاتانە بڵێین: وڵاتانی عەرەبی علمانی نەك ئیسلامی، چونکە بەپێ ی هەموو پێوەرەکان ئەوانە علمانین و خزمەت بە پرۆژەی عەلمانیەت دەکەن لەووڵاتانی خۆیانداو دژی ویست و ئیرادەی گەلەکانی خۆیانن و پێچەوانەی حەزو دەنگ و ئیرادەیانن.

لەبەر ئەمە گەر وڵاتانی عەرەبیش تاوان بار بکرێن بەبێ دەنگ بوون لەئاست کێشە و نەهامەتیەکانی میللەتی کوردا، ئەوە پێش هەموو کەس ڕەوتە عەلمانی و نەتەوە پەرستەکان عەیب داردەبن چونکە سەرکردەی زۆربەی ئەو وڵاتانە دۆستی نزیکی (صدام) بوون وهاوسۆزو ئاودەنگی بوون و لەناوەڕاستی هەشتاکاندا پەیمانی چوار قۆڵیان لەگەل (صدام) دا پێکهێنا کە بریتی بوون لە هەر چوار دەوڵەتی (عیراق و میصر و ئەردەن و یەمەن).....

لە کۆتای ئەم بابەتەدا ئەوەی ماوەتەوە تیشکی بخەینە سەر بریتییە لە: — کێشەی فەلەسطین بەتەنها کێشەی گەلێکی تایبەت و زەویەکی دیاری کراو نیە — هەروەك ڕەگەز پەرستەکان دەیلێن– بەڵکو ئەم مەسەلەیە کێشەی سەرجەم موسڵمانانی دنیاو ئومەتی إسلامیە بەگشتی و دەبێت هەموو کەسێك کە خۆی بە موسڵمان و باوەڕدار دەزانێت هاودەمی و هاو سۆزی بۆ گەلی ستەم لێ کراوی فەلەسطین دەرببڕێت و کێشەو برسێتی و خوێن ڕشتنێکی بەناهەقی جەستەی ئەوان بە ئازاردانی ڕۆحی خۆی بزانێت وە واهەست بکات کە ستەم لەو دەکرێت، پاشان هەڵوێستمان ڕوون و ئاشکرا بێت لەبەرامبەر جولەکەو ئەمریکاو

هاوسەنگەرەکانیاندا، بەوەی بەهەرچی پێمان دەکرێت دژیان بوەستین و ناڕازی بین لەوەی کە دەرهەق بەگەلی فەلەسطین وگەلانی تر ئەنجامی دەدەن و لەبەرامبەریشدا کەمتەرخەمی نەکەین لەهەرچیەك کە بۆمان دەکرێت لەخزمەت گەلی موسڵمانی فەلەسطین دا، گەر دوعایەکی خێریش بێت.

جولەکە بەتەنها دژی گەلی موسڵمانی فەلەسطین نیە بەڵکو فەلەسطینی کردۆتە چەقی دژایەتیەکانی لە ڕووبەڕووبونەوەو دژایەتی کردنی ئومەتی ئیسلامی وداگیرکردنی سەرجەم وڵاتانی ئیسلامی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

کە ئەمە گەورەترین خەونی جولەکەیە، هەربۆیە جولەکە ناتوانن بەسەلامەتی و ئارامی بژین و بەردەوام لە دڵە ڕاوکێ دان و کاتێك ئۆقرە دەگرن و ماندوێتیان دەحەوێتەوە کە تەواوی جیهان مل کەچیان بێت و بەپێی یاساو ڕێساکانی ئەوان بڕۆن بەڕێداو فەرمانەکانی ئەوان جێ بەجێ بکەن !!.

## تیشکێك لەسەر (قدس) و مێژووی دروست بوونی

یەکێکی تر لەو باسە زۆر گرنگانەی کە پەیوەندی ڕاستەخۆی بەناوەڕۆکی ئەم کتێبەو کێشەی فەلەسطینەوە هەیە بریتیە لە (قودس) ی پیرۆزو مێژووی دروست بوونی.

مێژووی (قودس) دەگەڕێتەوە بۆ (٥) هەزار ساڵ لەمەوبەر و بەم پێیەش بە یەکێك لە هەرە شارە کۆنەکانی دنیا ناودەبرێت.

شاری (قدس) (٣٠٠٠) هەزار ساڵ پێش لەدایك بوونی عیسا- واتە پێش میلاد لەلایەن کەنعانیە عەرەبەکانوە دروست کرا، کە ئەوکات دانیشتووی فەلەسطین بوون.

(٣٠٠٠) هەزار ساڵ پێش زاین کەنعانیەکان کۆچیان بەرەو فەلەسطین بەڕێ کەوت و شاری (قدس) یان دروست کردووناویان نا بە (ئورسالیم) ئەویش بەواتای شاری ئاشتی (مدینة السلام) یان شاری خواوەند سالیم، بەزمانی عبری جولەکەکانیش پێ ی دەڵێن (یروشلیم) کە بەمانای (خانوی پیرۆز دێت) (بیت

المقدس)، لەتەوراتدا نزیکەی (٦٨٠) جار ناوی (قدس) هاتووە، لەسەردەمی یونانیەکاندا ناونرابە (إلیاء) کەئەویش بەمانای (خانوی خوا) (بیت الله) دەهات.

گەورەترین خزمەت کەکەنعانیەکان ئەنجامیان دا لەبەرامبەر (قدس) دا، بریتی بوو لەلێدانی ڕێرەوێکی (ئاو) بۆ ئەو مەبەستەی کە بەئاسانی ئاو بگاتە ناو شاری (قدس) و لە کێشەی بێ ئاوی ڕزگاریان بێت.

کۆن ترین هۆزو کۆمەڵ ی دانیشتووی (قدس) بریتی بوون لە هۆزێکی کەنعانی بەناوی (یەبوسیەکان) (الیبوسیین) لەنێوان ساڵەکانی (٢٥٠٠) ی پێش زاین، ناوی ئەم هۆزە لەتەوراتدا هاتووەو، واباسیان کراوە کە یەبوسیەکان نەوەی (حامی کوڕی سامی کوڕی نوح) بوون (علیهم السلام)[1] شاری قودس بەپێ ی مێژووی کۆن و سەردەمی فەرمان ڕەوا و دەسەڵات دارانی، سەردەمی زۆری بەخۆیەوە دیوەو دەیان فەرمان ڕەواو دەسەڵات داری باش و خراپ تیایدا بونەتە فەرمانڕەواو جڵەوی حوکمیان تێدا گرتۆتە دەست، کە ئەمانە بوون: –

**١– سەردەمی فیرعەون، لەنێوان سەدەکانی (١٦بۆ ١٤) ی پێش زاین.**

شاری قودس بەچۆکدا هات لەبەردەم هێزو دەسەڵاتی میصر بەفیرعەونیەکاندا لەسەرەتای سەدەی (١٦) ی پێش زایندا.

لەسەردەمی ئەخناتوونی چوارەمی فیرعەونی میصردا (قدس) دووجاری هێرشی دەشتەکیەکان بوو کە بە (الخابیرو) ناسراو بوون و دەسەڵاتداری ئەو دەمەی (میصر) (أخناتون) توانای سەرکەوتنی نەبوو بەسەریاندا لەئەنجامدا شاری (قدس) کەوتە دەستیان و داگیریان کرد.

قودس لەژێر دەسەڵاتی ئەم هۆزەدا مایەوە تا سەردەمی فەرمان ڕەوا (سیتی) کەیەکێك بوو لەدەسەڵاتدارە میصریەکان و لەنێوان ساڵەکانی (١٣١٧ بۆ ١٣٠) ی پێش زاین سەرکەوتەوە بەسەریانداو شاری قودسی گێڕایەوە ژێر دەسەڵاتی میصر.

---

[1]- هەرچەند زۆرێك لە توێژەرەوان باوەڕیان بەم نەسەبە نیە و بەیەکێك لە هەڵبەستراوەکانی نێو تەوراتی دەزانن.

**٢- سەردەمی جولەکە لە دەسەلاَت داریَتی شاری قودس لەنیَوان ساڵەکانی ((٩٧٧ بۆ ٥٨٦) ) ی پیَش زاین.**

جولەکەکان لە (قدس) دا توانیان (٧٣) ساڵ دریَژە بەدەسەلاَتیان بدەن و فەرمان ڕەوابن، دوا بەدوای ئەم فەرمان ڕەواییە پیَغەمبەر (داود) سەرکەوت بەسەر جولەکاندا لەنیَوان ساڵەکانی (٩٧٧ بۆ ١٠٠٠) ی پیَش زاین و ئەم شارەی ناوبەناو شاری داود (مدینە داود) و نزیکەی (٤٠) ساڵ حوکمی تیَدا کرد.

پاشان دوای مردنی خۆی (سلیَمان) پیَغەمبەری کوڕی لەجیَ ی باوکی دانیشتەوەو نزیکەی (٣٣) ساڵ فەرمان ڕەوایی کرد، دوای مردنی (سلیمان) (قدس) ناونرا بە ((أورشلیم) ).

**٣- سەردەمی بابلی یەکان لە فەرمان ڕەوای شاری قودس لەنیَوان ساڵەکانی (٥٨٦ بۆ ٥٣٧) ی پیَش زاین.**

سەرکردەی بابلیەکان (نەبوخز نصر) شاری قودسی لەدەستی جولەکەکان سەندو کوشتاریَکی باشی لیَ کردن و ئەوەشی مایەوە بەدیل گرتنی لە ساڵی (٥٨٦) ی پیَش زاین، جولەکە ئەم هیَرشەی (نەبو خزنصر) بەگەورەترین هیَرش وەسف دەکەن لە میَژووی خۆیاندا کە دوو چاریان هاتووە.

**٤- سەردەمی فارسەکان لە فەرمان ڕەوایی قودسدا لە نیَوان ساڵەکانی (٥٣٧ بۆ ٣٣٣) ی پیَش زاین.**

پادشای ئەو سەردەمەی فارسەکان ناوی (قورش) بوو، لە ساڵی (٥٣٨) ی پیَش زایندا بریاری ئەوەی دەرکرد، کەڕیَگە بەگەڕانەوەی جولەکە دەست بەسەرەکانی بابل دەدات کە بگەڕیَنەوە (قودس).

**٥- سەردەمی یۆنانیەکان لە نیَوان ساڵەکانی (٣٣٣ بۆ ٦٣) ی پیَش زاین.**

ئەسکەندەری گەورە لە ساڵی (٣٣٣) ی پیَش زایندا دەستی گرت بەسەر فەلەسطین و قودسدا دوای مردنی هاوڕیَ و خۆشەویست و دۆستانی ئەسکەندەر بەردەوامیان دا بە، بەڕیَوە بردنی فەلەسطین.

**٦- قودس لە ژێر دەستەڵاتی ڕۆمەکاندا، لەنێوان ساڵەکانی (٦٣) ی پێش زاین بۆ (٦٣٦)ی زاینی.**

فەرماندەی سوپای ڕۆمانی بەناوی (بومبیجی) (Pompeji) لەساڵی (٦٣) ی پێش زایندا جڵەوی فەرمان ڕەوایی گرتە دەست لە قودسدا، قودس لەو سەردەمەدا سەر بە أمبراطوری ڕۆما بوو، دەستەڵاتی ڕوما لە (قودس) دا مایەوە تا ساڵی (٦٣٦) ی زاینی.

لەنێوان ساڵەکانی (٦٦ تا ٧٠) ی زاینی جولەکەکانی قودس دەستیان دایە کاری چەوت و سەرپێچی ولادان لەبەرامبەر فەرمان ڕەوای ڕۆمەکانداو لەبەرامبەردا دەستەڵاتدارانی ڕۆم بە ئاگرو ئاسن وەڵامی ئەم سەرپێچیەیان دایەوەو شاری قودسیان سوتاند و زۆرێك لە جولەکەکانیان بەدیل گرت.

دوا بەدوای ئەم ڕوداوە شاری قودس گەڕایەوە بۆ حاڵەتی تایبەتی خۆی.

بەڵام جولەکەکان کۆڵیان نەداو لەساڵی (١١٥) ی زاینیدا دەستیان کردەوە بەکاری ئاژاوە گێڕی و پشت هەڵکردن لەفەرمانی ڕۆمەکان و لەساڵی (١٣٢) ی زاینیدا توانیان دەست بگرنەوە بەسەر قودس داو لەدەستی ڕۆمەکانی بسەننەوە، بەڵام سوپای ڕۆم بۆ جاری دووەم ئاگریان بەردایەوە شاری قودس و سەرجەم جولەکە نشتە جیّ کانیان تێدا دەرکردوو تەنها گاورەکانی تێدا مایەوە و پاشان فەرمانیان کرد بە گۆڕینی ناوی (قودس) بە (إیلیاء) مەرجی ئەوەیان دانا لەسەر ئەم شارە کە دەبێت جولەکەی تێدا نیشتە جیّ نەبێت.

- **کەنیسەی قیامەت :**

إمبراطوری ڕۆمانی شاری (قسطنطین) کەپایتەختی دەوڵەتی ڕۆما بوو، گواستیەوە لە ڕۆماوە بۆ (بیزنطین) و ئەو کرایە پایتەخت، پاشان ئەوە ڕاگەیەندرا کە دینی مەسیحی دینی ڕەسمی دەوڵەت دەبێت، ئەم گۆڕان کاریە بەنیسبەت مەسیحیەکانەوە خاڵێکی وەرچەرخانی گەورە بوو لە قودسدا کە بنیادی کەنیسەیەك بدەن لەساڵی (٣٢٦) ی زاینی بەناوی کەنیسەی قیامە.

- **گەڕانەوەی فارسەکان:**

لەنێوان ساڵەکانی (٦١٤ بۆ ٦٢٨) فارسەکان توانیان دەست بگرنەوە بەسەر شاری قودسدا و لەدەستی ڕۆمەکانی بسەنن، بەڵام دواتر ڕۆمەکان هێرشیان کردەوە سەر سوپای فارس و دەستیان گرتەوە بەسەر قودسداو تیایدا جێگیر بوون تا سەردەمی فەتحی إسلامی لەسەردەمی عمری کوڕی خطاب ساڵی (٦٣٦) ی زاینی.

- **ڕوداوی ئیسراو میعراج:**

لەساڵی (٦٢١) ی زاینیدا شاری قودس گەورەترین شەرەفی پێدراو بەرزترین پیرۆزی بەخۆیەوە بینی، کەبەدرێژایی هەزاران ساڵی تەمەنی میوانی وەهای نەبینیوە بەخۆیەوە، ئەویش شەوڕەوی کردنی (پێغەمبەری إسلام – محمد–) ﷺ بوو لەمەککەوە بۆ (قودس) ی پیرۆز و پاشان بۆ تەواوی ئاسمانەکان.

## سەردەمی ئیسلامی لەمێژووی قودسدا لەنێوان ساڵەکانی (٦٣٦ تا ١٠٧٢) ی زاینی

لەساڵی (٦٣٦) ی زاینی، خەلیفەی دووەمی إسلامی (عمری کوڕی خەطاب) سوپای ئیسلامی بەفەرماندەیی (ئەبوعبیدە و عامری کوڕی جەراح) ناردە ڕزگارکردنی فەلەسطین و قودس، پاشان قودس ڕزگارکراو ناوی ئەو شارە لە (إیلیاء)ەوە کرایەوە (قدس) و پاشان پەیمان نامەیەك نوسرا بەناوی (الوثیقة العمریة) واتە– پەیمان نامەی عمرو تیایدا هاتبووکە نابێت جولەکە لە فەلەسطین دا جێگیرببن.

لەو سەردەمەوە (قودس) بەتایبەتی و فەلەسطین بەگشتی سیمایەکی إسلامیانەی وەرگرت و دەستەڵاتی ئەمەویەکان و پاشان عەباسیەکان بایەخی تایبەتیان دەدایە ئەم شارە.

(قودس) لەم ماوەیەدا پێشکەوتنی شارستانی و بیناسازی و زانستی زۆری بەخۆیەوە بینی، کەگەورەترین جێ دەستی إسلامی لەو ساتەدا بریتی بو لە دروست

کردنی مزگەوتی((قبة الصخرة) ) لەسەر دەستی (عبد الملك ی کوڕی مروان) لەنێوان ساڵەکانی (٦٨٢ بۆ ٦٩١) ی زاینی.

پاشان نۆژەنکردنەوەی بینای مزگەوتی (أقصا) لەساڵی (٧٠٩) ی زاینی، دواترو لەساڵی (١٠٧١) ی زاینیدا قودس کەوتە ژێر دەستی سەلجوقیەکانەوە، کەتورك بوون.

- **قودس لەسەردەمی خاچ پەرستاندا:**

دوای تێ پەڕبونی نزیکەی (٥) سەدە بەسەر دەستەڵات و فەرمان ڕەوایی ئیسلامیدا لە قودس، هێزی خاچ پەرستەکان لەساڵی (١٠٩٩) ی زاینی توانیان دەست بگرنەوە بەسەر خاکی فەلەسطین و قودسدا وبیخەنەوە ژێر ڕکێفی خۆیان، ئەویش بەهۆکاری ئەو گرژی و دژایەتیەی نێوان سەلجوقیەکان و دەوڵەتی فاطمیە شیعەکان.

گاورە خاچ پەرستەکان لەگەڵ چونیان بۆ ناو خاکی فەلەسطین و قودس (٧٠) هەزار موسڵمانیان شەهیدکردوو پیرۆزی موسڵمانانیان ژێر پێ خست.

- **سەردەمی ئیسلامی بۆ جاری دووەم لەمێژووی قودسدا ساڵی (١١٨٧) زاینیدا:**

دوای جەنگی (حطین) و لەساڵی (١١٨٧) دا فەرماندەی ئازاو بەجەرگی إسلامی (صلاح الدین ی ئەیوبی) دوای ڕەنج و ماندوبوون و شەونوێژێکی زۆر توانی بەیارمەتی خوای گەورە سەربکەوێت بەسەر خاچ پەرستەگاورەکانداو سەریان پێ شۆڕبکات و قودسیان لێ پاك بکاتەوە.

- **خاچ پەرستان بۆ جارێکی تر:**

دوای مردنی (صلاح الدین ی ئەیوبی) خاچ پەرستان سەرکەوتووبوون لەوەی بۆ جارێکی تر دەستەڵات بگرنەوە دەست لە قودس و داگیری بکەن و بۆ ماوەی (١١) ساڵ تیایدا جێگیرببن تا ئەو کاتەی کەپادشای خوانراس (نجم الدین أیوب) لەساڵی (١٢٤٤) دا لەدەستی سەندنەوە و کۆتایی بە دەسەڵاتیان هێنا.

- **سەردەمی مەمالیك لە مێژووی قودسدا:**

(قودس) دووچاری هێرشی مەغۆلەكان بوو لەنێوان ساڵەكانی (١٢٤٣ بۆ ١٢٤٤) بەڵام هێزی مەمالیكەكان توانیان بەسەركردایەتی (سیف الدین قطز) و (ظاهر بیربس) زاڵ بن بەسەر مەغۆلەكاندا لە شەڕی (عین جالوت) ساڵی(١٢٥٩)، پاشان فەلەسطین و قدس كەوتنەوە دەستی مەمالیكەكان، كە ئەوكات فەرمان ڕەوایی میصر و شام یان دەكرد، لەدوای دەوڵەتی ئەیوبییەوە تا ساڵی (١٥١٧) ی زاینی.

- **سەردەمی عوسمانیەكان:**

سەربازانی سوپای عوسمانی بە ڕابەرایەتی سلطان سەلیمی یەكەم و دوای جەنگی (حرج دایف) لەنێوان ساڵەكانی (١٦١٥ – ١٦١٧) زانینی توانیان بچنەوە ناو خاكی پیرۆزی فەلەسطین و (قدس) بكەنەوە بە پایتەختێ سەر بە دەوڵەتی عثمانی، فەلەسطین و قودس لەژێر دەستەڵاتی عثمانیدا مانەوە تا سەردەمی جەنگی یەكەمی جیهانی، لەو جەنگەدا توركە عثمانیەكان شكستیان هێناو لەفەلەسطین چونە دەرەوە.

- **داگیركاری بەریطانی لەفەلەسطین لەنێوان ساڵەكانی (١٩١٧ بۆ ١٩٤٨) زاینی.**

لەسەردەستی سەربازانی بەریطانیاو لەبەرواری ٩: ١٢: ١٩١٧ قودس چووەوە ژێر دەستی بەریطانیا، پاشان لەلایەن كۆمەڵەی وڵاتانەوە (عصبت الامم) مافی ئەوەدرا بە بەریطانیان كە (فەلەسطین) بخاتە ژێر دەستەڵات و ڕكێفی خۆیەوە و (قدس) یش ببێتە پایتەختی دەوڵەتی فەلەسطین، لەنێوان ساڵەكانی (١٩٢٠ بۆ ١٩٤٨) دا فەلەسطین گۆڕانكاری زۆربەی بەخۆیەوە بینی، كە دیارترینیان بریتی بوو لە كۆچ كردنی ڕێژەیەكی زۆر و بەرچاوی سەرجەم جولەكەكانی جیهان بۆ فەلەسطین و قودس، بەتایبەت دوای بەڵێنی (بەلفۆر) لەلایەن دەوڵەتی بەریطانیاوە بە جولەكە لە ساڵی (١٩١٧) دا.

- **تەواو بوونی دەستەڵاتی بەریطانیا لە فەلەسطین و هەڵگرتنی (إنتداب)**

لە ساڵی (١٩٤٨) دا دەوڵەتی بەریطانیا ئەوەی ڕاگەیان کە کۆتای بەدەستەڵاتی هاتووە لە فەلەسطین داو سەرجەمی هێزەسەربازیەکانی دەکێشێتەوە، بێ گومان ئەمە ڕێکەوتنێکی نهێنی نێوان بەریطانیا و جولەکە بوو و هەر لەساڵەکانی دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانیەوە نەخشەی بۆ کێشرا بوو.

بەڵێ بەکۆچ کردنی هێزەکانی بەریطانیا لە خاکی فەلەسطین بۆشاییەکی سەربازی و سیاسی لەو وڵاتەدا دروست بوو، هەر بۆیە جولەکە بەپێ ی نەخشە سازی خۆیان لەگەڵ بەریطانیا دا ئەم فرسەتەیان بەهەند وەرگرت و خێرا و دەست بەجێ لە (٣: دیسمبەری کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨) داو لەلایەن سەرەك وەزیرانی إسرائیل ی ئەو سەردەمە بەناوی (دیفید بن غوریون) دەوڵەتی إسرائیل ڕاگەیەندرا و (قودس) یش کرایە پایتەختی دەوڵەتی إسرائیل و لەو دەمەوە تا ئێستا (قدس) بۆتە بەندو دیل بەدەستی جولەکەی ناپاکەوە.

- **سوتاندنی جولەکەکان بە فڕنی (غاز) لەلایەن نازیە ئەڵمانیەکان لەجەنگی دووەمی جیهانی و بەدەستی (هتلر) لەنێوان ڕاستی و هەڵبەستراودا ؟!!**

یەکێکی تر لەو مەسەلە هەستیارو گوماناویانەی کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە مێژووی ڕووداوەکانی ژیانی گەلی جولەکەوە هەیە، مەسەلەی سوتاندنیانە بەفڕنی غاز لەلایەن ئەڵمانیەکان و بە بڕیاری (هتلر) لەجەنگی دووەمی جیاهانیدا، جولەکە ئەم ڕووداوەیان ناونا بە (هولوکوست) (المحرقە) واتە سوتاندنی تەواو یان لەناوبردنی تەواو، (هولوکوست) زاراوەیەکە جولەکە ئەم ڕووداوەیان پێ ناونا، کە بە ماناو تێگەیشتنی ئەوان بریتی یە لە (سوتاندنی قوربانیەك بە تەواوی).

جولەکەکان دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەوەیان ڕاگەیاند کە بەفەرمانی (هتلر) و لەسەر دەستی نازیەکان کراون بە (صابون) و لەفڕنی غازدا سوتێنراون و ژمارەیی قوربانیەکان یان بریتی بوون (٦) ملیۆن کەس !! هەروەك سەرۆکی

ئەمریکا (ئۆباما) جەختی لەسەر ئەمە کردەوەو وتی: ((إن المحرقة اليهودية على يد هتلرمات فيها ستة ملايين يهودي و أن من يشكك في هذا الرقم جاهل ومعاد للسامية وداعية لكراهية اليهود)).

واتە: لەسەردەستی هتلر (٦) ملیۆن جولەکە سوتێنران وە هەرکەس گومان ی لەم ژمارەیەدا هەبێت، ئەوە نەفامەو دوژمنی ڕەگەزی سامیەو بانگەشەی ڕق لێ بوونەوەی جولەکە دەکات.

بەڵێ لەلایەن جولەکە وئەمریکاوە مەسەلەی (هولەکوست) گەورەکراو لەتەواوی جیهاندا ئەم مەسەلەیە بڵاوکرایەوەو بڕوا و قەناعەتی زۆربەی زۆری خەڵکیان پێ بەدەست هێنا، بەڵام زۆرێک لەتوێژەوەران و ئەوانەی بەشوێن ڕاستی ئەم مەسەلەیەدا دەڕۆیشتن لەئەنجامدا گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە (هولەکوست)، مەسەلەیەکی هەڵبەستراوەو لەدنیای واقعدا بوونی نەبووە.

هەرچەندە ئەوانەی کە لەسەر ئەم بڕوایە بوون لەلایەن جولەکەوە دووچاری هەڕەشەو و کوشتن و دادگایی بوون، بەڵام ئەوان هەر سوور بوون لەسەر ئاشکراکردنی درۆو هەڵبەستراوەکانی جولەکە لەمەسەلەی (هولوکوست) دا.

یەکێك لەو زانا لێ بڕاوانەی کە بەشوێن ڕاستی ئەم مەسەلەدا، دەیان ساڵ خەریکی دراسە و لێ کۆڵینەوە بوو (روبیر فورسون) بوو.

بەڵێ ئەم زانایە خەڵکی فەڕەنسایەو لەساڵی (١٩٢٩) لە وڵاتی فەرەنسا لەدایك بووە، مامۆستایە لەقۆناغی ناوەندی دا و هەریەك لەزمانەکانی لاتینی و ئیغریقی دەزانێت (روبیر فورسون) لەلایەن ڕۆژنامەیەکی جەزائیریەوە گفتوگۆیەکی لەگەڵدا ساز دەکرێت و پرسیاری ئەوەی لێ دەکەن کە سەرەتای دەست بەکاربوونی چۆن بوولەگەڵ گەڕان و توێژینەوەی مەسەلەی (هولوکوست) دا ؟!

ئەویش لەوەڵامدا ئەڵێت: —

سەرەتا لە ساڵی (١٩٧٤) دا دەستم کرد بە لێ کۆڵینەوە لە حەقیقەتی (هولوکوست) دوای ئەوە هەندێ گومانم لەسەر ئەم مەسەلەیە بۆ دروست بوو، پاشان کتێبێکی (بول راسنیە) م دەست کەوت بەناوی (درۆکانی هولوکوست)

راگادنی هولوکوست) دەڵێت: ئەم نوسەرە لەسەرەتادا دژی ئەڵمانیا بوو، چوونکە باوەڕی وەهابوو کە ئەم کارەیان لەبەرامبەر جولەکەدا ئەنجام داوە، بەڵام دوای گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا، سەرجەمی ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی خوێندەوە کە سەبارەت بە (هولوکوست) نوسرابوو، هەر بۆیە ئەوەی ڕاگەیاند کە لەو کتێبانەدا درۆو هەڵبەستراوی زۆری تێدایە، بۆ نموونە: یەکێك لەو درۆیانە بریتی یە لەباسکردنی ژووری غاز بۆ سوتاندنی جولەکەکان !! پاشان ئەم نوسەرە دەڵێت: گەر ئەمە ڕاست بوایە من دەم زانی !!!

دواتر پرسیارێکی تر لە(روبێر فورسون) دەکەن و پێ ی دەڵێن:

چۆن مەسەلەی هولوکوست لە درۆوە گۆڕدرا بۆ حەقیقەت و سزادانی ئەوانەیان ڕاگەیاند کە بەدرۆ و هەڵبەستراوی دەزانن ؟!!

لەوەڵامدا وتی: من بەو پەڕی بەرپرسیارێتیمەوە لەبەردەم سەرجەم ڕێکخراوە جولەکەکان جا لە فەرەنسا بن یان لە ئەمریکا یان لەهەر جێگەیەك بن، ئەم ڕاستیە دەڵێم و خاوەنی قسەی خۆشمم:

مەسەلەی (هولوکوست) گەورەترین چەکی دەستی جولەکە بوو لەو کاتەدا کەبەکاریان هێنا لەدروست کردن و بنیات نانی دەوڵەتی (إسرائیل) لە ساڵی (١٩٤٧ – ١٩٤٨) چونکە لەو سەردەمەدا سەرجەمی زلهێز و دەستەڵاتدارەکان سەرەتای لەناوچوون و کەوتنیان بوو، پاشان سەرجەم ڕێکخراوە جولەکەکان ئەوەیان دا بەگوێی دنیادا کە قوربانیەکانیان لەجەنگی دووەمی جیهانیدا ناسروشتی بووە، کەواتە دەبێت دەوڵەتێك یان هەبێت تا جارێکی تر و لەلایەن هیچ هێز و دەستەڵاتێکەوە ئەم ڕوداوەیان بەسەردا دووبارە نەکرێتەوە !!!

جولەکە توانیان سۆزی دانیشتوانی جیهان بەلای خۆیاندا کەمەنکێش بکەن و مەسەلەی (هولوکوست) بکەنە گەورەترین بیانو لەدامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل دا.

**دوا بەدوای ئەمانە پرسیاری ئەوەی لیّ دەکەن کە:**

گەڕان و توێژینەوەکانی تۆ بەوە کۆتایی هات کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە مەسەلەی سوتاندنی جولەکەکان بەفڕنی (غان) (هولوکوست) تەنها درۆیەکە و هیچی تر ئەمە چۆن دەبێت ؟!!

لە وەلامدا دەڵێت: من سەرسامتان دەکەم بەوەی هەواڵی ئەوەتان بدەمێ کە ویستومەو داوام کردووە لەکەسانی تایبەت بەم مەسەلەیەوە کە ژووری غازەکانم پێ نیشان بدەن !! ئەو هۆکارانەم پێ نیشان بدەن کە جولەکەی پێ سوتێنراون، بێگومان ئەمە داواکاریەکی زۆر سادەیە تا قەناعەت بکەم و بەڕاستی بزانم !!

پاشان ڕۆژنامە جەزائیریەکە پرسیاری ئەوە دەکات و دەڵێت:

ئایا داواکاریەکانت لە فەڕەنسا بوون یان لە ئەڵمانیا، بۆ دیتنی ژووری غاز؟!!

لەوەلامدا دەڵێت: -

لە فەڕەنسا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد - جولەکەکان - کە یەك ژووری غازی لێ یە، لەناوچەی (لالزاس) منیش سەفەرم کرد بۆ (پاریس) کە لەوێ ناوەندی پەیمان نامەی جولەکەی لێ بوو، داوای ئەوەم لێ کردن کە تەنها یەك وێنەم پێ نیشان بدەن لەسەر ژووری غاز ؟!! فەرمان بەری ئەو جێگەیە لەوەلامی مندا وتی: دەیان کتێب و بەڵگەنامە و وێنەمان لەسەر ئەم مەسەلەیە هەیە !! منیش پێم وتن تەنها یەك وێنەم نیشان بدەن !! پاشان کارمەندەکەی بانگ کردو ئەوەی پێ وت کە ئەم کەسە دەگەڕێت بەشوێن وێنەی قوربانیەکانی ڕودوای (هولوکوست) دا.

پاشان بۆ ماوەی نزیکی یەك سەعات ئەو دوو کەسە سەیری یەکتریان دەکرد و، سەرەنجام سێ وێنەیان بۆهێنام، دوانیان وێنەی لاشەی چەند مرۆڤێك بوون و نەم دەزانی ئەوانە کوژراون یان خۆیان مردون چونکە هیچ ئاسەوارێکی سوتانیان بەغاز بەسەرەوە دیار نەبوو، وێنەکەی تریشیان وێنەی سەربازێکی ئەمریکی بوو لەبەردەم دوکانێکدا وەستابوو کە لەسەر دەرگای دوکانەکە نوسرابوو، کاتەکانی کردنەوەی دوکان و داخستنی !!! بێ گومان هیچ کام لەو وێنانە پەیوەندی

بەوەوە نەبوو کەمن داوام کردبوو !! سەرەنجام بەدەستی بەتاڵ هاتمە دەرەوە و هیچ بەڵگەیەکم دەست نەکەوت.

کاتێك جولەکە بەم هەوڵ و گەڕانەی منیان زانی هێرشیان بۆ هێنام و دوچاری ناڕەحەتی زۆریان کردم....

بەڵێ ئەمە شاهیدی توێژەرەوەیەکی فەرەنسیە کە هەوڵی تەواوی داوە بگاتە ڕاستی ئەم مەسەلەیە بەڵام سەرەنجام هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و دروستی دەست نەکەوت و ئەویش باوەڕی تەواوو بێ گومانی بۆ دروست بوو لەسەر درۆو هەڵبەستراوەکانی ڕووداوی (هولوکوست).

حەز دەکەم لە کۆتایی ئەم باسەدا چەند خاڵێکی گرنگ لەسەر مەسەلەی (هولوکوست) بنوسم تا زیاتر لە درۆو هەڵبەستراوەکانی جولەکە تێ بگەین دەربارەی ئەم مەسەلەیە.

١. بەپێ ی سەرژمێریە ڕەسمیەکانی ساڵی (١٩٣٩) ژمارەی جولەکەکانی تەواوی جیهان بریتی بوو لە (٧) ملیۆن کەس، بەڵام دوای تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی و ڕووداوی هولوکوست !! هەروەك خۆیان دەڵێن، ژمارەی جولەکەکان بەرز بویەوە بۆ (١٨) ملیۆن کەس!! جا پرسیارەکە لێرەوە دروست دەبێت، گەر بانگەشەی جولەکە ڕاست بێت لەمەسەلەی هولوکوست دا ئەوە دەبوو دوای کۆتای جەنگ تەنها (١) ملیۆن) کەسیان بمایاتەوە، چونکە هەر وەك خۆیان دەڵێن (٦) ملیۆنیان لێ سوتێنراوە بەفڕنی غاز !! ئەی چۆن لە ماوەی کەمتر لە (٩) ساڵ ژمارەی جولەکەکان بەرز بویەوە بۆ (١٨) ملیۆن !!! ؟

٢. دکتۆر (فرانسیس بیر) بەڕێوبەری مۆزەخانەی (أوشفێن) دەڵێت: ئەوەی کە جولەکە بە ژووری (غاز) ناوی دەبەن و ئەو کاتەش بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەتیایدا سوتێنراون، تەنها بانگەشەیەکی یەکێتی سۆڤیەت بوو دەرحەق بە ئەڵمانیای نازی ئەنجامی دا بۆ ئەوەی خەڵکی سەرقاڵ بکات بە تاوانەکانی ئەڵمانیای نازی و خراپە و تاوانەکانی یەکێتی سۆڤیەتی ئەوکاتەش پەردەپۆشی بکات لەبەرچاوی خەڵکیدا.

٣. لەمانەش زیاتر (خاچی سوری نێو دەوڵەتی) لەو کاتەدا ئەوەی ئاشکرا کرد کە زیاتر لە (٣٠٠) هەزار کەس بە جیاوازی ڕەگەزو زمان وکەلتوریانەوە لەسەربازگەکانی ئەڵمانیادا مردوون، جا بە هۆکاری جیاوازەوە، بەشێکیان بە هۆکاری تەمەن زۆریان و زۆربەی هەرە زۆریشیان هۆکاری نەخۆشی و نەبوونی داوو دەرمانی پێویست لەسەردەمی جەنگی ئەڵمانیا لەگەڵ وڵاتانی تردا.

٤. ژمارەی تەواویی سەرجەم جولەکە نیشتەجێکانی ئەورووپای ئەو سەردەمە کە لەژێر دەستەڵاتی نازیەکاندابوون بریتی بوو لە (٤) ملیون کەس، بەڵام سەیر لەوەدا بوو کە لەدوای تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی جولەکە داوای مافی (٨) ملیۆن کەسی لە ئەڵمانیا دەکرد بە بیانوی ئەوەی کە ئەم (٨) ملیۆنە لە ڕزگار بوانی جەنگن و بەر لافاوی سوتاندن (هولوکوست) نەکەوتوون ! ! !

٥. جولەکە بە گەورە کردن و برەودان بە مەسەلەی (هولوکوست) گەورەترین ئامانجیان پێکا، ئەویش لەجوڵاندنی سۆزی خەڵکی بەلای خۆیاندا، تا بەگەلێکی ستەم لێکراوو ماف خوراو و خاك داگیرکراو بناسرێن، ئەمیش لەپێناوی پەردەپۆش کردنی ئەو دەریا تاوانانەی کە خۆیان بە درێژایی مێژوو بە ئێستەشەوە ئەنجامی دەدەن.

٦. جولەکە لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا ئەم مەسەلەیان ووروژاندو لەسنوری خۆی زۆر زیاتر گەورەیان کرد گەرنا، لەجەنگی دووەمی جیهانیدا تەنها ئەمریکا بە بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆم هەزاران هەزار کەسی لەناوبرد لە (هیرۆشیما و ناکازاکی) بەڵام باس لەوە ناکرێت کە ڕاستەو ڕووی داو تەنانەت بە دیکۆمێنتی ڤیدۆیش تا ئێستا هەیە و گومانی تێدا نیە !! بەڵام جولەکە مەسەلەیەکی هەڵبەستراوو درۆینەی وەك (هولوکوست) دروست دەکەن و سەردەم لەدوای سەردەم خەڵکی پێ لەخشتە دەبەن و چەواشەیان دەکەن بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی ڕاست و دروستیان هەبێت لەسەری ! ! !

٧. گەر کوشتنی بە کۆمەڵ و بەزەی نەنواندن لەبەرامبەر گیان و ژیانی خەڵکی بێ دفاع و ژن و منداڵ و پیاوی پیر و تەواوی مرۆڤەکان تاوان و یاساغ بێت کە –

هولوکوست – ی جولەکە ئەم مانایە دەگەیەنێت – ئەوە جولەکە لە پێش هەموو کەسەوە دەبێت بدرێت بەدادگا و تۆڵەی تاوانەکانیان لێ بکرێتەوە، چونکە ئەوان دامێنەری پیاو کوشتنو پێغەمبەر کوشتن و وڵات داگیرکردن و ممارەسەکردنی توندڕەوی و بەکارهێنانی فسفۆری قەدەغەکراون، بەدرێژای مێژووی ڕەشیان تا ئێستاش !! ئەوان بەڕاستی (هولوکوستی) موسڵمانان بەگشتی و فەلەسطینیەکان یان بەتایبەت کردووەو لەماوەی (٦٢) ساڵی داگیرکاریان لەخاکی پیرۆزی فەلەسطین دا ڕێگەیەك نەماوە بەکاری نەهێنن لە ڕەشەکوژی و لەناوبردن و خنکاندنی ئەو گەلە بەش خوراوو داگیرکراوەدا.

ئەوان بانگەشەی درۆیینەی سوتاندنی بە کۆمەڵ دەکەن کە بەرامبەریانکراوە، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاستەو خەڵکی فەلەسطین بەدەستی ڕەشی ئەمان دەیان ساڵە دەسوتێنرێ و (هولوکوست) لەبەرامبەریاندا ئەنجام دەدرێت !!

## هۆکاری ڕق بوونی ئێمەی موسڵمان لە جولەکە !!

لە کۆتای ئەم بابەتەدا دەگونجێت تۆی خوێنەری بەڕێز ئەو پرسیارەت لەلا دروست ببێت، کە ئایا بۆ موسڵمانان، ڕقیان لە جولەکەیەو بە دوژمنی خۆیانی دەزانن !!

یان، ئایا قورئان بۆ ئەوەندە باسی جولەکەی کردووە و بەخراپ ناوی بردوون؟!!

ئایا هەموو ئەم باسکردنانە هۆکارێك نین بۆ ڕق لێ بوونەوەی موسڵمانان لە جولەکە ؟!!

لەوەڵامدا دەڵێین: –

((دین ی پاك و بێگەردی ئێمە یەکێك لە دیارترین و بەرزترین سیمای بریتیە لە سۆز و خۆشەویستی و سینەپاکی لەبەرامبەر یەکتر و ڕق خواردنەوەو ئازارنەدانی یەکتر و نەنواندنی بوغزوقین لەبەرامبەر مرۆڤەکانی تردا و ئازادکردن و چاپۆشی نواندن لە هەڵە و کەم و کورپیەکانیان.

بەڵێ ئەمە دیارترین بنەمان لە بنەما باڵاکانی إسلام و دەیان و سەدان ئایەت و فەرموودە باوەڕداران هەڵدەنێن بۆ ئاشتی و بەرجەستەکردنی ئەم ڕەوشتە بەرزانە لەژیانیاندا.

بەپێچەوانەشەوە ئەنجام دەرانی سیفەتە نزمەکانی وەك بوغزو ڕق و لێ نەبووردن و ناخ پیسی و سەرجەم سیفەتە نادروستەکان، بەسەر کەش و لادەر و گوناهبار ناودەبات و سزای سەختی دۆزەخیان لەبەرامبەردا ئامادەکراوە ! !

جا پرسیارەکە لێرەوە دەست پێدەکات: ئایا دینێك کە سەرتاپای یاساو برگەکانی سۆز و بەزەیی و مرۆڤ دۆستی و ئاشتی و خێرو ڕێزو دادپەروەری و سینەپاکی و هەزاران سیفەتی تری بەرزی لەم جۆرەبێت، بۆ لەدەقە پیرۆزەکانی هەردوو سەرچاوە سەرەکیەکەی خۆیدا کە – قورئان وسونەتە – هێندە خراپ باس لە جولەکە دەکات و بەجۆرێك لە جۆرەکان باوەڕداران و موسڵمانان هان دەدات لەسەر شوێن نەکەوتنی جولەکە و گاورەکان و دروست کردنی هەستی ڕق لێ بوونەوە لەئاستیاندا ! ! ! ؟؟

زۆر بە کورتی لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەوە دەڵێم: –

ئێمەی موسڵمانان ی شوێن کەوتەی إسلام لەبەر ئەوە، ڕقمان لە جولەکە نیە کە جولەکەن و شوێن إسلام نەکەوتون و پەیڕەوی لە یاساکانی تەشریعی ئیسلامی ناکەن، بەڵکو ڕق بوونی ئێمە لە جولەکە تەنها لەبەر سیفەتە خراپ و دزێوەکانیانە، کە بەدرێژایی مێژووی دروست بوونیان تا ئێستا ممارەسەیان کردووە و ئەنجامیان داوە.

ئەویش بێ گومان لەباس و بەندەکانی پێشوودا بە درێژی باسمان لێوە کردووە، کە باس کردن لەو سیفەتە دەرونیە دزێوانەیان لێرەدا دووبارەیە.

## هۆكارەكانی ڕق بوونی جولەكە لە ئیسلام و موسڵمانان

ئەم باسەیان پێچەوانەی بابەتی پێش خۆیەتی و لەبەرامبەر ئەوەی كە موسڵمانان ڕقیانە لە سیفەتە دزێو و خراپی جولەكەكان، ئەوانیش ڕق ئەستور و نەیارن لەگەڵ ئیسلام و موسڵماناندا بەدرێژای مێژووی ڕەش وبەئێستەشیانەوە.

بەڵام ڕق بوون و دژایەتی و نەیاری جولەكە لەگەڵ ئیسلام و موسڵماناندا زۆر جیاوازە لەو ڕقەی كە باوەڕداران هەیانە لە جولەكە، موسڵمانان – هەروەك باسمان كرد – تەنها لەبەر ئەوەی كە جولەكە هەڵگری سیفەتە دزێو و خراپەكانن بونەتە جێ ی سەرنج و ڕق لەلای باوەڕداران، نەك لەبەرئەوەی كە جولەكەن و شوێن پەیامێكی تری غەیری إسلام كەوتوون، چونكە قورئانی ئێمە ئازادی تەواوی داوەتە خەڵكی لەهەڵبژاردنی هەر دین و بیروباوەڕێك كە خۆی پەسەند دەكات و باوەڕی پێ یەتی ((لاإكراه في الدين)).

بەڵام ڕق و دژایەتی ئەوان لەگەڵ ئێمەدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆكارێك كە ئەمانەن

١- یەكێك لەسەرەكی ترین هۆكاری ڕق بوون ی جولەكە لە ئیسلام و باوەڕداران لەسەرەتادا بریتی بوو لەوەی كە پەیام و پێغەمبەری كۆتایی دنیا لە ڕەگەزو نەژادی ئەوان نەبوو، پێش هاتن و دەركەوتنی پێغەمبەر جولەكەكان شانازی ئەوەیاندەكرد بەسەر عەرەبەكانداو لەهەمان كاتیشدا هەڕەشەی ئەوەیان لێ دەكردن كە دواین پێغەمبەری ڕەوانە كراوی خوا بۆ سەر زەوی لە خودی جولەكە دەبێت و پاشان زاڵ و سەركەوتودەبن بەسەر نەیارەكانیاندا، بەڵام سەرەنجام ئەوەی جولەكە بانگەشەیان بۆ دەكرد بەتەواوی مانا بەپێچەوانەوە دەرچوو، پێغەمبەر لەخودی ئەوان ڕەوانەنەكرا، بەڵكو دواین پێغەمبەر لەعەرەب بوو، هەر لەو ساتەوە جولەكە بڕیاری دژایەتی و نەیاریان لەگەڵ ئیسلام و باوەڕداراندا ڕاگەیاندو دەیان جار هەوڵی كوشتن و تیرۆركردنی خودی پێغەمبەریان دا، بەڵام خوای گەورە فێڵ و ساختەكاریەكانی پوچەڵ كردنەوەو پێغەمبەری

پاراست لە دەستی چەپەڵ و دزێویان، دژایەتیەکانی جولەکە لەشاری مەدینەو بەتایبەت دوای کۆچی پێغەمبەرو باوەڕداران لەمەکەوە بۆ مەدینە زیاتر چڕ بوونەوەو زێر بەژێر لەگەڵ عەرەبە نەیارو موشریکەکانی مەکەدا پەیمانیان گرێ دا بۆ ئەوەی موسڵمانان لەناوبەرن لەشاری مەدینەدا، بەڵام ئەوان دەستی خیانەت و ئاژاوەگێڕیان بەدەرکەوت، پێغەمبەری ئیسلام دوای هەوڵ و ماندوبوونی زۆری لەپێناو نزیك بوونەوە لە جولەکەکان تا دینی خوایان پێ ڕابگەیەنێت و نەرمی و چاوپۆشی زۆری لەگەڵدا نواندن، بەڵام سەرەنجام بەپێچەوانەی هەموو ئەم کارانەوە ئاراستەیان وەرگرت و هەر خەریکی ناپاکی بوون، هەر بۆیە لە کۆتایی دا پێغەمبەرفەرمانی دا بەدژایەتی کردنیان، کە خۆیان لە سێ تیرەی گەورەی وەك (بەنو نضیر و بەنو قینوقاع و بەنی قریضەدا) نمایش کردبوو، دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر و باوەڕداران لە پەیمانی (حدیبیە) کەلەگەڵ قریشیەکاندا بەستیان، نەیارانی ئیسلام کە کلك گرێ داربوون لەگەڵ قرەیش دا بایەخیان نەما، بەتایبەت جولەکەکان هیچ سەنگ و بەهایەکیان بۆ نەمایەوە، خێرا و دەست بەجێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە گەمارۆدانی (خیبر) کە هەرسێ تیرەکەی تێیدا جێ گیر بووبوون، باوەڕ داران گەمارۆی (خیبر) یان داو جولوکەکانیش هیچ ڕێگەیەك نەما بۆ دەرچوونیان، سەرەنجام مەدینەیان لێ پاك کرایەوەو بۆ دواجارو لەسەردەمی (عمری کوڕی خەطاب) دا تەواوی جەزیرەی عەرەب لە جولەکە و خێڵەکانیان پاك کرایەوە........

٢- یەکێکە تر لە هۆکارەکانی ڕق بوونی جولەکە لە ئیسلام و موسڵمانان بریتیە لەوەی کە جولەکە هەموو کات حەز دەکەن کە هەموو کەس شوێن ئەوان بکەوێت! !نەك شوێنت بکەون !! ئەمە سیفەتێکی زۆر خراپە لە سیفەتە دەرونیەکانی جولەکە بەدرێژایی مێژوو، هەموو کات حەزی ئەوە لەناخیاندا بووە کە خەڵکی شوێن دین و بیروباوەڕو ڕێبازو سیاسەت و سەرجەم ڕێگەکانیان بکەوێت، نەك بە پێچەوانەوە کە ئەمان شوێن کەسانی تر بکەون، هەرلەبەر ئەم هۆکارەیەکە خوای گەورە، گەورەترین نهێنی ناخ و دەرونی جولەکە و گاورەکانمان بۆ ئاشکرا

دەكات بەوەی كە هەرگیز لێت ڕازی نابن و دڵیان ساغ نابێتەوە لەسەر هیچ كەسێك تا ئەو دەمەی كە شوێن دین و بیروباوەڕو ڕێچكەیان نەكەویت، هەروەك قورئان دەفەرمویێت: ﴿ وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ .... ﴾ البقرة: ١٢٠

واتە: هەرگیز جولەكەو گاور لێت ڕازی نابن تا شوێن دین و ئاكاریان نەكەویت.

بەڵێ ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەمەی كە هۆكاری ڕقی جولەكەمان بۆ دیاری دەكات لەبەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان.

جولەكە بەدرێژای مێژوو تەنانەت بە ئێستەشەوە هەوڵیان داوە كە تەواوی مرۆڤەكانی سەر زەوی مل كەچ و سەرشۆڕ بكەن بەو ئومێدەی كە خەڵكی وەك مەڕ و ماڵات شوێنیان بكەون و پرسیاری ئەوە نەكەن كە بۆ كوێیان دەبەن.

ئەمە یەكێكە لە خەونە هەرە گەورەكانی جولەكە و بەتایبەت لە ئێستادا تەواوی هەوڵیان لەم پێناوەدا خستۆتە گەڕ، لەبەرامبەریشدا باش لەوە حاڵی بوون كە ئیسلام ڕێگرە لەبەر دەم گەیشتنیان بەم حەزە، هەربۆیە ڕقیان لە ئیسلام و موسڵمانان كردۆتە ئامانج لەژیانی خۆیاندا.

٣- یەكێكی تر لەهۆكارەكان بریتیە لەوەی كە ئەم گەلە هەڵگری هەزاران سیفەتی گەندەڵ و نەخۆشن و لەگەڵ خوێنیاندا تێكەڵ بووە- هەرلەو هەموو سیفەتەی كە پێشتر باسمان لێوەكرد- گەورەترین هۆكارن بۆ ڕق بونیان لە ئیسلام و موسڵمانان، چونكە ئیسلام ئابڕو پەردەلابەرە لەسەر سەرجەم ئەم سیفەتە نادروستانەیان.

٤- یەكێكی تر لە هۆكارەكان ئەوەیە كە ئەوان خۆیان بەگەلی هەڵبژاردەی خوا (شعب الله المختار) دەزانن و بە پێ ی ئەم بەرزیەش كە بۆ خۆیان بڕیاریان داوە، سەرجەمی خەڵكی بەئاژەڵ و گیاندارە بار هەڵگرەكان تەماشا دەكەن و لە خوار خۆیانەوە بۆیان دەڕوانن !!

باشیش لەوە حاڵی بوون كە ئەم بانگە شەیان لەلای ئیسلام هیچ بایەخو قورساییەكی نیە و ئەو كەسە گەورە و سەردارە كە زیاتر لە خوا دەترسێت.

هەربۆیە لەم حاڵەشدا نەیاری تەواویان لەگەڵ ئیسلامدا هەیە و بەردەوام دژایەتی لەبەرامبەردا دەنوێنن !!!

## دواساتەکانی ژیانی جولەکەو حکومەتی إسرائیل و مژدەیەك بۆ موسڵمانان

لەباسەکانی پێشوودا باسی هەندێ هۆکاری ناو خۆی و دەرەکیمان کرد کە ئاماژەبە لەناو چوون و داڕووخانی دەوڵەتی (إسرائیل) دەکەن لە خاکی فەلەسطین دا، لەدوا ساتەکانی ئەم کتێبەدا حەزدەکەم باس لەو ساتەنە بکەم کە خودی جولەکە خۆشیان لە ناو دەچن و دار و بەرد، دێنە گۆو قسەکردن لە دژیان و هاوار لە موسڵمانان دەکەن کە بجەنگن لەگەڵ جولەکەدا و لە ناویان بەرن !!

بێ گومان پێش باس کردنی ئەم واقعەی کە دێت بەسەر جولەکەدا، دەبێت باس لە حاڵەتێکی تربکەین، کە ئەویش دیادە و نیشانەکانی کۆتایی دنیایە، چونکە ئەم مەسەلەیە پەیوەندیەکی ڕاستەو خۆی بەو سات و کاتانەوە هەیە، ئەویش بەم جۆرە.

((بێ گومان نیشانەو بەڵگەکان لەسەر هاتنی قیامەت و نزیك بوونەوەی کۆتایی هاتنی دنیا بریتین لە کۆمەڵێك خاڵی زۆر و دابەش بوون بەسەر دوو حاڵەتدا، کە ئەوانیش پێیان دەوترێت نیشانە گەورەکان و بچوکەکان، ئەوەی زیاتر مەبەستمانە بریتین لە نیشانە گەورەکان و لە ناویشیاندا دەرکەوتن و پەیدابوونی دەجال، دەرکەوتنی دەجال یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی-و فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ زۆرە لەبارەیەوە- کەلێرەدا بواری باس لێوە کردنیان نیە.

تەنها ئەوەندە نەبێت کە: دەجال لە نەوەی ئادەمە و لە گرۆهی ئادەمیانە و هەڵگری کۆمەڵە سیفەتێکی زۆر خراپە، دەجال پیاوێکی گەنجی سورکارە و چاوی ڕاستی کوێرە و بانگەشەی خوایەتی دەکات و خەڵکێکی زۆر شوێنی دەکەون و لە خشتەیان دەبات، لە نێوان هەردوو چاوی نوسراوە (کافر) و هەموو موسڵمانێکی

خوێندەوار و نەخوێندەوار دەتوانن بیخوێننەوە، یەکێکی تر لە سیفەتەکانی بریتیە لەوەی کە نەزۆکە و مندالّی لیّ دروست نابێت) )[1]

دەنگ و باسی دەجال دەکەویتە ناو هەموو جێگەو شوێنێك و خەڵکێکی زۆر شوێنی درۆ و بانگەشە بەتاڵەکانی دەکەون، یەکێك لەو کۆمەڵەو کەسانەی کە بەڕێژەیەکی زۆر و بەرچاو شوێنی دەکەون و پاڵپشتی لیّ دەکەن بریتین لە جولەکە و ڕێژەیان (٧٠) هەزار کەسە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((يتبع الدجال من يهود أصفهان سبعون ألفاً) ). رواه مسلم

واتە : (٧٠) هەزار جولەکەی ناوچەی (أصفهان) شوێن دەجال دەکەون.

بەڵیّ فیتنەو خراپە یەك لەدوا یەکەکانی دەجال و شوێن کەوتە سەرگەردانەکانی تەواوی سەرزەوی پڕدەکەن و خۆشی و ئارامی تیادا ناهێڵن، تا ئەوکاتەی کە خوای گەورە بۆ مەبەستی ڕزگارکردنی بەندەکانی و پاکردنەوەی زەوی لە خراپەکاران سۆزی خۆی دەنوێنیّ بەرامبەریان و (عیسای کوڕی مەریەم) دەنێرێتە خوارەوە، بەم شێوەیە: –

((عیسای کوڕی مەریەم (علیە سلام) پیاوێکی باڵا مام ناوەندە–واتە نە کورتە باڵایە و نە درێژە – و ڕووخساری هێندە پاك و جوانە هەردەڵیّ ی تازە لە(حەمام) هاتۆتە دەرەوە، لەشاری دیمەشقی وڵاتی سوریاوە و لەکاتی نوێژی بەیانی دا[2].

دێتەوە سەر زەوی بە مەبەستی یارمەتی دان و سەرخستنی موسڵمانان لە دەستی دەجال و شوێن کەوتەکانی، عیسا(علیە سلام) بۆ ئەنجام دانی کۆمەڵەکارێکی زۆر پێویست خوای گەورە ڕەوانەی سەر زەوی دەکاتەوە، کە گرنگ ترین و بەرچاوترینیان بریتی یە لە کوشتنی دەجال و جولەکە شوێن کەوتوەکانی لەلایەن موسڵمانانەوە.

---

١– أشراط الساعة: يوسف بن عبدالله بن يوسف الوابل : ص ٣١٠.

٢– هەمان سەرچاوە : ص (٣٤٠).

لەسەردەمی پێغەمبەر و پاشان خولەفای ڕاشیدین دا، موسڵمانان پەیڕەوی یەکێك لە فەرمودەکانی پێغەمبەریان کرد کە فەرمانی دا بە کوشتن و دەرکردنی (جولەکە و گاورەکان) لە ئیوە دورگەی عەرەب هەروەك فەرمووی: -((لأخرجن اليهود والنصارى من جزيرة العرب حتى لا أدع إلا مسلماً) )[1]

واتە : جولەکە و گاورەکان لە دورگەی عەرەب وە دەرنێن، تاغەیری موسڵمان ی تێدا بانگ نەکرێتو نیشتەجێ نەبێت.

بەڵام ئەم جۆرە جەنگ و کوشتارەی جولەکە لەلایەن موسڵمانە شوێن کەوتەکانی عیسای کوڕی مەریەمە و زۆر جیاوازە لەو سەردەمەی کە جولەکە لەسەردەمی (عمری کوڕی خەطاب) دا، دەرکران و خاکی موسڵمانانیان لێ پاك کرایەوە، چونکە ئەم جۆرە کوشتارە یەکێکە لەبەڵگە و نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و دارو بەردیش هاوکارن لەگەڵ سوپای موسڵمانان بۆ لەناو بردنی جولەکە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {لاتقوم الساعه حتى يقاتل المسلمون اليهود، فيقتلهم المسلمون، حتى يختبىءاليهودى من ورا ءالحجر و الشجر، فيقول الحجر أو الشجر: يا مسلم يا عبدالله ! هذا يهودي خلفي، فتعال، فاقتله، إلا الغرقد، فانه من شجر اليهود}[2]

واتە: قیامەت بەرپا نابێت تا موسڵمانان نەجەنگن لەگەڵ جولەکەدا، پاشان موسڵمانان دەست دەکەن بە کوشتنی جولەکەو جەنگاندن لەگەڵ یاندا تا ئەو ئەندازەی کە جولەکە خۆیان حەشاردەدەن لەپشت بەردوودارەوە، ئەوجا (بەرد) یان (دار) دێنە قسەکردن و دەڵێن:

ئەی موسڵمان، ئەی بەندەی خوا ئەمە جولەکەیەکەو لەدوای منەوە خۆی حەشارداوە، وەرە بیکوژە و لەناوی بەرە، تەنها(غەرقەد) نەبێت کە ئەم بانگە لە موسڵمانان ناکات، ئەویش جۆرە دارێکی جولەکەیە- تایبەتە بە خۆیانەوە- بەڵێ

---

١- رواه مسلم، كتاب الجهاد و السير، باب إجلا ء اليهود من الحجاز (١٢ : ٩٢) مع شرح النووي.

٢- رواه البخاري، كتاب الجهاد، باب قتال اليهود، وصحيح مسلم، كتاب الفتن و أشراط الساعة.

ئابەم جۆرە خوای گەورە داروبەرد، دەهێنێتە قسەو شان بەشان لەگەڵ باوەڕداراندا دەجەنگن لەدژی جولەکە تا لەناویان دەبەن و سەرزەویان لێ پاك دەکەنەوە.

**چەند تێبینیەك لەسەر ئەم مەسەلەیە:**

١- سەرنج بدە لەپیسی و گەندەڵی جولەکە!! تەنانەت لەسەردەمی دەجالیشدا ڕۆڵی خۆیان دەبینن و یەکێکن لەسەرخەرو یارمەتی دەرو پاڵپشتە هەرە بەهێزەکانی دەجال، کە ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر خراپی و ناڵەباریان، جولەکە بەدرێژایی مێژوو وتەنانەت بە ئیستەشەوە، ڕۆڵی دەجال دەبینن و، وەك بەردەست و جێ نشینی ئەو کاردەکەن و پرۆژەو داواکاری و بیرو باوەڕەکانی لەسەر زەویدا بڵاو دەکەنەوەو خەڵکی ڕادەهێنن و پرۆڤەیان پێ دەکەن لەسەر ئەوەی کە دەجال هات و دەرکەوت، کارێکی ناوازەو نەخوازراوو سەرسوڕهێنەر نەبێت و بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕوداوێکی زۆرئاسایی بێت و بەبێ سێ و دوو شوێنی بکەون و پەیڕەوی لەکردەوەکانی بکەن، گەر خەڵکی باوەڕیان بەدەجال نیە، یان گومان لە باوەڕیاندایە بەرامبەر بەدەجال، ئەوە تەنها سەیری جولەکە بکەن و باش بۆ کردەوەو بیروباوەڕەکانیان بڕوانن، ئەو جا یەکلادەبنەوەو باوەڕیان زۆر بەباشی دادەمەزرێ کە دەجال ڕاستەو هیچ گومان لە بونیدا نیەو جولەکەش باشترین بەڵگەن لەسەر دەجال و کردەوەکانی.

٢- سەرنجێکی تر لەسەر گەندەڵی جولەکەو چەپەڵیان ئەوەیە کە: ئاخۆ دەبێت ئەم گەلە چەندە پیس و خراپ بن تا(داروبەرد) ی بێ گیان لە نارەحەت بوونی بەرامبەریان بێنە گۆو نەبنە پەناگەو حەشارگە بۆ جولەکەو ئاشکرایان بکەن تا موسڵمانە ڕاستەقینەکان بێنە دەست لێیان و لەناویان بەرن!!؟

جێی سەرسوڕمان نەبێت لەلاتان کە دارو بەردوو بێ گیانەکان لە خراپی کردەوەی مرۆڤە شەیتان ڕفتارەکان بێ زارو بێ تاقەت بن ولەناخی خۆیاندا هاوار لەدەستیان بکەن!!

من دڵنیام هەرکات مرۆڤ لەسەر زەوی تاوان و خراپە دەکات و سروشت دەشێوێنێ، سەرجەمی ئەم بونەوەرو گەردوونە بەگیان دارو بێ گیانەوە بێ زاری لەبەرامبەردا دەردەبڕین و نەفرین لە ئەنجام دەرانی دەکەن، بەڵام ئێمەی مرۆڤ حاڵی نابین و تێ ناگەین !!

دەریای نیل بوو بەمایەی ڕزگاربوون بۆ موسا و گەلەکەی و گۆڕ بۆ فرعەون و سەربازەکانی !!

ئاگری بڵێسەداری سوتێنەر بوو بە جێگەیەکی ئارام و فێنك بۆ إبراهیم !!

زەوی ڕەق و بێ گیان لەئاستی قارونـدا بوو بەدەریا و قارونی پیادا چووە خوارەوە !

چۆلەکەی بێ دەستەڵات و بێ زیان بەدەنکە بەردە بچووکەکانی دەنوکیان بوون بەگەردەلولی پڕ تۆڵەو غەزەبی خواوو سەربازە دڕندەکانی ئەبرەهە یان لەناوبرد، ئاوو باران کەسەرچاوەی ژیان و ڕەحمەتی پەروەردگارن بۆ مرۆڤەکان، بوون بە غەزەب و گەلەکەی نوحیان غەرق ی تۆڵەی خوایی کرد !!.

لەلای ئێمەی ژیری سنوردار داروبەردو زەوی و ئاسمان و مانگ و خۆرو ئەستێرەکان، بێ گیانن و هەستیان نیە!! وبێ ئاگان لەباشەو خراپەی مرۆڤەکان؟! بەڵام لە ڕاستیدا وانیەو هەموومان بەبێ جیاوازی بەندەی یەك خواین و لەناو ئەو ملیونەها دروست کراوەدا تەنها مرۆڤ و جنۆکەکانە کە بێ فەرمانی پەروەردگاریان دەکەن و لەسەر بەرنامەی ئەوزاتە بەرزە ناڕۆن !! گەرنا سەرجەمی دروست کراوەکانی تری خوای گەورە لە گیان دارو بێ گیان، بە ئەندازەی چاوترووکانێك لەفەرمان خوا لانادەن و لەسەر ئەو ڕێگەیە دەڕۆن کە پەروەردگاریان بۆی دارشتون و کردویەتی بە بەرنامەیان، هەموو دروست کراوەکانی خوای گەورە عیبادەتی تایبەت بەخۆیان هەیە و تەسبیحاتی خوا دەکەن، بەڵام ئێمەی ژیری سنوردار لێیان حاڵی نابین، هەروەك قورئان دەفەرموێت: ((و إن من شيء إلا يسبح بحمده ولكن لا تفقهون تسبيحهم) ).

٣- ئاشكرا ترین و دیارترین و بێ گومان ترین خاڵ کە لە ناوەڕۆکی فەرموودەکەدا دیارە، بریتیە لە ناوبردن و بانگ کردنی ئەوانەی کە لەگەڵ جولەکەدا دەجەنگن بە(موسڵمان و بەندەی خوا)، لێرەوەیە بۆمان دەسەلمێ کەشەڕی نێوان جولەکەو بەرهەڵست کارانیان، جەنگی نەتەوەیی نیە هەروەك دەڵێن (عەرەب-إسرائیل) بەڵکو جەنگی بیروباوەڕو مەبدەئە، جەنگە لە نێوان هەق و ناهەقدا، جەنگە لەنێوان موسڵمان و غەیرە موسڵمانداو هیچ پەیوەندیەکی بەمەسەلەی نەتەوەوەو ڕەگەز و زمان و کەسانی دیاری کراوەوەنیە !!!

ئەوانەی کەشان دەدەنە بەر بارقورسی جەنگی جولەکە تەنها لەیەك کاتدا دەتوانن زاڵ و سەرکەوتووبن بەسەریاندا کە موسڵمانی ڕاستەقینەبن و بەندەی دڵسۆزی پەروەردگاریان بن، گەرنا سەرکەوتن و زاڵ بوون بەسەر جولەکەدا بەهەر ناوو پاڵنەرێکی تری (نەتەوەیی و ڕەگەزیی و......) بێ بەرهەمەو کارێکی ئەستەمە.

## مێژووی فەلەسطین لەنێوان ساڵەکانی

## (١٩٧٩ تا١٩٩٠)

یەکێکی تر لەو باسە گرنگانەی کە پێویستە لەسەری هەڵوێستە بکەین بریتییە لە: گوزارشت کردن بە مێژووی (فەلەسطین)دا، ئەویش لەنێوان کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم تا هەشتاکانی سەدەی بیستەم، ئەوانیش بریتین لە:

١- ژمارەی جولەکەکان لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا زۆر کەم بووە، ئەوەش بەوجۆرەی کە لەساڵی (١٨٤٥)دا ژمارەیان لە (١٢٠٠٠) تێنەدەپەڕی، بەڵام لە ساڵی (١٩١٤)دا ژمارەیان گەیشتە (٨٥٠٠٠) هەزار کەس، هۆکاری ئەمەش بریتی بوو لەو دەست گرتن و یارمەتییانەی کە جوڵەی صەهیۆنیەتی جیهانی (الحركة الصهيونية العالمية) یارمەتی و کۆمەکی جولەکەی دا کە لە وڵاتانی ئەورووپاوە کۆچ بەرەو فەلەسطین بکەن.

٢- لەساڵی (١٩٠٤)دا (جولەی صەهیۆنی جیهانی) کۆنگرەی چوارەمی خۆی گرێ داو لە ئەنجامدا، بڕیار لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ درا بۆ تەواوی جولەکەکانی جیهان لە (ئەرجەنتین).

دوای دوو ساڵ و لە ساڵی (١٩٠٦)دا کۆبوونەوەیەکی تریان کردو بڕیارەکەیان هەڵوەشاندەوەو لەبری ئەرجەنتین (فەلەسطین)یان دیاری کرد بە دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ جولەکە.

لەساڵی (١٩١٤)دا و لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگی جیهانی یەکەمدا بەریتانیا پەیمانی دا بە عەرەبەکان کە یارمەتییان بدات لەوەی کە ئازاد و سەربەخۆیان بکات و ڕزگاریان بکات لەژێر دەستەڵاتی عوسمانی، ئەوەش بەومەرجەی کە پاڵپشتی بەریتانیا بکەن لە دژی دەوڵەتی عوسمانی.

٣- لەساڵی (١٩١٦) پەیماننامەی (سایکس بیکۆ) مۆرکرا، لەنێوان فەرەنسا و بەریتانیادا، ئەوەش بەو جۆرەی کە وڵاتانی عەرەبی لەیەك پارچەییەوە بکرێتە چەندین پارچەو سنور لە نێوانیاندا دیاری بکرێت، دوای ئەم پەیماننامەیە (لوبنان و سوریا)خرانەژێر ڕکێفی فەڕەنساوە، پاشان (ئەردەن و عێراق)یش خرانەژێر ڕکێفی بەریتانیاوە.

٤- لە ساڵی (١٩١٧)دا و لە (٢)ی نۆڤەمبەردا بەڵێنی (بەلفۆر) واژوو کرا، لەم ساڵەدا (١٩١٧) وەزیری دەرەوەی بەریتانیا کە ناوی (جەیمس آرثر بلفۆر) بوو، پەیمانی دا بە گەورەی جولەی صەهیۆنیەتی جیهانی، کە دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ تەواوی جولەکەکان دابمەزرێنێ لە فەلەسطین و لەبەرامبەریشدا بەریتانیا پەیمانی بە تەواوی زمان و ڕەگەز و دینەکانی تری نێو فەلەسطین دا کە مافەکانیان پارێزگاری لێبکات و دەست بەرداریان نەبێت.

٥- دوای تەواوبوونی جەنگی جیهانی یەکەم و لە ساڵی (١٩١٨)دا، سەرەتای هەنگاوەکانی کۆچی جولەکە بۆ فەلەسطین دەستی پێکرد، کە ئەوکات فەلەسطین لەژێر (إنتداب)ی بەریتانیادا بوو، بەپێی ئەم پەیمانی (بلفۆر)ە تەواوی کارئاسانی

کرا بۆ کۆچکردنی جولەکە لە سەرتاسەری جیهانەوە بەرەو فەلەسطین، ئەمەش بە ئامانجی دامەزراندنی دەولەتێکی نەتەوەیی سەربەخۆ بۆ جولەکە لە فەلەسطیندا.

لە ساڵەکانی (٣٠)دا زۆرترین ڕێژەی جولەکە لە ئەورووپاوە کۆچیان بەرەو فەلەسطین دەست پێکرد، ئەمەش بەهۆی ئازاردانیان لە لایەن نازیە ئەڵمانییەکانەوە.

(تەلئەبیب) زۆرترین ژمارەی جولەکەی لەخۆگرت و دوای ئەمەش بەسەرجەم خاکی فەلەسطیندا بڵاوبوونەوە.

٦- لە ساڵی (١٩١٩)دا یەکەم کۆنگرەی نیشتمانی گرێدرا لە فەلەسطیندا بەئامانجی ئیدانەکردن و بەرپەرچدانەوەی تەواوی پەیمانی (بەلفۆر).

٧- لە ساڵی (١٩٢٠)دا کۆنگرەی (سان ڕیمۆ)بەسترا، لەم کۆنگرەیەدا بە تەواوی بڕیار لەسەر ئەوە درا کە فەلەسطین دەبێت بچێتە ژێر دەسەڵات و ڕکێفی بەریتانیاوە.

٨- لە ساڵی (١٩٢٢)دا کۆمەڵەی وڵاتان (عصبة الأمم) بڕیاری ئەوەی دەرکرد کە فەلەسطین لەژێر (إنتداب)ی بەریتانیادا دەبێت بەو جۆرەی کە ئەم بڕیارە لە سوودی جولەکەکاندا بێت بەوەی کە زەمانەتی دامەزراندنی دەولەتێکی نەتەوەیی سەربەخۆ بۆ جولەکەکان بکات!!.

٩- لە ساڵی (١٩٢٩)دا شاری (قدس)گەورەترین خۆپیشاندان و شەڕ تیایدا دەستی پێکرد و عەرەبی دانیشتوانی فەلەسطین هێرشیان کردەسەر جولەکەکان و (١٣٣) جولەکە کوژران و لە بەرامبەریشدا (١١٦) عەرەب کوژران.

١٠- لە ساڵی (١٩٣٦)دا فەلەسطینیەکان مانگرتنی بەرفراوان و سەرتاسەرییان بۆ ماوەی (٦٦)مانگ ڕاگەیاند، ئەمەش بەهۆکاری داگیرکاریی زەوییەکانیان لەلایەن جولەکەکانەوە.

١١- لە ساڵی (١٩٣٧)دا (لجنة بیل) هاتە مەیدان، ئەویش بەم جۆرە:

لەو کاتانەی کە بەڵێنی (بەلفۆر)ی تیادا مۆرکرا، بەریتانیا هەوڵی ئەوەی دا کە ئەو بارگرژییەی لەنێوان عەرەب و جولەکەکاندایە هێوری بکاتەوە، بەلام

سەرکەوتوو نەبوو، هەربۆیە لە ساڵی (١٩٣٧)دا لۆرد رۆبەرت بیل (Loard peel)
تەقریرێکی پێشکەش کرد، کە تیایدا باسی لەوە دەکرد: بەردەوام بوونی داگیرکاری
فەلەسطین لەژێر (إنتداب)ی بەریتانیادا ناگونجێت لەڕووی کردارییەوەو گەورەترین
ئاستەنگ دروست دەکات لەبەردەم بڕیاردان لە دامەزراندنی دوو دەوڵەتی سەربەخۆ
لە فەلەسطیندا بە ناوی دەوڵەتی عەرەب و ئیسرائیل.

١٢- لە ساڵی (١٩٣٩)دا دەوڵەتی بەریتانیا بڕیارێکی تازەی دەرکرد ئەویش
بەوەی کە هۆشداریی دا بە جولەکەکان لەوەی کە پرۆسەی کۆچ ڕابگرن بەرەو
فەلەسطین، هەر بۆیە جولەکەکان زۆر ناڕەحەت بوون بەم بڕیارەی بەریتانیا و
هەستان بە دروستکردنی چەندین گروپی چەکدار تا زەبر لە بەریتانیەکان و عەرەبە
فەلەسطینییەکان بدەن لەپێناو ژێربارخستنی بەریتانیاو ئیجبارکردنی بەوەی کە
خاکی فەلەسطین بەجێبهێڵن و ئەمانیش ئیعلانی دەوڵەتی جولەکەی تیادا بکەن.

١٣- لە ساڵی (١٩٤٥)دا و دوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانیی، بۆ
جارێکی تر بزووتنەوەی صەهیۆنییەتی جیهانی داوای کرد کە دەرگای کۆچ بۆ
جولەکەکانی جیهان بکرێتەوە بۆ فەلەسطین.

١٤- لە ساڵی (١٩٤٧)دا بەریتانیا بڕیاری ئەوەی دا کە دەست لە داگیرکاری
فەلەسطین هەڵبگرێت و، ئەم پەیامەشی بەرزکردەوە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان.

هەر لەبەرئەمەبوو کە نەتەوە یەکگرتووەکان یەکەم دانیشتنی خۆی گرێدا لە
ساڵی (١٩٤٧)دا و باس لەسەر ئەوە کرا کە فەلەسطین بکەن بە دوو بەشەوە، تا
دوو دەوڵەتی ئیسرائیلی و عەرەبی تێدا دابمەزرێ و (قدس)یش لەونێوەندەدا
بمێنێتەوە، لە ئەنجامدا (٣٣) ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕازی بوون و
لەبەرامبەریشدا (١٣) ئەندام ڕازی نەبوون.

١٥- لە ساڵی (١٩٤٨)دا یەکەم جەنگ لەنێوان عەرەب و ئیسرائیل دەستی
پێکرد، ئەمەش لەبەرەنجامی ئەو بڕیارە بوو کە درا سەبارەت بە دابەشکردنی
خاکی فەلەسطین بۆ دووبەش، سەرەنجام هەریەك لە سەربازانی (مصر و ئەردەن و
سوریا و لوبنان و عێراق) و چەندین جێگەی تر بەشداریی خۆیان ڕاگەیاند لەگەڵ

جەنگاوەرانی فەلەسطیندا کە بجەنگن دژی قەوارەی زایۆنی، بەلام لەئەنجامدا عەرەبەکان سەرکەوتوو نەبوون و جەنگ بەسوودی جولەکە کۆتایی هات.

١٦- لە سالی (١٩٤٨) بەدواوە هاوکێشەکان بەرەو پێچەوانەبوون هەنگاویان هەلگرت، ئەویش لەڕووی ژمارەوە پێکهاتەی دانیشتوانی فەلەسطینەوە، بەو جۆرەی کە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی فەلەسطین بەهۆکاری ئەو بارگرژییەی کە لەناو خودی فەلەسطیندا هەبوو دەستیان دایە کۆچ و ئاوارەی ولاتانی دراوسێ بوون، بەمەش ژمارەی کۆچ کەرانی فەلەسطینی گەیشتە نزیکەی (٦٨٠.٠٠٠) ئاوارە، هەربۆیە هاوکێشەکان لەڕووی ژمارەی دانیشتووانەوە پارسەنگی بەلای جولەکەدا هات و بوونە زۆرینە لەخاکی فەلەسطیندا.

١٧- لە سالی (١٩٤٩)دا و بۆ یەکەم جار (کنیست)ی ئیسرائیلی دەستی کرد بە هەلبژاردنی سەرۆکایەتی و لەئەنجامدا (حاییم واین) هەلبژێردرا وەك یەکەمین سەرۆك بۆ قەوارەی زایۆنی.

١٨- لە سالی (١٩٥٦)دا کردەوەی گیان فیدایی لەناو فەلەسطیندا دەستی پێکرد، دژ بە هێزە داگیرکارییەکانی ئیسرائیل، لەبەرامبەردا قەوارەی زایۆنی بە توندترین شێوە وەلامی دانەوە، لەم کاتەدا (مصر) هەستا بە ڕێگرتن لە کەشتییە ئیسرائیلییەکان بەوەی کە نۆکەندی (سویس) بەکارنەهێنن لە تێپەڕبوونی کەشتییە جەنگییەکانیان پیایدا.... لەم کاتە هەستیارەدا بەریتانیا و فەرەنسا یارمەتی ئیسرائیلیان بەوە دا کە فشارییان خستەسەر مصر لە ڕاگرتنی ئەو یارمەتییانەی ئامادەیان کردبوو بۆ دروست کردنی ئەو (سەد)ە گەورەیەی کە بڕیار بوو لە باشوری (مصر) دروست بکرێت! !بەمەش ئیسرائیل سەرکەوت بەسەر مصرداو ئامانجەکانی هاتنەدی و سەرەنجام کەرتی غەززە و سینا و (ضفة)ی خۆرئاوا کەوتنە ژێر دەستی ئیسرائیل..

١٩- لە سالی (١٩٦٤)دا و لەبەرەنجامی ئەو دەریاستەمەی کە جولەکە ئەنجامیان دا لە خاکی فەلەسطیندا، بزووتنەوەی ڕزگاری فەلەسطین (منظمة

التحرير الفلسطينية) دامەزراو لە ساڵی (١٩٦٥)دا شۆڕشی خۆی دژی جولەکە ڕاگەیاند.

٢٠- لە ساڵی (١٩٦٧)دا، بیری نەتەوەپەرستی و ڕەگەزپەرستی عەرەبی بەشێوەیەکی خێراو بەرچاو بڵاوبوویەوە بە وڵاتانی عەرەبیدا، هەربۆیە داواکرا لە (جمال عبدالناصر) کە هەق لە جوولەکە بکاتەوە، لەم کاتەدا هێزێکی عەرەبی یەکگرتوو پێکهات و بڵاوبوونەوە لە سنوورەکاندا، پاشان ئەو دەروازانەیان داخست کە کەشتییە ئیسرائیلییەکانی پێدا تێدەپەڕی، هەروەها داواش کرا لە (جمال عبدالناصر) کە داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکات کە لە میصر بچنەدەرەوە!! بەڵام دوای تەنها (٦)ڕۆژ جەنگ کۆتایی هات بەسەرکەوتنی ئیسرائیل و دۆڕاندنی عەرەبەکان، هۆکارەکەشی بریتی بوو لەو یارمەتییە سەربازییانەی فەڕەنسا بۆ ئیسرائیل لە پێدانی فڕۆکەی جەنگی و لەناوبردنی هێزی سەربازی عەرەبەکان، سەرەنجام بەشێکی تر لە خاکی فەلەسطین داگیرکرا لە لایەن جولەکەوەو بەمەش سنووری جوگرافی ئیسرائیل زیادی کرد بەڕێژەی چوار ئەوەندەی ئەوەی کە دوای ئاگربەستی ساڵی (١٩٤٩) داگیری کردبوو.

٢١- لە بەرواری (٦)ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٧٣) دا و بۆ جاری سێیەم لە هێرشێکی کتوپڕو چاوەڕوان نەکراودا (مصر و سوریا) هێرشیانکردە سەر ئیسرائیل، ئەو ڕۆژە کە ئەم هێرشەی تێدا کرا ڕۆژی جەژنی دینی ئیسرائیل بوو کە ڕۆژی بەڕۆژووبوونی پیرۆز بوو (صیام مقدس).

لەم جەنگەدا و لەسەرەتادا جوولەکەکان سەرکەوتوونەبوون لەبەرگرتن لەو هێرشانەی کە دەکرایە سەریان چونکە عەرەبەکان لەلایەن یەکێتی سۆڤێتی ئەو کاتەوە یارمەتی دەدران، جگە لەوەی هەریەك لە وڵاتانی (کوەیت و سعودیە و عێراق) یارمەتییەکانی خۆیان گەیاندە هێزە عەرەبییەکان لە دژایەتی ئیسرائیلدا، لەم پێناوەدا زۆرێك لەوڵاتانی عەرەبی هەناردەی نەوتیان ڕاگرت بەرەو ئەمریکاو دەوڵەتانی تری ڕۆژئاوا کە یارمەتی ئیسرائیلیان دەدا، لەم پێناوەدا ئەمریکا ڕێگەچارەیەکی ئاشتییانەی گرتەبەر بۆ چارەسەرکردنی ئەم جەنگە، ئەمەش

لەڕێگەی ناردنی وەزیری دەرەوەی خۆی بەناوی (ریتچارد نیکسن) لەسەر ئەوەی کە جەنگ ڕابگیرێت لەنێوان مصر و سوریاو ئیسرائیلدا و سەرەنجام کارەکەیان بە ئەنجام گەیشت...

٢٢- لە ساڵی (١٩٧٤)دا و لە شاری (رباط) بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی فەلەسطینی (منظمة التحرير الفلسطيني) شەرعییەتی یاسایی پێدرا و، وەك یەکەم نوێنەری خەڵکی فەلەسطین دەست نیشان کراو (یاسر عرفات)یش بەسەرکردەی دانراو لە نەتەوە یەکگرتووەکان وتارێکی پێشکەش کرد.

٢٣- ڕێکەوتننامەی (کامب دەیفد):

پەیمانی (کامب دیفد) بریتی بوو لەو ڕێکەوتنەی کە ئیمزا کرا لە بەرواری (١٩٧٨/٩/١٧) لەنێوان سەرۆکی ئەوکاتەی مصر (محمد أنور سادات) و سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل (مناحيم بيغن) دوای (١٢)ڕۆژ لە دانووستان لە (کامب دیفد) لە ویلایەتی (میریلاند)ی ئەمریکا نزیك بە پایتەختی ئەو وڵاتە کە (واشنطن)ە.

لە ساڵی (١٩٧٧)دا و لەبەردەم ئەنجوومەنی نوێنەراندا (أنور سادات) ئەوەی ڕاگەیاند کە ئامادەیە سەردانی ئیسرائیل بکات، تەنانەت بچێتە ناو (کنیست)ی ئیسرائیلیشەوە!!

بەڵێ، (سادات) لە (٢٠)ی نۆڤەمبەری ساڵی (١٩٧٧)دا بەرەو (کنیست)ی ئیسرائیلی بەڕێکەوت و وتارێکی پێشکەش کرد و ئەوەی دووپات کردەوە کە هەنگاوی ئاشتی دەنێت لەگەڵ ئیسرائیلدا، و مەبەستی ئەم وتانەم تەنها ئاشتی سەرتاسەرییە کە جەنگی لەدوا نەبێت!!

دواتر سادات (بیغن)ی بانگێشت کرد بۆ مصر و لە (إیسماعیلیة) کۆنگرەیەکی گەورەی بۆ سازدا و، ئەویش لەوێ ستراتیژو سیاسەتەکانی خۆیانی دەرهەق بە مصر و فەلەسطین و جێگە ناکۆکەکانی وەك (سیناء) باسکرد.

**خاڵە سەرەکییە بڕیارلەسەردراوەکانی ئەم پەیماننامەیە بریتی بوو لەمانە:**

* کۆتایی هێنان بە جەنگ لە نێوانیاندا (مصر و ئیسرائیل)و بانگەشەکردن بۆ ئاشتی درێژخایەن و بەردەوام.

* دامەزراندنی پەیوەندییەکی دروست و باش لەنێوان میصر و ئیسرائیلدا.

* پاشەکشەکردنی سەربازانی ئیسرائیل لە (سیناء) کە لە ساڵی (١٩٦٧)دا جوولەکە داگیری‌کردبوو و تەسلیمکردنەوەی بە میصر.

* ڕێگەدان بە کەشتییە سەربازییەکانی ئیسرائیل کە تۆکەندی (سویس) بۆ مەرامەکانی خۆیان بەکاربهێنن و ڕێگریان لێنەکەن.

**دەستکەوتەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە:**

* (سیناء) بۆ میصر گەڕایەوە دوای (١١)ساڵ داگیرکردن.

* بۆ یەکەم جار و لە لایەن دەوڵەتێکی خاوەن شارستانی و گەورەی وەك میصرەوە، دان نرا بە دەوڵەتی ئیسرائیلدا، کە ئەمە گەورەترین دەستکەوتی جوولەکە بوو لەم گرێبەستەدا.

* هەردوو وڵات سوودمەند بوون لە پەیوەندییەکانی یەکترو دانانی باڵوێزخانەی هاوبەش لە وڵاتانی یەکتردا.

* لەڕووی ئابورییەوە هەردوولا سوودمەند بوون، ئەویش بە کارئاسان بۆکردنی ئەوانەی کە سەردانی وڵاتی یەکتریان دەکرد بۆ بەسەربردنی کاتەکانیان بەشێوەی گەشتوگوزار.

## دەزگای سیخوڕی ئیسرائیلی (موساد):

یەکێکی تر لەو باسە گرنگانەی کە پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەیە بریتییە لە، تیشك خستنەسەر دەزگای سیخوڕی جولەکە، کە ناسراوە بە (موساد).

سەرەتا حەزدەکەم ئەو ڕاستییە بڵێم کە هەموو حزب و دەستەو کۆمەڵ و دەوڵەتێك لەم دنیایەدا کەم تا زۆر دەزگایەکی هەواڵگیریی سەربەخۆیان هەیە، ئەمەش لە پێناو دەیان ئامانجدا، کە لێرەدا بواری باسکردنیان نییە، بوونی ئەم حاڵەتە تا ڕادەیەك کارێکی ئاساییە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە!! بوونی ئەم جۆرە دەزگایانە تەنها بۆ کاری سیخوڕی و تێکدانی ژیانی خەڵك و ئەوانە بەکاردێت کە زیانن لەسەر بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل!!.

دەزگای سیخوڕی جولەکە (موساد) مێژووی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ (٥٠)ساڵ پێش دروست بوونی دەوڵەتی ئیسرائیل لە فەلەسطیندا.

دوای قۆناغ بەندییەکی زۆر لە چۆنیەتی و بەرنامەی کارو ناوی ئەم دەزگا سیخوڕییە، بۆ یەکەم جار و لە ساڵی (١٩٥١)دا و بە ڕەسمی ناوی (موساد)ی لێنرا، شوێنی سەرەکیان بریتییە لە خانوویەکی ئاسایی لە جادەی (ملك شائول) لە (تەلئەبیب).

بەپێی سەرژمێرییەك کە ساڵی (١٩٩٦) ئەنجام دراوە، ژمارەی ئەو کارمەندانەی لەم دەزگایە کار دەکەن پێکهاتوون لە (١٢٠٠ تا ١٥٠٠)کەس و لە ناویاندا (٥٠٠) ضابطی سەربازیان تێدایە کە تەمەنیان دەگاتە نزیکەی (٥٢)ساڵ!!

### کارە گرنگەکانی (موساد) بریتین لە:

١- سیخوڕی کردن (التجسس).

٢- کوشتن بەشێوەی نهێنتی (الإغتیالات).

٣- دەست گرتن بەسەر چەکدا.

٤- سیخوڕیی کردن لەپێناو دروستکردنی فیتنەو شەڕدا.

٥- فڕاندنی ئەوانەی کە خۆیان مەبەستیانە.

**بێگومان (موساد) له چەندین دەزگای سەرەکی پێکهاتووە کە ئەمانەن،**

١- بەشێك تایبەتە بە کۆکردنەوەی زانیاری ورد لەسەر تەواوی مەسەلەکان و پاشان پۆلێن کردن و لێکۆڵینەوە دەربارەیان.

٢- بەشێکی تر کاریان بریتییە لە سیخوڕی و چاودێری کردن.

٣- بەشێکی تریان کاری سەرەکیان بریتییە لە ڕفاندن و کوشتن.

٤- هەندێکی تریان پەیوەسن بە تەزیرو وێنەگرتن و ئاگاداربوون.

٥- بەشێکی تری ئەم دەزگا خوێناوییە ترسناکە پەیوەستە بە مەشق کردن بە ئەندامانی لەسەر فێرکردنیان بۆ کاری سیخوڕی و چۆنیەتی دەستکەوتنی زانیاری و مامەڵەکردن لەناو خەڵك و..

٦- بەشێکی تریان کە لە هەموو بەشەکان هەستیار ترو گرنگ ترو ترسناك ترە، بریتییە لە کوشتنی سیخوڕەکانی تر، کە سەر بە حزب و گروپ و دەوڵەتەکانی ترن.

٧- بەشێکی تر لەو دەزگایە پێی دەوترێت (عل) ئەویش بەمانای ئاست بەرزیی (رفيعه المستوى) ئەندامانی ئەم بەشە کاریان بریتییە لە کۆکردنەوەی تەواوی زانیاری لەسەر وڵاتە عەرەبیەکان لە ناوخۆی ئەمریکادا.

# کۆتایی

دوای ئەو نمایشە خێراییەی کەلە ستەم و گەندەڵی و بێ باوەڕی و خراپە و درۆی جولەکە کردمان، دەبێت باش لەوە تێبگەین و حاڵیی ببین، کەپاڵدانەوە و خەوتن و بێ باك بوون لەم دووژمنە سەرسەختە دادی ئێمەی موسڵمان نادات و دەبێت هەوڵ بدەین، سەرەتا لە تێگەیشتن لە ئیسلام بە هەردوو سەرچاوە گەورەکەیەوە (قران و سونەت) گەورەترین ڕۆشنایین لە ژیانی ئێمەی موسڵماندا و تەواوی گەورەی و زانایی و ڕەوشتە بەرزەکان و سەرجەم فەزڵ و نازو نیعمەتەکانمان لەسایەی ئەو دوو سەرچاوە گرنگەوەن، کە بەداخەوە ئێمەی موسڵمان لێیان بێ ئاگاین و تاڕادەیەکی زۆر پشت گوێمان خستوون، جولەکە بە تەوراتیان دژایەتی قورئانمان دەکەن، بە حاخامە گەندەڵەکانیان دژایەتی مامۆستا مێزەر پاکەکانمان دەکەنی، بە تەلمود و بروتوکولات دژایەتی سونەت و بخاری و موسلیم دەکەن، بە(کنسیت) یان دژایەتی مزگەوتەمنارە بەرزەکانمان دەکەن، بە عەقیدەی پڕ لە شیرك و بێ باوەڕییان دژایەتی یەکتا پەرستی ئێمەی ئومەتی ئیسلام دەکەن!! بەلآم ئایا ئێمە لە کوێین؟! چەندە خۆمان ئامادە کردوە بۆ دژایەتی ئەم دوژمنە سەرسەخت و ئاشکرایەمان؟! چەندە هەوڵمان داوە کەلەسەر ڕێگەو بیر و باوەڕە چەوەتەکانیان هەنگاو هەڵنەگرین؟! ئەگەر کەسێك لە دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە و بەتایبەت تر ئەم چەند دێڕەی کۆتای پرسیاربکات و بڵێت: ئایا ئێمە چیمان لە بەرامبەر جولەکە و دەوڵەتی زل هێز و پڕ چەکی ئیسرائیل دا پێ دەکرێت تا ئەنجامی بدەین؟!.

لەوەلآمدا پێی دەڵێم: بخوێنەرەوە و هەوڵی خۆڕۆشنبیر کردنی خۆت بدە، چونکە ئەوانەی سەرقاڵن بە خوێندنەوەی شتی بەسودەوە گەورەترین زەبر لە دڵی دوژمنان دەدەن، چونکە گومان لەوەدا نیەکە، کەسی خوێندەوار یان گەل و میللەتی خوێندەوار نابنە مەڕ و مالآت و هەردەمەی شوانێك پێش خۆیان بخات و ئەمانیش تەنها گوێ ڕایەڵی کردنیان لەسەربێت !!.

پاشان لە قورئان و سونەت شارەزا بە و ئەو کاتانەی کە بە شتی بێ مانا و بێ سودەوە سەرف دەکەیت، هەوڵی شارەزا بوونت بە لە دینەکەت، چونکە شارەزابوون و جێ بە جێ کردنی دین، ژینی باشت پێ دەبەخشێت لە دونیا و دوارۆژدا و ژیر و بەرچاو ڕۆشنت دەکات دەربارەی دۆست و دووژمنەکانت!! پاشان هەرگیز شوێن ئەو ڕێگەو ڕێبازانە مەکەون کە بەرە و بێ دینی و سەرگەردانی دونیا و دوارۆژ دەتان بەن و بەڵکو تەنها شوێن ئیسلام بکەوە، چونکە بە شوێنکەوتنت بۆ ئیسلام بڕیاری گەورەترین جەنگ و دژایەتیت لەگەڵ شەیتان و شاگردەکانی لە جولەکە، بڕیارداوە و لەسەنگەری بەرامبەریان.

لەکۆتایدا داواکارم لە لەپەروەردگاری بەسۆز کە ئەم نوسینەم بۆ بکاتە توێشووی ڕۆژی دوایی و هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانمان و پاشان ڕەنج و ماندوو بونم لە نوسینی ئەم کتێبەدا بە(جهاد) بۆ بنوسێت کەلەگەڵ سەرسەخت ترین دوژمنی خواو موسڵمانان‌دا کە جولەکەن، ئێمە گەر بۆمان نەکرێت و بوارمان بۆ نەسازێت لە نزیکەوە دژایەتی جولەکە بکەین، بەلام خۆ بەهەست و هەڵوێست و قەڵەم و زمان لەدوورەوە دەتوانین دژایەتیان بکەین وهیچ نا گەلی موسڵمانانی کوردی خۆشەویستمان لە فێڵ و بێ باوەڕی و دوژمن کاریان ئاگاداربکەینەوە، خوای گەورە جارێکی تریش لێت داوادەکەم کە ئەم نوسراوەم بۆ بکەیتە توێشووی ڕۆژی دوای و پاداشتی هەموو ئەوانەش بدەیتەوە کە دەستیان گرتم و یارمەتیان دام هەرلە پێدانی سەرچاوە، وەك مامۆستای زۆر بەڕێز(مەلا محەمەد پێنجوێنی) پێش نوێژی مزگەوتی عبدالرحمن بۆسکانی و، برای زۆر خۆشەویستم بەڕێز (مەلا جلال صادق) پێش نوێژی مزگەوتی حاجی أبو بکری سیوەیلی لە ڕاکێشانی بابەتی ئەنتەرنێت و برای خۆشەویستم مامۆستا (مەلا ناصح موبەری) کەیارمەتی لە چاپ دانی ئەم کتێبەی دام و مامۆستای زۆر بەڕێز و خاوەن قەدرم (مامۆستا سەید أحمەد عبدالوهاب) لە شاری هەولێر، زۆر هانی دام لە نوسینی ئەم کتێبەدا، خوای گەورە پاداشتی هەموویان بە زیادەوە بداتەوە و ئەوانە شیان کە ناوم نەبردوون.

داوا لـه تـۆی بـەڕێزیش دەکـەم کـە لەهەڵـە و کـەم و کورتیـەکانم ببوریـت و بەخۆشەویستی خۆتان بمان بەخشن.

**ربنا تقبل منا إنك أنت السميع العليم وتب علينا إنك أنت التواب الرحيم (آمين).**
**اللهم اجعل عملي كله صالحاً وأجعله كله خالصاً لوجهك الكريم (آمين).**

**تم بحمد الله العزيز الحكيم**

١٠/ جمادى أول / ١٤٣١
٢٤/ ٦/ ٢٠١٠



کۆچی جولەکە لە وڵاتانی ترەوە بۆ فەلەستین دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ساڵی ١٩١٨




وێنەی دامەزرێنەری بزوتنەوەی صەهیونیەت (تیودور هیرتزل)




وێنەی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (جیمی آرثر بلفور ) ساڵی ١٩١٧




یەکەم کۆنگرەی نیشتمانی فەلەستینی دژبە پەیمانی (بەلفۆر) ساڵی ( ١٩١٩)




داگیرکردنی فەلەستین لە لایەن بەریتانیاوە لە ساڵی ١٩٢٢









مانگرتنی ( ٦) مانگی سەرتاسەری لە فەلەستیندا ساڵی ١٩٣٦












وێنەی یەکەم جەنگی نێوان (عەرەب و ئیسرائیل) لە ساڵی ١٩٤٨




وێنەی جەنگە شەش ڕۆژیەکەی عەرەب – ئیسرائیل ساڵی ١٩٦٧




یەکەم کۆنگرەی کنیست ی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٩



وێنەی کۆچی جولەکەکانی روسیا بۆ فەلەستین ساڵی ١٩٧٩




یاسر عەرەفات، سەرۆکی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی فەلەستینی ساڵی ١٩٧٤




وێنەی جەنگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣لە نێوان میصرو ئیسرائیلدا



## سەرچاوەکان


١- القرآن الكريم.

٢- الجامع لأحكام القرآن.......قرطبي.

٣- صفوة التفاسير........محمد علي الصابوني.

٤- تەفسیری ئاسان........بورهان محمەد أمين.

٥- النفوذ اليهودية.......فؤاد سيد عبد الرحمن الرفاعي.

٦- الموجز في الأديان و المذاهب المعاصرة......ناصرين عبدالله القفاري.

٧- الموسعة الميسرة في الأديان و المذاهب المعاصرة- الندوة العالمية للشباب الإسلامي.

٨- حقيقة اليهود...........فؤاد بن سيد أحمد عبد الرحمن الرفاعي.

٩- اليهود في القرآن........عفيف عبدالفتاح طبارة.

١٠- الأساطر التأريخية الهودية حول أرض المسجد الآقصى..........عثمان سعيد العاني.

١١- اليهود.........زهدي الفاث.

١٢- الصهيونية......عبد القهار العاني.

١٣- اليهودية عقيدة وشريعة.........أ-د- أسعد السمحراني.

١٤- دراسات في اليهودية........عبدالله حسن علي بركات.

١٥- الأسلام و اليهودية (دراسة مقارنة من خلال سفر اللاويين: و علي عبد السميع حسين.

١٦- موسوعة الأديان........وفاء فرحات.

١٧- أديان وفرق.......د.أمين القضاة.

١٨- أضواء علي برو توكولات حكماء الصهيون (النصوص الكاملة) دراسات تحقيقية تأريخية معاصرة: رجاء عبد الحميد عرابي.

١٩- الماسونية و المنظمات السرية ماذا فعلت؟ ومن خدمت؟ عبد المجيد همو.

٢٠- موسوعة اليهود و اليهودية و الماسونية، د.عبد الوهاب المسيری.

٢١- العرب و اليهود في التأريخ.........د.أحمد سوسة.

٢٢- بلادنا فلسطين.........مصطفى مراد دباغ.

٢٣- القدس....قصة مدينة......المنضمة العربية للتربية و الثقافة و العلوم.
٢٤- التغيرات الجغرافية والديمغرافية........مركز دراسات المستقبل.
٢٥- التكوين التأريخي لفلسطين......التغير الأسبوعي ((قضايا دولية )).
٢٦- موقع منظمة التحرير الفلسطينية على الأنترنيت.
٢٧- الموسعة الفلسطينية......
٢٨- اليهود تأريخ إفساد و إغلال و دمار...... د.توفيق الواعي.
٢٩- معالم قرآنية في الصراع مع اليهود......... د.مصطفى مسليم.
٣٠- فەرهەنگی سیاسی سەبا............عبدالقادر سالح.
٣١- سايتەكانى ئەنتەرنێت.
٣٢- أخلاقنا أو الدمار.........إبراهيم نعمة.
٣٣- أشراط الساعة......يوسف بن عبدالله بن يوسف الوابل.
٣٤- كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا.........حسن محمود حمه كريم.
٣٥- المدخل لدراسة التوراة و العهد القديم : محمد علي.
٣٦- مقارنة الأديان.........أحمد شلبي.
٣٧- قصص الأنبيا ء.........عبد الوهاب نجار.
٣٨- روح الدين الأسلامي.........عفيف عبد الفتاح طبارة.
٣٩- تجديد الفكر الديني........محمد إقبال.
٤٠- رؤية إسلامية الأحوال عالم المعاصر: محمد قطب.
٤١- الأسلام و زيف الأقلام............محمد محي الدين حمادة.
٤٢- الأسفار المقدسة قبل الإسلام.........د.صباء طعيمة.
٤٣- أساس الدين.........   د.هلال فارحي.
٤٤- التلمود تأريخه و تعاليمه...........ظفر إسلام خان.
٤٥- اليد الخفية.........   د.عبد الوهاب المسيري.
٤٦- المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية..........عبدالكريم زيدان.
٤٧- دلالة الحائرين.........موسى بن ميمون.
٤٨- التربية الدينية المسيحية.
٤٩- تفسير المنار.......محمد رشيد رضا.

٥٠- إنجيل متى.

٥١- المجتمع اليهودي.

٥٢- قاموس الكتاب المقدس.

٥٣- قاموس المحيط.

٥٤- الأحكام السلطانية و الأحكام الدينية............أبي الحسن الماوردي.

٥٥- الجنايات في الفقه الإسلام...........د.محمد هاشم عمر.

٥٦- بداية المجتهيد و نهاية المقتصد..........إبن رشيد.

٥٧- المسيح المنتظر و تعالم التلمود.

٥٨- من طوائف العادات و غرائب المعتقدات.........د.محمود سلام.

٥٩- مركز المرأ ة في شريعة اليهودية...........السيد عاشور.

٦٠- الأحكام الشرعية للأحوال الشخصية الإسرائيلين..........أحمد شلبي.

٦١- اليهود في التأريخ الحظارات الأولى...........عوتاف لوبون.

٦٢- الكنز المرصود في قواعد التلمود..........روهلنج.

٦٣- الفكر اليهودي أطوره و مذاهبه..........حسن ظاظا.

٦٤- أحكام الشرعية..........إبن شمعون.

٦٥- الخطر اليهودي : محمد خلف التونسي.

٦٦- الدولة العثمانية عوامل النهوظ و السقوط.........د.علي محمد الصلابي.

٦٧- اليهود و الدولة العثمانية............د.أحمد النعيمي.

٦٨- تأريخ الدولة العثمانية..............د.علي حسون.

٦٩- المسألة الشرقية...............محمد ثابت الشاذلي.

٧٠- الحرب و الشعوب..........بدرالدين السباعي.

٧١- صحيفة المحرر العربي.

٧٢- الأسس الدينية للحركة الصهيونية........تميمي.

٧٣- دراسات اليهودية والمسحية في كردستان......... د.فرست مرعى.

٧٤- جولەکەکانی کوردستان ................. أحمد باوەڕ.

٧٥- گوڵاوی سەرمۆر................ وەگێڕانی: بەکر حەمە صدیق.

٧٦- فقه السيرة بەکوردی.......... وەگێڕانی: شێخ محمد شیخ سمیع.

٧٧- كتاب الأموال............... لإبن الجوزي.
٧٨- سيرة إبن هشام..........
٧٩- بيرو ڕاو ڕەفتارە پەڕگیرەکانی ڕێکخراوی (داعش).... علی باپیر وەتمان.
٨٠- روضة الأنوار في سيرة النبي المختار...... (صفی الرحمن المبارك فوری).
٨١- تأريخ الطبری.........

# پێرست

**بەرهەمە چاپکراوەکانی نوسەر:**

١- جولەکە کێن،١٩٩٧.

٢- ئەم ڕێچکانە بناسە: (عەلمانیەت ـ تەبشیر ـ بوزیەت)،١٩٩٨.

٣- زنجیرە داستانی پێغەمبەران(ژیانی ئادەم)،١٩٩٨.

٤- زنجیرە داستانی پێغەمبەران(ژیانی نوح)،١٩٩٨

٥- زنجیرە داستانی پێغەمبەران(ژیانی موسا)،١٩٩٩.

٦- زنجیرە داستانی پێغەمبەران(ژیانی داود)،٢٠٠٣.

٧- زنجیرە داستانی پێغەمبەران(ژیانی عیسا)،١٩٩٨.

٨- هەنگاوێك بەرەو ڕاستگۆیی،٢٠٠٥.

٩- ستەم،٢٠٠٦.

١٠- خۆ بەگەورە زانین،٢٠٠٧.

١١-خاکی بوون،٢٠٠٧.

١٢-سۆزی نەتەوە یان نەتەوە پەرستی(بەهاوبەشی: د. سید أحمد)،٢٠٠٩.

١٣- موسڵمانی بەهێز و چەند سەرنجێك لەسەر مەسەلە ئیمانیەکان (بەهاوبەشی لەگەڵ د. سید أحمد عبدالوهاب)،٢٠١١.

١٤-جولەکە (عەقیدە و شەریعەت و مێژوویان)،٢٠١٠.

١٥-مەسیحیەت (عەقیدە و شەریعەت و مێژوویان)،٢٠١٢.

١٦-ئیسلام (عەقیدە و شەریعەت و مێژووی).٢٠١٤.

**ئەو بەرهەمانەی کە ئامادەن بۆ چاپ:**

١- زنجیرە داستانی پێغەمبەران (ژیانی ئیدریس).

٢- زنجیرە داستانی پێغەمبەران (ژیانی صالح).

٣- یاسا نەگۆڕەکانی قورئانی پیرۆز (بەشی یەکەم).

٤- یاسا نەگۆڕەکانی قورئانی پیرۆز دەربارەی دەسەڵاتی خوای مەزن (بەشی دووەم).